# ئەلف بێی کارکردن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا

نووسینی / جف پریدمور

وەرگێڕانی / مەجید ساڵح

پێداچوونەوەی / محەمەد کوردۆ

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب: ئەلف بێی کارکردن لە کەناڵەکانی راگەیاندندا
- نووسەر: جف پریدمور
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: مەجید ساڵح
- پیتچنین: ئەحمەدی خۆشنووس
- دیزاینی ناوەڕۆک: زانا کەمال
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ١٩٨
- چاپخانە: کارۆ
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (٦٣٦) ساڵی (٢٠٠٨)

# پێرست

# پێشەکی

لە دونیایەکدا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناردنی هەواڵەکان بە خێرایی‌و گەیاندنی زانیارییەکان بە شێوەیەکی ڕاست، گرنگییەکەی زیاتر دەبێت‌و ڕایگشتییش هەڵپەی ئەوەیەتی لە دوایین ڕووداوەکانی جیهان ئاگاداربێت. ئا لەم دونیایەدا پیشەی پەیامنێریی جێگەیەکی تایبەتی هەیە، لەم ساڵانەی دواییدا هاوکات لە گەڵ پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکاندا، پیشەی ڕۆژنامەنووسییش گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا هاتووە. کەرەستەو شێوازی نوێی کارکردن شوێنی شێوازە کۆنەکان دەگرێتەوە. ژمارەیەکی زۆر لەوکەسانەی حەزیان لە کاری پەیامنێرییە ئێستا لە ڕێگەی خوێندن لە بواری ڕۆژنامەوانییەوە دێنە ناو دونیای کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە. بەڵام هێشتا تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوویی ڕۆژنامەوان‌و پەیامنێران پەیوەستە بە توانا شەخسییەکانی خودی ڕۆژنامەوان‌و زیرەکی لە دۆزینەوەی هەواڵ‌و دادوەرییەکی ڕاست‌و دروست.

ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێك ئەزموونی بەنرخی چەندین ساڵەی نووسەر. هەرچەندە بە تایبەتی بۆئەوانەی تازە دێنە ناو پیشەکەوە نووسراوە، بەڵام تەنانەت ئەوانەی لە بوارەکەشدا پرۆفیشناڵن، دەتوانن سوود لە هەندێك لە بابەتەکانی وەربگرن. بابەتەکان بە شێوەیەکی گشتیی بۆ پەیامنێران، ڕیپۆرتەرانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن، فۆتۆژورنالیستەکان ڕۆژنامەوانانی ئازاد نووسراون.

هیوادارم ئەم کتێبە ئەلف بێی ڕۆژنامەوانیی بە شێوەیەکی پۆزەتیف بگەیەنێتە خوێنەران. گومان لەوەدا نییە سوودوەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی دیکە ڕێگەی پرۆفیشناڵبوون خۆشدەکات.

# ١

# پەیامنێریی چییە؟

بە پێی پێناسەیەك، پەیامنێریی واتە ئاگادارکردنەوەی رایگشتی لە خاڵە گرنگەکانی رووداوێك، بێئەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەو رووداوە کەم بایەخ پیشانبدات. گەر وەك پەیامنێرێك ئەو مەبەستەت جێبەجێکرد، ئەوا گەیشتوویتە ئامانجەکانی پەیامنێریی *(جان پیلگر)*.

بەچاوپۆشین لەوەی هەواڵ بۆ رۆژنامە یان ئینتەرنێت یاخود بۆ رادیۆو تەلەفزیۆن ئامادە دەکەیت، دەبێت ئەو راستییە بزانیت شێوازی گەیشتن بە هەواڵ و کۆکردنەوەیان واتە ناسینی سەرچاوەکان و چاوپێکەوتن و خستنە رووی لە هەموو ئەو میدیاکانداوەك یەك وایە. هەرچەندە لە هەندێك حاڵەتدا کەرەستەکانی کارەکە جیاوازن، بەڵام قۆناغەکانی کۆکردنەوەی زانیاری و دارشتنی هەواڵەکان وەك یەك‌وان.

هەندێ پەیامنێر هەن نووسینی ستونێك بۆ رۆژنامەو وتنەوەی هەواڵێك لە بەردەم کامێرادا بەلایانەوە وەك یەك وایە، کەچی هەندێکی تر پێیان باشە لە تاکە میدیایەکی تایبەتدا کاربکەن. بەهەرحاڵ پێویست ناکات لەم بارەوە نیگەران بیت، چونکە ناچارنیت لە هەموو کەناڵەکاندا کار بکەیت، لەوە دڵنیابە کە هەمیشە خۆت سەرپشکی لەوەی لە کام کەناڵ کە بە دڵتە کاربکەی‌و کەس نابێتە رێگر لە بەردەمت، فەسڵەکانی دواتری کتێبەکە بۆ باسکردن لە ئەرکەکانی پەیامنێری چاپەمەنییەکان‌و ریپۆرتەری رادیۆو تەلەفزیۆن تەرخانکراوە، واباشترە ئەوانەی حەزیان لە پەیامنێرییە بێ

لەبەرچاوگرتنی ئەو پسپۆرییەی کە حەزیان لێیەتی، هەموو بابەتەکانی ئەو بەشانە بخوێننەوە چونکە هونەرەکانی ئەلفبێی کارپەیامنێری لە هەموو میدیاکاندا هاوبەشن.

## ئەرکەکانی پەیامنێری چاپەمەنییەکان:

هەر لە یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوونت لە ڕۆژنامە لە هەموو قۆناغەکانی پیشەکەتدا، نمونەی کارکردنی تۆ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نایەت.

## سەرەتایەك بۆ ئاشنا بوون:

کاتێك بۆ یەکەمجار دەست بەکاردەبیت، هەندێك لەوانەی پێشتر لەوجێگەیە کاریان کردووە، باسی کۆمەڵە ڕووداوێکت بۆ دەکەن کەلە کاتی دەست بەکاربوونیاندا بە سەریان هاتووە. بۆ نموونە باسی ئەوەت بۆ دەکەن بەرلەوەی وەك "پەیامنێرێکی تازەکار" یەکەم ئەرکیان بەسەردا بدەن، هەندێك ئەرکی سادەی وەك هێنانی قاوەو ئاگادارکردنەوەی ئەمو ئەویان جێبەجێ کردووە. لەوانەیە وابزانن ئەم مەسەلانە لە سەردەمی کۆندا ڕوویانداوە، لە ڕاستیدا ئەنجامدانی ئەم کارانە هۆکارێکی باشە بۆ ئاشنابوونی پەیامنێری تازەکار بە شوێنی کارکردن بەشەکانی ڕۆژنامەکەو ئەوانەی لە داهاتوودا هەڵسوکەوتیان لە گەڵدا دەکاتو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروبارەکان، بەڵام ئەمڕۆ پەیامنێرە تازە هاتووەکان هەر لە سەرەتاوە لەسەختترین قۆناغەکانی کارەکە بەشداریدەکەنو زۆر بە خێرایی فێری شێوازی خستنەکاری ئامێرە ئاڵۆزەکان دەبن، تەنانەت لەوانەیە هەر لە ڕۆژە سەرەتاییەکانی دەست بەکاربووندا لەو هاوکارەی کە سەرقاڵی کارێکی

گرنگە دوای ئەوە بکەن تاکۆ شوێنی ئنسکلۆپیدیاکەیان لە کتێبخانەکە پیشانبدات. بۆیە واباشترە لە یەکەم رۆژی دەست بەکاربوونت لە رۆژنامەیەکدا داوا لە سەرنووسەری رۆژنامەکە بکەیت رۆژێکتان پێبدات بۆ ئاشنابوون لە گەڵ دەستەی نووسەران‌و بەشە جیاجیاکانی رۆژنامەکە. بۆ ئەو مەبەستە دەبێت چەند سەعاتێك لە کاتی خۆت بێ ئەوەی هیچ موچەیەك وەرگری تاکو ئاشنای شوێنی کارەکەت بیت تەرخان بکەیت، هەڵبەت ئەوە کارێکی بە سوودە، چونکە پێویستە لە رۆژی یەکەمی دەست بە کاربوونتەوە لە سەر ئەوە رابێیت زۆر بە خێرایی زانیاری پێویست لە سەرچاوەکانەوە وەربگریت. دەبێت شوێنی کتێبخانەو سەرچاوەکان بە ئاسانی بدۆزیتەوە، چونکە پاش دەستبەکاربوونت کەس ئامادە نییە کاتی خۆی بە تۆوە خەرج بکات‌و لە کارەکەی خۆی دوا بکەوێت. دەبێت ئەوەش بزانیت تۆری کۆمپیوتەرەکان لە کوێن و سیدی‌و ئەرشیفی رۆژنامەکانی دیکە چۆن پەیدا دەکەیت، هەروەها دەبێت فێربیت چۆن تەلەفۆن دەکەیت‌و چۆن چۆنی ئامێری فۆتۆکۆپی بەکاردەهێنیت. لیستی ناوی هاوکاران‌و ژمارەی تەلەفۆنی ژوورەکانیان لای خۆت بنووسەو ئەوەش فێر بە بەچ کۆدێك دەتوانی پەیوەندی بکەیت بە ژوورەکانیانەوە، ئاشنابوون لە گەڵ هاوکارانت بەشێکی گرنگی ئەرکەکانتە. بۆ ناسینی پەیام وەرگرانی رۆژنامەکەت، لە هاوکارانتەوە دەست پێبکە.

## تۆمارکردنی زانیارییەکان:

لە یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوون پێویستە دەفتەری تۆمارکردنی ژمارەی تەلەفۆن و ئادرەس بۆ خۆت بکڕیت. لە هەموو ڕۆژنامەکاندا ژمارە تەلەفۆن و ئادرەسی کارمەندان لە دەفتەرێکدا تۆمار دەکەن، تۆش پێویستیت بە دەفتەرێکی لەو چەشنە هەیە. پێویستدەکات ئەو زانیارییانە لە سەر کۆمپیوتەرەکەی خۆت تۆمار بکەیت، تەنانەت لە کاتی گۆڕینی کارەکەشتدا ئەو زانیارییانە فڕێیمەدە.

## یەکەمین ڕۆژی کارکردن:

بەپێی سیاسەتی ڕۆژنامەکە بەڕێوەبەری نووسین یاخود پەیامنێرێکی کۆنتر لە تۆ، جۆری کارەکەت پێڕادەگەیەنێت بۆ ئەوەی جێبەجێی بکەیت لەوانەیە ئەرکی کارمەندانی ڕۆژنامەکە لە دەفتەرێکدا تۆمارکرابێت. ئەگەری ئەوە هەیە یەکەمین ئەرکی سەر شانتان بە تەنهایی یان لە گەڵ پەیامنێرێکی تردا ئەنجام بدەن، بەڵام ئەو شتانەی تا ئێستا فێریان بوویت، تا ئەو ڕادە ئامادەی کردوویت کارەکانت بە باشی ڕاپەڕێنیت. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی یەکەم ئەزموونی کارکردنت نەك هەر هەراسانت نەکات، بگرە ورووژێنەریش بێت بەلاتەوە.

بە لە بەرچاونەگرتنی ئەوەی چ کارێکی سەرەکییان پێڕاسپاردووی، دەبێت لە هەوڵی ئەوەدا بیت زانیاریو ئامار بە دەستبهێنی. ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی ئاشنابوونت لە گەڵ دەوروبەرو ژینگەی ئەرك و کارەکەت. پێشئەوە لە بارەگای ڕۆژنامەکەت بچیتەدەرەوە چاوێك بە ئەرشیفی

رۆژنامـەکان‌و سـیدی‌و کۆمپیوتەرەکـەدا بخـشێنەو زانیاریـیـەکان وەرگـرەو تەلەفۆن بۆ خەڵکانی شارەزا بکە. هەندێجار دەتوانی لە پشتی مێزەکەتـەوەو لە ڕێگەی تەلەفۆنەکەتەوە سەرچاوەکان بدۆزیتـەوەو چاوپێکەوتن بکەیت. هەر چەندە ئەم کارە پارەو کاتت بـۆ دەگێڕێتـەوە، بـەڵام بـۆ رۆژنامـەنووس شتێکی هێندە باش نییە.

سـەرەڕای هـەموو ئەوانـەی وتـران، تـا پێتـدەکرێت خـۆت لـە دەسـتەی نووسەران دووربگرەو لە خەڵك و پەیام وەرگرەکانەوە نزیك بکەرەوەو زیاتر ئاشنایەتییان لە گەڵدا پەیدا بکە. ئەوەش لە بیر مەکە کاتێك چاوپێکەوتن لە گەڵ ئەندامانی شارەوانی و پۆلیس‌و پزیشك و پەرستاران و جووتیـاران و چـین و توێـژەکانی تـردا دەکـەیت، پـێش هـەر شـتێك خۆتیـان پێبناسـێنەو هەندێك زانیاری سەبارەت بە خۆت و جۆری کارەکەتیان بۆ باس بکە.

هەنـدێ لـە رۆژنامـەکان کـارتی پێناسـەی خۆیـان دەدەن بـەو کەسـانەی دیداریان لە گەڵدا ساز دەکرێت، لـەو کارتـەدا نـاوی رۆژنامەکـەو ئـادرەس و نـاوی پەیامنێرەکـە نووسـراوە. ئەگـەر کـارتی واتـان هـەبوو بیـدە بەوانـەی چاوپێکەوتنیان لە گەڵدا ساز دەکەیت، بەڵام ئەگەر رۆژنامەکـە ئـەو کارتـەی نەبوو، دەتوانیت کارتێك بۆ خۆت درووست بکەیت.

لەوانەیـە کاتێـك ئـەرکی کۆکردنـەوەی هەواڵـە سیاسییە ناوخۆییـەکانت پێدەسـپێرێت، ئـارەزووت بـۆ زانـینی هەواڵـە سیاسـییەکان لـە سـەر ئاسـتی نیشتمانی زیاتر بێت. لەرۆژی دەستبەکاربوونتەوە وەك پـەیامنێر، بێئـەوەی بەخۆت بزانیت، لە بوارێکدا دەبیـت بـە پـسپۆر. بـە دڵنیاییـەوە دەبێـت ئـەو راستییە بزانیت ئەو شارەزاییەی لە قۆنـاغی سـەرەتایی کارەکەتـدا بەدەسـتی دەهێنی، لە هەموو قۆناغەکانی تری پیشەکەتدا سوودی لێوەردەگری.

# چاوپێکەوتن (ئەنتەرفیو):

سازدانی چاوپێکەوتن کارێکی هێندە ئاسان نییەو بە یەکێك لە کارە زۆر سەختەکانی پیشەی پەیامنێریی لە قەڵەم دەدرێت و پێویستە بە شێوەیەکی باش ئەنجامبدرێت. کاتێك لە ڕۆژنامەیەکدا کار دەکەیت، دەبێت لە گەڵ هەموو جۆرە کەسێکدا چاوپێکەوتن بکەی، لە خوێندکارێکەوە بگرە تا دەگاتە خەڵکانی پلە بەرزو ناودار. نابێت هەڵسووکەوتی هەندێك خەڵك دڵساردت بکاتەوە، گەر هاتوو چاوپێکەوتنەکەت بە شێوەیەکی ڕەوان و پسپۆرانەو بە ئینسافەوە ئەنجامدا، ئەو کات پێویست ناکات سەبارەت بە هیچ مەسەلەیەك نیگەران بیت.

پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە، هەوڵبدە هەندێك زانیاری ورد لە سەر بەرامبەرەکەت کۆبکەیتەوە، بۆ نموونە گەر بەرامبەرەکەت سەرۆکی فەرمانگەی ئاگرکوژێنەوەیە، دەتوانیت لەو ڕۆژنامانەی لاتان هەن زانیاری لە سەر پێشینەی ئەو کەسە کۆبکەیتەوە.

دەکرێت زانیاری سەبارەت بە ساڵانی کارکردنی لەو فەرمانگەیەو ئەو خەڵاتانەی کە کراوە لەبەر ئازایەتی و لێهاتوویی کۆکەیتەوە. باشتر وایە زۆربەی چاوپێکەوتنەکان بە قەڵەم و کاغەز تۆماربکرێن، بەڵام گەر زانیت چاوپێکەوتنەکە درێژەدەکێشێ و مەسەلە یاساییەکانی تێدەکەوێت. لەو حاڵەتەدا باشتر وایە سوود لە ریکۆدەر یان مینی دیسك وەربگریت. چەند پرسیارێکی سەرەتایی ئامادەبکەو ئامانجی چاوپێکەوتنەکە لە بەر چاوبگرە، هەر لە دەسپێکی چاوپێکەوتنەکەدا ئەو پرسیارە لە خۆت بکە، بە چ ئامانجێك ئەم چاوپێکەوتنە دەکەیت؟ ئایا دەتەوێت سەبارەت بە مەسەلە

گشتییەکان زانیاریت دەستبکەوێت‌و دواتر لە چاوپێکەوتنەکەدا خاڵە سەرنجڕاکێشەکان جیابکەیتەوە، یان پرسیارێکی دیاریکراوت مەبەستەو دەتەوێت وەڵامی بۆ پەیدابکەیت. ئەوەی مەبەستتە دیاری بکەو خەتی بە ژێردا بکێشە، لە پرسیارەکانی دەسپێکی چاوپێکەوتنەکەوە بڕۆ بۆ ئامانجی سەرەکی چاوپێکەوتنەکە.

با گفتوگۆکە ڕەوانی سروشتیی خۆی وەربگرێت. بەم ڕێگەیە دەگەیتە کۆمەڵێ زانیاری لەوە زیاتر کەخۆت ویستوتە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕێگە بە بەرامبەرەکەت مەدە گفتوگۆکە بەرەو لایەك ببات دووربێت لەو ئامانجەی بۆ خۆتت داناوە. جەخت لە سەر ئامانجەکەی خۆت بکەرەوە. جگە لەوە پرسیارێك لە بەرامبەرەکەت مەکە سوور بزانی وەڵامی ناداتەوە، بۆ نموونە سەرۆکی فەرمانگەی ئاگرکوژێنەوە باس لەو بابەتانە دەکات کەوا پەیوەندییان بە کارەکەی خۆیەوە هەیە، نەك مەسەلەی دیکە. هەرگیز قسە مەخەرە زاری خەڵکی ترەوە، ئەگەر کەسێك وتی "*ئەم بابەتە تەنها بۆ زانیاری خۆتانە*" مانای وایە چەندە بابەتەکە مایەی سەرنجی خەڵك بێت، نابێت کەڵکی لێوەربگریت‌و بڵاویبکەیتەوە. هەمیشە پابەندی بنەما ئەخلاقییەکانبە، چونکە ڕەچاوکردنی ئەخلاقی پیشە بەردەوام لە بەرژەوەندی پەیامنێردایە.

بەڵام جگە لەوانە، هەندێك بابەت هەن لە پەراوێزی قسەو باسەکاندا دەوترێن‌و نابێت بڵاوبکرێنەوە، بۆ نموونە کۆبوونەوە گشتییەکان هەردەم بە ئاشکرا دەکرێن، گەر یەکێك لە کۆبوونەوەیەکی گشتییدا بڵێت: "*ئەم وتەیەم بۆ بڵاوکردنەوە نییە*"، تۆ دەتوانیت بە شێوەیەکیتر کەڵك لەو وتەیە وەربگریت. کاتێك کەسێك ڕازی دەبێت دیداری لە گەڵدا بکرێت، ئاساییە هەموو قسەو باس‌و لێدوانەکانی بڵاوبکرێتەوە، تەنها لەبارێکدا گەر

خۆی داوا بکات هەندێك مەسەلەی دیاری کراوی ئەو چاوپێکەوتنە لابدرێت. لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا هەوڵبدە گوێگرێکی باش بیت‌و گەر پێویستی کرد هاوخەمی خۆتی بۆ دەربڕە، تۆ لێکۆڵینەوە لە گەڵ خەڵکدا ناکەیت، بۆیە نابێت بۆ دەسکەوتنی وەڵام بەرامبەرەکەت بخەیتە ژێر گوشارەوە، بە تایبەت گەر هاتوو باری دەروونی بەرامبەرەکەت باش نەبوو.

## چاوپێکەوتنی تەلەفۆنی:

بە پێی یاسا نێونەتەوەییەکان‌و یاساکانی بریتانیا، دەبێت پەیامنێر لە کاتی تۆمارکردنی چاوپێکەوتنی تەلەفۆنیدا، لایەنی بەرامبەر لەوە ئاگاداربکاتەوە کەوا بە نیازە چاوپێکەوتنەکە تۆمار بکات. کاتێك تەلەفۆن دەکەیت خۆت‌و ئەو رۆژنامەیەی تێدا کاردەکەیت بناسێنەو بڵێ دەتەوێت لە گەڵ کێدا چاوپێکەتن بکەیت. پێش چاوپێکەوتنەکە بەباشی بیر بکەرەوەو راشکاوانەو بەبێ پەردە قسە بکە. ئاگاداربە ناوو ئادرەسی ئەوانەی دەتەوێت چاوپێکەوتنیان لە گەڵدا بکەی بە باشی‌و بەبێهەڵە دەربڕە، چونکە هەندێك پیت هەن لەکاتی تەلەفۆنکردندا بەباشی نابیسترێن‌و تووشی هەڵەت دەکەن.

## گەڕان لە رێگەی تەلەفۆنەوە:

گەربتەوێت لە رێگەی سەنتەری تۆڕی تەلەفۆنەوە کەسانێك بدۆزیتەوە، راستییەك هەیە نابێ لەبیریبکەی، ئەویش ئەوەیە لەوانەیە زانیاری سەنتەرەکە هەر هێندەی زانیارییەکانی خۆت بێت. ئەوە شتێکی باوە زۆربەی رۆژنامەنووسەکان لیستی تەواوی تەلەفۆنەکانیان لایە، بەڵام

جیاوازییەکــە لەوەدایــە ســەنتەری ڕێنماییــەکانی تەلــەفۆن بــە هــۆی کۆمپیوتەرەوە بە شێوەیەکی خێراتر ئەو زانیارییانەت پێدەدات.

## گەڕان لە ناو ئینتەرنێتدا:

ڕۆژانــــە لــــە کتێبخانــــەی **ڕۆژنامەکانــــدا**، ڕۆژنامــــەکانی دی ئەرشیفدەکرێن‌و ڕۆژنامەو بابەتی ئـەلکترۆنی دەخرێنـە بەردەسـت ڕۆژنامـە نووسەکانەوە، ئەو زانیارییانـە هەریەکـەیان خـاوەنی تایبەتمەنـدی خۆیـانن. وەك ئاشکرایە هیچ ڕۆژنامەنووسێك نایەوێت لـە نـاو پارچـەو پـەڕەی دڕاوی ڕۆژنامەکاندا ون ببێت‌و بەدوای زانیاریدا بگەڕێت. لـە کتێبخانـەی هەنـدێك ڕۆژنامەدا زانیاری‌و بابەتی ئەرشیفکراوی زۆرهەن، ڕۆژنامەنووس دەتوانێـت ڕەزامەنـدی لـە سەرنووسـەر وەربگرێـت‌و کـەڵك لـەو زانیاریانـەش ببینێـت، بەڵام لـە هـەمووی ئاسـانتر ئەوەیـە لـە ڕێگـەی گـەڕان لـە ئینتـەرنێتـدا نـاوی کـەس‌و کۆمپانیاکـان وەربگریـت‌و بـە ئاسـانی زانیـاری تـەواویان لەسـەر کۆبکەیتەوە.

## دەفتەری یاداشتەکان:

پێویستە ئەو دەفتـەرەی ڕۆژنامەنووس تێدا یاداشتەکانی خـۆی سـەبارەت بـە ڕووداوە جیاجیاکـانی ڕۆژ تۆماردەکـات‌و بـە شـێوەیەکی بـاش بپارێزێـت. چــونکە لەوانەیــە ناوەڕۆکەکــەی لــەدادگادا وەك بەڵگەنامــە دژی خــودی ڕۆژنامەنووسەکە بەکاربهێنرێت.

بۆیە پێویستە لە کاتی تۆمارکردنی مێژوو و ناوی کەسەکان زۆر وردەکار

بیت، بابەتی بێکەڵکی وەك کڕین و هێنانی شمەکی تێدا مەنووسە. وریای ئەومبە لاپەڕەکانی هەڵنەوەشێتەوە، لە کاتی تۆمارکردنی زانیارییەکاندا ئاگاداربە هەموو لاپەڕەکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە پڕبکەیتەوە، تاکو ئەگەر لێشت ونبوو کەس نەتوانێت شتی تری تێدا بنووسێت. لە سەرەوەی هەموو راپۆرتێك ناوی بابەت و مێژوو و ناوی خۆتو ئەوانەی دیداریان لە گەڵدا دەکەیت تۆمار بکە، ئاگاداربە کاتێك لاپەڕەکانی دەفتەرەکەت تەواو دەبێت، فڕێی مەدە، بەڵکو هەڵیبگرە.

## خۆ دوورخستنەوە لە دەردەسەریی:

دەبێت پەیامنێران بۆ ئەوەی خۆیان لە دەردەسەریی وکێشە دورخەنەوە هەوڵی زۆر بدەن. ئەگەر لە گەڵ سەرنووسەرەکەتدا راستگۆبیتو زانیارییەکانتی لێنەشاریتەوە، هەموو شتەکان بەباشی دەچنە پێشەوە. هیچ کاتێك بڕوبیانوو مەهێنەوەو راستییەکانی لێمەشارەوە.

کاتێك ئامادەکردنی راپۆرتێکت سەبارەت بە دادگاییکردنێك پێدەسپێرن، ئەگەر پێشنیازی بەرتیلیان بۆکردی، رەتیکەرەوە. هەرگیز ئەو پارەیە قبووڵ مەکە، کە بەزۆر دەخرێتە گیرفانتەوە. بە پەلەو بێدواکەوتن بە نوسراو سەرنووسەرەکەت لەو مەسەلەیە ئاگادار بکەرەوە.

کاتێ رەخنەت لێدەگیرێت، خەتاکە مەخەرە سەر خەڵکانی تر، خۆت لە کێشمەکێشو مجادەلە دوورخەرەوە. بە وردی گوێ لە قسەی لایەنی بەرامبەر بگرە، با دووریش بێت لە ئەدەب و ئەخلاق. قسەکانی تۆماربکە، بگرە ناوو ئەدرەسو تەلەفۆن و ئەوبابەتەی کە ئەو گلەیی لێی هەیە، لە دەفتەرەکەتدا تۆماربکە (ژمارەو مێژوو و لاپەڕە) ی رۆژنامەکە

بنووســـەرەوە، پاشـــان سەرنووســـەر یـــان جێگرەکـــەی لـــە مەســـەلەکە ئاگاداربکـەرەوە. هـیچ کاتێـک هـەوڵی ئـەوە نـەدەی بـە تـەنها کێـشەکە چارەسـەربکەیت، خەتاکە مەخـەرە سـەر خـۆت و کەسانی تـریش تۆمـەتبار مەکە. بە ئەدەب و حورمەتەوەو زۆر بە هێمنی بە کەسی سکاڵاکار بڵێ کە قسەکانت تۆمارکردوون و سەرنووسەری لێئاگادار دەکەیتەوە.

## تەماشاکردنی بڵاوکراوەکانی تر:

دەبێـت ریپۆرتـەرەکان لـەو کاتانـەی خۆیـان خـەریکی نووسـین نـین، تەماشـای نووسـینی خـەڵکانی دیکـە بکـەن. لـە رۆژنامەکـەی خۆتـەوە دەستپێبکەو هەفتانە لە بابەتەکانی ئاگاداربە. پێویستە رۆژنامەکانی تـر لـە سەر ئاستی لۆکاڵیو نیشتیمانیی بخوێنیتـەوە. ئەگەر لـە هەفتەنامەیەکدا کاردەکـەیت، لەوانەیـە ئـەو بابەتـەی دەتـەوێت بڵاویبکەیتـەوە لـە بڵاوکراوەیـەکی تـردا چـاپ کرابێـت. دەتـوانی لـە رێگـەی پەیوەندیکردنـەوە زانیاری زیاترو نوێترت دەست بکەوێت، بەڵام دەبێت سەرچاوەکە بنووسیت. هەوڵبـدە لـە گـەڵ ئـەو گۆڤـارو رۆژنامـە لۆکاڵییانـەی بابەتـەکانیان لـە بابەتـەکانی تـۆوە نـزیکن، ئاشـنایەتی دروسـتبکەی. گـوێ لـە رادیـۆ لۆکاڵیو نیشتمانییەکان رابگرە. وردبەرەوە لە بەرنامـە هەمەڕەنگەکانیان بـۆ ئـەوەی زانیاریـت لەسـەر بابەتـەکانیان زۆرتـر بێـت. لـە تەلەفزیۆنـەوە تەماشـای هەواڵەکان بکە، لە هەمانکاتـدا ئـەوە لـە بیر مەکـە بەشێك لـە کاتەکـەت بـۆ گەڕان لە تۆڕی ئینتەرنێتدا تەرخان بکەیت. ئەو ماڵپەڕانەی مەبەسـتتن لای خۆت دایانبەزێنە، بە تەنها کەناڵێکەوە خۆت خەریك مەکەو چاو بە هـەموو جۆرەکانی هەواڵدا بخشێنە.

باشی ئەو کارە لەوەدایە ئەرشیفێکی گرنگت سەبارەت بە هەواڵە لۆکاڵیو نیشتمانییەکان لا کەڵەکە دەبێت. بۆ ئەوەی پارە لە کڕینی ڕۆژنامەکاندا خەرج نەکەیت، باشتر وایە لە ماڵپەڕەکانیانەوە بیانخوێنیتەوە. سەردانی کتێبخانەکان بە تایبەتی کتێبخانەی زانکۆکان لە بیرمەکە، بە دراوسێ و هاوڕێکانت بڵێ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیان فڕێ نەدەنو بیدەن بە تۆ.

# ٢

# وتووێژ لە گەڵ ڕیپۆرتەرێکدا

*"ئادرین پاترۆدت"* دەرچووی بەشی رادیۆو تەلەفزیۆنی پەیمانگای هونەری فالموت (falmouth )ە لە بریتانیا. پاش تەواوکردنی قۆناغی خوێندن بۆ ماوەیەك لە رادیۆیەکی ئازاد لە سامرست (somerset ) کاری کردووە. دواتر گەڕاوەتەوە بۆ هەمان پەیمانگاو لە بەشی پەیامنێریی رادیۆو تەلەفزیۆن درێژەی بە خوێندنەکەی داوە.

* بۆ بڕیارت دا ببیت بە ریپۆرتەر لە رادیۆو تەلەفزیۆن؟

- کاتێك پسپۆرایەتیم لە رادیۆو تەلەفزیۆن وەرگرت و پەیوەندیم لە گەڵ پەیامنێرانی رادیۆو تەلەفزیۆن پەیدا کرد، کەوتمە ژێر کاریگەری چالاکییەکانی ئەوانەوە. بە خۆمم وت دەبێت کارێکی سەرنجڕاکێش بێت، پێموایە خۆشەویستییم بۆ ئەم پیشەیە زیاتر لەبەر سەرنج ڕاکێشێکەیەتی، وەك ئەوەی تۆ هەواڵەکان بەناوی خۆتەوە دەخەیتە روو. پێچەوانەی هەندێك کاری تر کە خەڵك نازانن سەرقاڵی چ کارێکی، لێرەدا ئەوان گوێ لە تۆ دەگرن و دەرئەنجامی کۆتایی کارەکەت دەبینن.

* ئێوە زیاتر کامیان بە پەسەند دەزانن، دەرکەوتن لە سەر شاشەی تەلەفزیۆن یان خوێندنەوەی هەواڵ لە سەر شەپۆلی رادیۆ؟

لە راستیدا ئەم ئیشە زۆر جۆش‌و خرۆشی تێدانییە، لە دیدی خەڵکەوە کارێکی سەرنجڕاکێشە. کاتێك هاتمە ئەم کارەوە باشترین بەش گفتوگۆکردن بوو لە گەڵ خەڵکدا.

★ ناوەندی تەمەنی خوێندکارانی ئەم بەشە چەند ساڵانە؟

- ناوەندی تەمەن لە نێوان ٢٣ بۆ ٢٤ ساڵانە، بەڵام خەڵکی بە تەمەنتریشی تێدایە. خۆم ٢٧ ساڵانم. دوو کەسی تر هەن تەمەنیان لە من زیاترە، یەکێکیان تەمەنی بۆ ٤٠ ساڵان دەچێ. بەڵام ئەوانی تر لە نێوان ٢١ بۆ ٢٧ ساڵانن، ئەمساڵ گروپەکەمان زیاتر گەنجن، پێشتر خوێندکاری زۆر بەتەمەنترمان هەبووە.

★ بۆچی هێندە بڕوانامەی پسپۆڕی پەیامنێریی رادیۆو تەلەفزیۆنت بەلاوە گرنگە؟

- لە ڕاستیدا من پێشتر هەواڵم دەنووسییەوە، بەڵام کێشەی سەرەکیم ئەوە بوو هێندە شارەزای مەسەلە یاساییەکان نەبووم. بۆ نموونە کاتێك سەبارەت بە خۆکوژییەك پرسیار لە ئەفسەرێکی پۆلیس دەکەیت و ئەفسەرەکەش لە وەڵامدا پێتدەڵێت لە ژووری کوژراوەکە مادەی سڕکەرمان دۆزیوەتەوە. ئایا دەبێت لە هەواڵەکەدا ئەو خاڵە باس بکەیت؟ لەوانەیە بە هۆی سەرقاڵی و نەبوونی کات لە هەواڵەکەدا بگەیتە ئەو باوەڕەی لە خۆکوژیەکەدا مادەی سڕکەر بەکارهاتووەو بۆتە هۆی مردنی کەسەکە. نەبوونی شارەزایی تەواو لە یاساو وردەکارییەکانی ئەوەی ڕێگەی پێنەدراوە بۆ بڵاوکردنەوە لەوانەیە لە ماوەیەکی کورتدا تووشی کێشەت بکات. ئەگەر پەیامنێر بیت بەشێك لە ئەرکەکانت هەواڵی دادگاکانە، من تەنانەت شارەزاییم سەبارەت بە نووسینی هەواڵەکانی حکومەتە هەرێمییەکان نەبوو، کەچی هەواڵی ئەو حکومەتانە زۆر حەساسن. چاوەڕێ ناکرێت کەسێك لە ماوەی پێنج خولەکدا وردەکارییەکانی ئەو کارە بخاتە ڕوو، لەوانەیە بتوانم بە تەنهاو لە ڕێگەی خوێندنەوە ئەو مەسەلانە فێر ببم ، بەڵام ئەوە کارێکی زۆر سەختە.

★ خوێنـدن لـه بەشـی پـسپۆڕیی رادیـۆو تەلـەفزیۆن تـاچ ئاسـتێك كـاری كردۆته سەر پێشكەوتنی پیشەیی تۆ؟

- ئـەوەی پەیوەنـدیی بـه شـارەزایی تەكنیكییـەوە هـەبێت، لـه قۆنـاغی خوێندنمدا فێر بووم. دەزانم بـه شـێوەی دیجیتـاڵیو بـه كـەڵك وەرگـرتن لـه كۆمپیوتـەر تێكـستێك بنووسـم. جگـه لـەوە لـه سـەر شـێوازی خـستنەڕووی هەواڵەكان هەندێك ئەزموونم بەدەسـتهێنا. سـەرەڕای ئـەوەش ئەمانـه تـەنها خاڵه پۆزەتیڤەكانی ئەم قۆناغەی خوێندن نەبوون. له راستیدا ئەم بەشه له سەر شێوازی خولێكی زانستی زانكۆ نەخشەی بـۆ دارێـژرابوو. تـاكو شـێوازی كاركردنی هاوچەرخی راگەیاندنەكان فێری خوێندكاران بكرێت. بۆیه دەكـرا سـوودێكی زۆر لـەم قۆناغـەی خوێنـدن ببیـنمو ببێتـه هـۆی بـەهێزبوونی شارەزاییەكانم له بواری كاری رادیـۆو tv دا. ئەگـەر لـه رادیـۆدا كـار بكـەیت، دەتوانیت له رێگەی شیكردنەوەی شـێوازی بەرنامـەكانو لێكۆڵینـەوە لەسـەر پـــەیامەوەرگرەكان كاریگـــەریی رادیۆكـــەت بـــەوردی دەستنیـــشانبكەیتو دیراسەیان بكەیت. ئەم شارەزاییەش له ئەنجامی خوێندنی بوارەكەوە دێتو تـۆ قـەرزارباری ئـەویت، بۆیـه پێموایـه ئـەم خوێندنـه بـۆ پێـشكەوتنی مـن بەكەڵك بووە، بەڵام بەو شێوەیه نا كه خەڵكی وێنای دەكـەن. هـەموو لایـەك وادەزانـن لەبەرئـەوەی مـن بەشـی رادیـۆو tv م تـەواوكردووە هـەردەبێت لـه ئامادەكردنی هەواڵدا شارەزاییەكی بێوێنەم هەبێت، بەڵام وانییه. ئەم خـولی خوێندنه زەینی مرۆڤ پەروەردە دەكات تاكو له كاتی ئەنجامدانی كارەكانـدا، بتوانێت بەشێوەیەكی پسپۆرانه مەسەلەكان شیبكاتەوە.

★ پێتوایـه تـەنها لـه رێگـەی تـەواوكردنی خوێنـدنو پـسپۆڕایەتییەوە دەگەیته ئامانجەكانت؟

- لـه راسـتیدا مـن كارەكـەم وەك رێكخـەرێكی هـەواڵ بەنیوەناچـڵ

دەستپێکرد، یەکەم ڕۆژی دەست بەکاربوونم لە ڕادیۆ لێیان پرسیم : " پێشینەی کارکردنی تۆ چییە؟ " لەو کاتەدا وەڵامم نەدانەوەو نەموت من دەرچووی بەشی ڕادیۆو tv م لە پەیمانگای فالموت، دەمزانی ئەوان وا تەسەور دەکەن من بەشی پەیامنێریی ڕادیۆوtv م خوێندووە، واش دەرچوو، ئەوان وتیان: *"زۆر باشە ڕۆژی پێنج شەممە تۆ بەرپرسی هەواڵەکانی، بۆ ئەوەی ئێمەیش ئاشنای کارەکانت بین"*، بە خۆمم وت: "خوایە، ئەوە خەریکی چیم! " بەیانی ڕۆژی پێنج شەممە هات، پاش چەند سەعاتێك هەموویان لێیانداو ڕۆیشتن و من لە بیناکەدا بەتەنها مامەوە بۆ ئەوەی هەواڵەکانی سەعات پێنج ئامادەبکەم ، تا ئەو کاتە من هیچ چاوپێکەوتنێکم ئەنجام نەدابوو، تەنانەت چاوپێکەوتنێکی تەلەفۆنییشم نەکردبوو، شەوی پێشتر لە خولێکی زۆر خێرادا فێری ئەوە ببوم چۆن لە گەڵ سیستەمی دارشتندا هەڵسوکەوت بکەم. بەهەر حاڵ مەسەلەکان بە خێرا تێپەڕین، توانیم هەموو چاوپێکەتنەکان پێش سەعات پێنج ئەنجام بدەمو ڕێکیان بخەم. تەنها هەڵەیەك کە کردم لە کاتی خوێندنەوەی هەواڵەکاندا لەوەدەچوو گۆرانی بچرم. ئەو دەمە هیچ شارەزاییەکم لە خوێندنەوەی هەواڵدا نەبوو، هەرچەندە تۆنی دەنگم بەرز بوو، بەڵام توانام بەسەر بەرزکردنەوەو نزمکرنەوەیدا نەدەشکا، ئێستا شارەزاییم پەیداکردوەو دەتوانم چۆنم بوێ دەنگم بەرزونزم بکەمەوە.

★ هیچ بەرنامەیەکی تایبەتان هەیە بۆ کارکردن؟

- نەخێر شتی وام نییە، پێمباشە بە هزرێکی کراوەوە ڕووبەڕووی پێشهاتەکان ببمەوە.

★ پێتوایە پاش تەواوکردنی خوێندن، بەرپرسەکانت تێڕوانینیان بۆ تواناکانت چۆن دەبێت؟

- پێشبینی ئەوە دەکەم پێشوازی باشم لێبکەن، چونکە ئەزموونی کارکردنم هەیەو لە بواری رادیۆو تەلەفزیۆنیشدا خاوەن بڕوانامەم. لە راستیدا چاوەڕێی ئەوە دەکەم پێشوازییەکی چاکم لێبکرێت، هەڵبەت دەبێت ئەوەش بڵێم گەر لە رادیۆی BBC یان دەزگایەکی بەناوبانگ کارت نەکردبێت، جۆرێك لە دڵەڕاوکێت تووشدەبێت، بەڵام ٩٩٪ ئەوانەی ئەم بەشەیان تەواوکردووە، دامەزراون.

★ لەم قۆناغەدا ئەو شتانە چین کە دەبنە لەمپەر لەبەردەم فێربووندا؟

- شتێکی تایبەتی وانییە، بەڵام گرنگی ئێرە لەوەدایە هەموو شتە پێویستەکانت فێر دەکەن، ئەمە خولێکی کورتکراوەی یەك ساڵییەو بە بەرنامەیەکی وردەوە جێبەجێ دەکرێت، ئەرکی تۆ تەنها ئەوەیە بەباشی بخوێنیتەوەو هەوڵبدەیت. ئەوەی لێرە فێری دەبیتو ئەوەی لە ئەزموونی کارکردندا دەستت دەکەوێت، گەر لە گەڵیاندا بەرنامەیەکت بۆ خوێندنەوە هەبێت، پاش چەندساڵێکی تر سوود لە بەرهەمەکەی دەبینی. پێویستە پشت بە خۆت ببەستیو بەبەردەوامی بخوێنیتەوە، ئەم خولانە لە ماوەیەکی کەمدا زۆر شتت فێر دەکات.

★ تەواوکردنی خولێکی لەم چەشنە چەندی تێدەچێت؟

- ئەوە گرفتێکی کارەکەیە، من قەرزێکی زۆری بانکی قەرزپێدانی خوێندکارانم لە ئەستۆدایە، خەرجی قۆناغەکە نزیکەی ٣٥٠٠ پاوند دەبێت، ئەوە جگە لە خەرجییە لاوەکییەکانی تر، ناچار بووم قەرز بکەمو دەبێت سوودەکەشی بدەمەوە.

★ ئەو خولە تا چ رادەیەك هەستی پشتبەخۆبەستنی لای تۆ زیادکردووە؟ ئایا هەست دەکەیت لە بوارەکەی خۆتدا شارەزاییت زۆرترە لە جاران ؟

- بەڵێ، من ئێستا لە ئامادەکردنی بەرنامەدا شارەزاییم هەیە، لە راستیدا

وەك بەڕێوەبەری ژووری هەواڵ کارەکانم ڕاپیدەکەم، ئەو پرسیارە بۆ ئەو خوێندکارانەی تازە خوێندن تەواو دەکەن زۆر سەرنج ڕاکێشە. بە دڵنیاییەوە ئاشنایی لە گەڵ شێوەی کارەکە بۆ ئەوان مایەی خۆشحاڵییە، چونکە ئەوەی لە پۆلدا فێری بوون دەبێت لێرەدا بە پراکتیکی ئەنجامی بدەن. بۆیە دەبێت لە سەعات نۆی بەیانییەوە تاکو ئێوارە کاربکەن، ئامادەباشی تەواویان بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان هەبێت، بە هەرحاڵ دۆخەکە بۆ من زۆر نوێیە، لە هەمووی گرنگتر کاتێك دەچم بۆ پەیمانگا جلی گونجاو لە بەردەکەم، لە کۆتایی ڕۆژەکەشدا پێویستیم بەوە نییە بەسەر وانەکاندا بچمەوە. لێرە لە گەڵ دونیایەکی واقعی هەڵسوکەوت دەکەم، ئەوەش لە تایبەتمەندییەکانی کاری ڕۆژنامەنووسییە.

* بە شێوەیەکی ئاسایی لەم خولەدا ڕۆژانە زیاتر باس لە چ بابەتێك دەکرێت؟

- نزیکەی سەعات ٧:٣٠ لە خەو هەڵدەستم، سەعاتێك تەماشای هەواڵەکانی تەلەفزیۆن دەکەم، پاشان سەیرێکی تلیتێکسی ڕۆژنامە ناوخۆییەکان دەکەم، سەعات ٩:٣٠ دەچم بۆ ئەنجوومەنی هەواڵ، لەوێ هەریەکەمان نزیکەی چل خولەك ماوەمان هەیە ڕاپۆرتێك لە سەر هەواڵێکی ناوخۆ ئامادەبکەین، پاشان لە سەر هەمان بابەت کۆمەڵێك پرسیارمان ئاراستە دەکرێت. بە شێوەیەکی ئاسایی ڕۆژانە کۆمەڵێك زانیاری وەردەگرین سەبارەت بە کاری پەیامنێریی‌و نووسینی مانشێت‌و تێکستی هەواڵ‌و تایبەتمەندییەکانی هەواڵی تەلەفزیۆنی‌و ڕادیۆیی‌و دانانی بەرنامەو وێنەو تۆمارکردن‌و ڕێکخستنی هەواڵ، ئەوە جگە لە توێژینەوە لە سەر یاساکان و سیاسەتەکانی حکومەت. هەروەها قسەکردن لە سەر ئاسایش‌و خۆپاراستن‌و بەڕێوەبردن، قسەی ڕۆژانەی ناو پۆلەکەمانە.

★ ئەی لە رووی پراکتیکییەوە؟

- لە کۆرسی ئایندەدا هەریەك لە ئێمە دەچینە رادیۆیەکی لۆکاڵییەوە بۆ راهێنان، لە مانگی ئازاردا مانگێك ئەزموونی پراکتیکی فێر دەبین، زۆربەی خوێندکاران حەزیان بەوەیە لە رادیۆیەکی لۆکاڵیی یان ئازاددا کاربکەن.

★ ئایا هیچ بابەتێك ماوە بتەوێت قسەی لەسەر بکەی؟

- زۆر کەس پێیانوایە بۆ کارکردن لە رادیۆ یان تەلەفزیۆن دەبێت خۆت بسەپێنیت بە سەریاندا، زۆرکەسم دیوە ئەو رێگەیان گرتووەتەبەر، بەلام بە دڵنیایەوە کەس حەزی لە چارەی ئەو جۆرەکەسانە نییە. ئەوانە بۆچوونەکەیان هەڵەیەو زوو تووشی کێشە دەبن، یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەم پیشەیە لەوەدایە دەبێت توانای رووبەڕووبوونەوەت هەبێت لە گەڵ ئەو کێشانەی کە دێنە رێگەت، لەوانەیە پێشکەشکردنی هەواڵەکان کارێکی خۆش و سەرنج راکێش بێت، بەلام پێویستە بزانیت کاری ریپۆرتەریی کارێکی بەنرخ و گرنگە. مەرجێکی زۆر پێویست ئەوەیە ئەوانەی ئەم کارە دەکەن هێمن و ئارام و لە سەرخۆبن و ئەگەر وابن بە دڵنیاییەوە بە پەیژەی سەرکەوتن و دەرکەوتندا سەردەکەون.

# ٣

# دارشـــــتن

بناغـەی (نووسـین) دەگەڕێتـەوە بـۆ پـێش مێـژوو، واتـە بـۆ ئـەو کاتـەی شمەکـە ئـاڵوویر پێکراوەکانیـان دەخـستە نـاو قـوڕەوەو بـە هەنـدێ هێمـا نیشانیان دەکـرد. ئـەو هێمایانـە نیـشانەیەك بـوون بـۆ ئـەوەی کەئـەو کاڵایـە بـەهای هەیـەو دەکرێـت لـە بەرامبەریـدا شـتێك بـدرێت. بـۆ نموونـە بڕێـك گـەنم یـان هـەر شـتێکی دیکـە، ئـەو چـەکە سـەرەتایانە لـە حەقیقەتـدا گرەنتییەك بوو بۆ خستنەڕووی کاڵاکە بەو ڕەمـزەی خاوەنەکـەی لـە سـەری دایدەنا. ئەو هێمایە جێپەنجە نەبوو، بەڵکو شێوەیەك بـوو کـە خاوەنەکـەی دەیناسییەوە، بەم جۆرە یەکەمین نووسین یان یەکـەمین ئیمـزا هاتـە ئـاراوە، هەرچەندە لەوانەیە هێندە گرنگ نەبێت، بەڵام ئەوە بـە دەسـپێکی نووسـین دێتە ئەژماردن.

## هەواڵی باش:

" بە پەلە هەواڵێکم بۆ بهێنە" ئەو ڕستەیە وێـردی بەڕێوبـەرانی بەشـی هەواڵە، بەتایبەت کاتێك ڕووبەری لاپەڕەکە بۆشایی تێـدابێت، ئـەو خواسـتە شـتێکی نـالۆژیکی نییـە، بـەو حاڵەشـەوە هـیچ کاتێـك بەڕێوەبـەری بەشـەکە نالێت: "زووکە هەواڵێکی باشم بۆ بهێنە" چونکە شتێکی سرووشتیە دەبێت ئەو بۆشاییە بە هەواڵی باش پڕ بکرێتەوە، بەڵام تایبەتمەندییەکانی هەواڵی

باش چييه؟

هەواڵی باش ئەو هەواڵەیە بەپێی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە رێکخرا بێتو بە شارەزاییەکی زۆرەوە نووسرابێتو هەڵگری زانیاری بە کەڵك بێتو سەرنجی خوێنەر راکێشێو لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە پێداچونەوەی بە سەردا کرابێت.

ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە نووسەران هەڵەکانی خۆیان دەخستە ئەستۆی ئەوانەی بە دارشتنەکاندا دەچوونەوە، ئەمڕۆ بە تەنها بیرکردنەوەی داهێنەرانە بەس نییە، بەڵکو دەبێت پەیامنێر شارەزای رێزمانو نووسین بێت، ئەرکی ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچنەوە گۆڕاوەو لە هەندێك حاڵەتیشدا هەر بە تەواوەتی نەماوە، هەبوونی شارەزایی لە ئەدەبدا تارادەیەك پێویستە، بەڵام نابێت چاوەڕوانی ئەوە بین پەیامنێر بتوانێت وەك نووسەرە گەورەکان بنووسێت، نووسەر دەبێت توانای ئەوەی هەبێت گیان ببەخشێتە بابەتەکەی، تەنانەت جدی ترین هەواڵیش دەبێت خاوەنی قورساییو ستایلی تایبەت بە خۆی بێت.

## خویندنەوەی چاپەمەنییەکان:

ئەگەر بۆ رۆژنامە یان گۆڤارێك کاردەکەیت دەبێت بە هەمان ستایلی ئەو رۆژنامە یان گۆڤارە بنووسیت، لە سەرەتادا ئەوە بە شتێکی ئاسان دێتە پێشچاو، بەڵام هێندەش ئاسان نییە. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەبێت قەڵەمەکەت لە سەر ستایلێکی تایبەتی نووسین رابهێنی، پێویستە تێروانینێکی باشت بۆ دەرك کردن بەو ستایلە هەبێت، تا پێتدەکرێت رۆژنامە جیاجیاکان بخوێنەوە.

هەموو رۆژنامەکان، تەنانەت ئەو رۆژنامانەش کە لە ریزی گروپە تایبەتییەکاندان، یەك ستایلی نووسینیان نییە، ئاشنا بوون لە گەڵ ستایلە جیاوازەکان پێویستی بە خۆماندووکردن‌و کات هەیە، بەڵام بەرهەمەکەی ئەوە دەهێنێت، بابەتێك هەڵبژێرە کە زۆربەی رۆژنامەکان گرنگیان پێدابێت‌و لە سەر ستایلی هەر یەکە لەو رۆژنامانە راپۆرتێك ئامادەبکە. لەم راهێنانەدا رەچاوکردنی ستایلی دارشتنی هەواڵەکە زۆر گرنگترە لە راست‌و دروستی ئەو هەواڵەی دەینووسیت. پاش تەواوبوونی راهێنانەکە بەدوای لێکچووەکانی ستایلەکاندا بگەرێ، ئایا ئەو بابەتەی لە سەر ستایلی رۆژنامەی"ئەلف" نووسیوتە لە رووی ژمارەی پیتەکانییەوە لە هەواڵە راستەقینەکە نزیکە؟ ئایا ئەو راپۆرتەی کە لە رۆژنامەی "ب" ئامادەت کردووە، لە دیدی خوێنەرانی رۆژنامەکەوە مایەی سەرنج راکێشانە؟ ئایا لەو هەواڵەی بە ستایلی رۆژنامەی "پ" ئامادەتکردووە کەڵکت لە هەمان ئەو وشەو دەستەواژانە وەرگرتووە؟ کام وشە؟ بۆ نموونە لەوانەیە لە رۆژنامەی "پ" دا سوودێکی زۆر لە بنەما رێزمانییە ئاڵۆزەکان وەرگیرابێت کەچی لە رۆژنامەی "ب" دا لە بەراوردکردندا کورت‌و کاریگەرێکەی زیاترە. هەڵبەت دەبێت بزانیت ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کورت نووسین ئاسانترە. لە هەندێ حاڵەتدا گونجاندنی بابەتی راپۆرتێك لە ١٠٠ وشەدا زۆر سەختترە لە دەربرینی بە ٣٥٠ وشە.

# ستایلی داڕشتن چییه؟

ستایلی داڕشتن شێوەی تایبەتی نووسینەو هەم بۆ نووسەرو هەم بۆ خوێنەریش پێناسەی دیاریکراوی خۆی هەیە. ستایلی نووسین لە شێوازو لەهجە جیاجیاکان دەچێت. بۆ نموونە نووسەری واهەیە رستەکانی پچڕپچڕو ناپەیوەستە. هی واش هەیە دەستەواژەی هونەری و وەسفکردن تێدا زاڵە، نووسەری تر هەیە زیاتر لە زاراوەو وشەی تایبەت کەڵك وەردەگرێت. پابەندبوون بە شێوازێکی داڕشتنی تایبەت بۆ چیرۆکنوسێك لەوانەیە زۆر گونجاو بێت، بەلاّم بۆ نووسەری هەواڵ ئەو پرەنسیپە ناگونجێت و دەبێت بە ستایلی رۆژنامە یان گۆڤارەکە هەواڵەکە دابڕێژێت.

ستایلی ناوخۆیی بڵاوکراوەیەکیش بریتییە لە شێوەیەکی تایبەت لە بڵاوکراوەکە لە سەری رێککەوتوون هەر لە پێکهاتەو درێژی رستەوە بگرە تا دەگاتە گەورەو بچووکی پیتەکان و ژمارەو ناوو خاڵبەندی. هەموو بڵاوکراوەکان بۆ ئەوەی بابەتەکان یەك ریتم بن و خاڵی ئاڵۆزو شاراوەیان نەبێت و خوێنەر بەئاسانی لە ناوەڕۆکەکەی بگات و شێوازەکەی بناسێتەوە. لە نێوان خۆیاندا لە سەر کۆمەڵێ مەرج رێکدەکەون و پێویستە هەموو نووسەران پەیڕەوی لێبکەن. بەرەچاوکردنی ئەو خاڵانە یەك ریتمی بڵاوکراوەکە پارێزراو دەبێت. تەنانەت ئەگەر ناوەڕۆکی هەواڵەکان لای نووسەران بە بەردەوامی گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەلاّم یەك ریتمیی لە زمانی نووسینەکەدا دەمێنێ و ئەمەش خۆی لە خۆیدا تایبەتمەندی بڵاوکراوەیەکی سەرکەوتووە.

ستایلی نووسین ئەگەر تایبەت بێت بە خۆتەوە یان بە بڵاوکراوەیەکەوە،

هەنگاوێکی باشە بۆ پەیوەندیکردنێکی ڕاشکاوو ئاشکرا لە ڕێگەی ڕۆژنامەکەوە لە گەڵ خوێنەراندا. هەوڵدان بۆ داڕشتنی هەواڵێك بە شێوەیەکی تایبەت لەوانەیە زیان بەئامانجی هەواڵەکە بگەیەنێت. دەبێت بزانیت ئامانجی سەرەکی هەواڵ بریتییە لە خستنەرووی زانیاری ڕاستو کورت لە ڕێگەی شێوازێکی ڕێکوپێکەوە. لە پاش ئەوە ستایلی داڕشتن بە پلەی دووەم دێت، چونکە خوێنەر زیاتر بە دوای زانیاری دروستدا دەگەڕێ نەك توانای لە ڕادەبەدەری نووسەرێك. واتە نابێت ناوەڕۆکی بابەتەکە بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ستایلەکەوە. ڕەچاوکردنی ستایلی داڕشتنی بڵاوکراوەیەك نەك هەر بەربەست نییە لە بەردەم ناوەڕۆکی بابەتەکەدا، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی نووسەرانو ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچنەوە کاتێکی زۆر بۆ پێداچونەوە بە ئیملاو ڕونکردنەوەو خاڵبەندی ژمارە بە فیڕۆ نەدەن. ڕێبازی کارکردنەکەش بە شێوەیەکی ڕەوانو سادە لە کتێبێکی تایبەتی داڕشتندا باس کراوە.

ستایلی داڕشتن دەبێتە هۆی ئەوەی جیاوازی بۆچوون لە نێوان تیمی نووسەراندا سەر هەڵنەدات، چونکە هیچ نووسەرێك ناچار نییە دەستبەرداری شێوازەکەی خۆی بێتو لە سەر شێوازی یەکێکی دیکە بنووسێت.

## بەکورتی:

* پێویستە هەموو ڕۆژنامەیەك کەتەلۆکێکی تایبەتی هەبێتو تێدا بنەماو ڕێبازو شێوازی خاڵبەندیو ڕێزمانی پەیڕەوکراوی دیاری کردبێت.
* ئەم کەتەلۆکە دەبێتە هۆی ئەوەی نووسەرو هەڵەچنو هەواڵنووس یەك شێواز پەیڕەو بکەن.

* ئەگەر رێزمانو خاڵبەندی یەکسان بن، خوێندنەوەو تێگەیشتن لە بابەتەکە ئاسانتر دەبێت.

* دەبێت لە سەر نووسینی هەندێك ژمارە رێککەوتن هەبێت. بۆ نموونە لە جیاتی ئەوەی بنوسێت سەعات سێ یان ۳:۰۰ رێکدەکەون بنووسرێت سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، یان لە جیاتی ۱۰۰ دۆلار بنوسرێت ۱۰۰$.

تەنها لە هەندێك حاڵەتدا دەکرێت دەستەواژەی درێژ بنوسرێت. ئەویش کاتێکە وشەیەك یان زاراوەیەك ماناکەی تەنها بە شیکردنەوە زیاتر روون دەبێتەوە. لە هەندێك بڵاوکراوەدا کورتکردنەوەی وشەو زاراوە دەبێتە تایبەتمەندی ئەو بڵاوکراوەیە.

## زاراوەکان:

نووسەر دەبێت وەك هەڵەچن هەردەم فەرهەنگێکی زاراوەکانی لابێت. بەکارهێنانی ئەم جۆرە کتێبانە نەك هەر دەبنە هۆی بەرچاوڕوونی، بەڵکو یارمەتی نووسەر دەدەن تاکو بازنەی زاراوەکان لە لای بەربلاوتر بێت. گەڕان بەدوای ڕەگو ریشەی زاراوەکان کارێکی باشە بۆ فراوانبونی زانیاری سەبارەت بە زمانەوانی لەلای نووسەران. گەر مانای زاراوەیەکت نەزانی، یەکسەر لە فەرهەنگێکدا بۆی بگەڕێ. تێگەیشتن لە مانای وشەو زاراوەکان لە رێگەی فەرهەنگەوە، رێنماییەکی باشە بۆت. ئامادەکردنی لیستی زاراوە نوێیەکانیش هەنگاوێکی باشە بۆ فێربوون.

## پێداچوونەوەی تێکستێك:

بۆ پێداچوونەوە بە تێکستێکدا، بۆچوونە شەخسییەکانی ئەو کەسەی پێداچوونەوەکە دەکات، هێندەی ڕاهێنانو مومارەسەی ئەو لەو کارەدا گرنگی هەیە. نووسەری تێکستێك، تێکستەکەی خۆی هێندە بەلاوە پەسەندە پێی ناکرێتو زۆر سەختە بەلایەوە وشەیەك یان دەستەواژەیەك لەو نووسینە ڕەشبکاتەوە. چونکە پێیوایە هەموو ئەو وشەو دەستەواژانە توانیویانە تێکستێکی ڕەوان دروست بکەنو گیانی بە بەردابکەن. نووسەرێك بۆ ئەوەی بتوانێت وەك ئەوکەسەی بە بابەتەکەدا دەچێتەوە تەماشای تێکستەبکاتو شەو دەستەواژە زیادەکان فڕێ بدات. تواناو شارەزاییەکی زۆری گەرەکە.

لە ڕووی تیورییەوە پێداچوونە بە تێکستێکدا کارێکی هێندە ئاسان نییە. نووسەرو ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچنەوە لە بنەڕەتدا یەك ئامانجیان هەیە، ئەویش ئامادەکردنی هەواڵێکی کورتو شەفافو چاکە.

کاریگەرترین شێواز بۆ گەیشتن بەو ئامانجەو گونجاندنی ستایلی داڕشتنی بڵاوکراوەکە لە گەڵ تێکستەکەدا ئەوەیە نووسەرەکە زۆر بە وردی هەواڵەکە بخوێنێتەوەو گۆڕانی گونجاوی تێدا ئەنجامبدات. پێشئەوەی هەواڵەکە ڕەوانەی لای هەڵەچن بکرێت. دەبێت نووسەر خۆی هەڵەچنی بکات. بۆئەوەی ناوەڕۆکی تێکستەکە ئاشکراو شەفاف بێت، دەبێ هەڵە ڕێزمانییەکان ڕاستبکاتەوەو دەستەواژە ناپێویستییەکانی لێهەڵبگرێت.

ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچنەوە دەتوانن گیان بەبەر تێکستێکی بێگیاندا بکەن. هەرچەندە دەبێت دان بەوەدا بنێین ئەو دەمەی کاتی

تەسلیمکردنی تێکستەکانیان نزیك دەبێتەوە. ناتوانن بە گوێرەی پێویستو بەوردی هەڵەچنی بکەن. شتێکی سروشتییە لە رابردوودا جۆرێك لە ململانێ هەبوو لە نێوان ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچوونەوەو ئەو نووسەرانەی هەرگیز رێگە بەوە نادەن تێکستەکانیان کورت بکرێتەوە. ئەو مەسەلەیە هێندە جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە ئەوانەی بە بابەتەکاندا دەچنەوە گلەیی ئەوە لە نووسەران دەکەن بە بەردەوامی وشەو رستەو دەستەواژەی زیادە بەکاردەهێنن. بەبێئەوەی سوود بەتێکستەکەیان بگەیەنێت، ئەو گلەییەش رەواو لە جێگەی خۆیدایە.

ئەوانەی بەشەکانی رۆژنامەوانیو پەیامنێرییان تەواو کردووە، لە بەکارهێنانی رستەی دورودرێژو ئاڵۆزدا دەستێکی باڵایان هەیە. درێژدادڕیی زیاتر لە زانکۆکانەوە فێر دەبن، چونکە لەوێدا بۆ گەیشتن بە دەستەواژەو زاراوەی تایبەت ناچارن بابەتەکانیان درێژ بکەنەوە.

لەم قۆناغەی فێربووندا جەخت لەسەرئەوە دەکرێتەوە وشەی ئاڵۆزو بێمانا بەکاربهێننو بابەتەکە درێژبکریتەوە. ئەم جەختکردنەوەیە دەبێتە هۆی ئەوەی پەیوەندییەکی راستو رەوان لە نێوان خوێنەرو تێکستەکاندا دروست نەبێت. دەکرێت زۆربەی نووسینەکان کورت بکرێنەوە. کاری سەرەکی ئەوەی بە باتەکەدا دەچێتەوە بریتیە لەوەی ئەو وشانە بدۆزێتەوە کە لایان بدەیت مانای تێکستەکە لەق نەبێت، بەڵام گەر نووسەرێك ناچار بوو لە ژێرگوشاری کاتێکی دیاریکراودا کار بکات. چۆن دەتوانێت خۆی لە دروشمو وشەی سواو دووربخاتەوە؟

## درێژدادڕیی لە بەکارهێنانی وشەدا:

لە کاری پەیامنێریدا پانتایی بۆ خۆی گرنگییەکی تایبەتی هەیە. ئەگەر بکرێت یەك زاراوە لە جیاتی چەندین زاراوەی تر بەکار بهێنرێت. ئەوکات پانتاییەکی زیاترت بۆ دەربڕینی زانیارییەکانت دەستدەکەوێت. سوود وەرگرتن لە زاراوەی هاومانا ناهێڵێت خوێنەر لە خوێندنەوەی تێکستەکە هیلاك بێت، بە هەرحاڵ نابێت لە زاراوەیەکی چەند مانایی یان ڕونکردنەوەی ناوەڕۆکەکە لە جیاتی وشەیەکی سادە سوود وەربگیرێت، زاراوەی کورت لە زاراوەی درێژ پەسەندترە.

بە گشتی ڕستەکان دەبێت کورت بن. هەوڵبدە ڕستەیەك لە سی (٣٠) وشە تێپەڕ نەکات. بەکارهێنانی ڕستەی درێژ لەگەڵ ڕستەیەکی تر کە تەنها (١٠) وشەی تێدا بەکارهاتووە، فرە مانایی دەداتە بابەتەکەت.

## نووسینی لیدو تێکست:

گرنگترین بەشی هەواڵ یان ڕاپۆرتێکی درێژ *(لید)ە* کەیەتی، بە تایبەتی ئەو چەند وشەیەی سەرەتا کە تێیدا هەم سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشرێتو هەم خاڵە سەرەکیەکانی ڕووداوەکەش بە کورتترین شێوە دەخرێتەڕوو، دابەشکردنی بابەتەکە بەسەر چەند پەرەگرافێکدا تێگەیشتنی ناوەڕۆکەکەی بۆ خوێنەر ئاساندەکات، لە ڕاستیدا هەر پەرەگرافێك لە چەند ڕستەیەك پێکدێتو بەشێك لە ناوەڕۆکی تێکستەکە دەخاتە ڕوو. هەر پەرەگرافێك لە دیمەنە جیاجیاکانی شانۆگەرییەك دەچێتو لە کۆتایی هەواڵەکە نزیکمان دەخاتەوە، پێویستە پەرەگرافەکان زۆر بە جوانی پێکەوە گرێ بدرێن. بۆ

ئـەم مەبەسـتـە دەكرێـت لـە هەنـدێك وشـەی وەك (چـونكە، *بەناچـاری، لـە لەراسـتيدا، ئەگەرچـی، لـە هەمانكاتـدا*) كـەڵك وەربگيرێـت. لـە هەنـدێك بڵاوكراوەدا لەوانەيە رستەيەك بۆ خۆی پـەرەگرافێك بێـت. تێكستەكە بكـە بەچەند پەرەگرافێكەوە، پەرەگرافەكانيش بكە دوو بەشی كورتو درێژەوە.

## سيفەتەكان:

بۆ وەسفكردنی باشتر يان پێدانی زانياری زۆرتر، دەتوانيـت كـەڵك لـە بـە كارهێنانی سيفەتەكان وەربگريت.

## وردبينی:

نووسينی بابەتی كورتو شەفاف جۆرێكە لە زيرەكـی، بـەڵام لـە هـەمووی گرنگتر بۆ نووسەر ئەوەيـە زانيـاری وردو راسـت بـدات بـە پـەيام وەرگـر، بـۆ ئـەوەی راسـتييەكانی رووداوێـك بخرێتـە روو تـاكو خوێنـەر وێنەيـەكی درووسـتو تـەواوی ماجراكـەی لابێـت، نووسـەر پێويـستی بـە توانايـەكی زۆر هەيە، دەبێت وردەكاریو زانيارييەكان لـە رسـتەكاندا بخاتـە روو، ئامـانج لـە نووسـينی هـەر هـەواڵێك بريتييـە لـە گەيانـدنی زانيـاری راسـتو دروسـتی رووداوێك بە خوێنەران.

نموونەی (١)

*لۆرييەكی گەورە كە كـۆنترۆڵی خـۆی لـە دەسـتدابوو خـۆی كێـشا بـە ديـواری كوخێكی كۆن لە نزيك " ولف همپتۆن" ، شاهيد حاڵەكانی ئەم رووداوە دەڵێن خێرايـی لۆرييەكـە يـەكجار زۆر بـووەو لـەناكاو كـۆنترۆڵی لـە دەستداوەو لـە جادەكە دەرچووەو خۆی كێشاوە بە ديواری كوخەكـەدا. شـارەزايان پێيانوايـە*

*ئەگەر لۆرییەکە لە دیوارەکە دەربهێنرێت ئەوا دیوارەکە بە تەواوەتی هەرەس دەهێنێت. شۆفێرەکەو چەند کەسێك کە بەرێکەوت لەوێدا بوون تووشی شۆك هاتوونو ڕەوانەی نەخۆشخانە کراون.*

نموونەی (٢)

*لۆرییەکی دووتەنی کە گەلابەیەکی بە دواوە بوو، بۆ ئەوەی لە ڕێبوارێك نەدا لە جادەکە چووە دەرەوەو خۆی کێشا بە دیواری کوخێکی کۆندا کە لە سەدەی حەڤدەیەمدا درووستکراوە، لۆرییەکە گۆشتی هەلگرتبوو. دوێنی بەیانی سەعات هەشت، نیو سەعات پێش ڕووداوەکە لە گوندی "ترسکۆت" کە سەر بە شاری "ولف همپستۆن"ە، بە شارێی "پرترد A454"دا کەوتبووە ڕێ. بە پێی قسەی شایەتحالەکان خێرایی لۆرییەکە ٣٠ میل زیاتر بووە لە سەعاتێکداو لە ناکاو شۆفێرەکە کۆنترۆلی لە دەستداوەو خۆی کێشاوە بە کووخەکەدا.*

*پسپۆرانی بواری بیناسازیی دەڵێن بۆ دەرهێنانی لۆرییەکە لەو دیوارە پێویستییان بە سلَنگو نوێلی بەرزکردنەوەی قورسایی هەیە. شۆفێرەکەو دوو کەس لەوانەی لەوێدا بوون بریندار بوونو ڕەوانەی نەخۆشخانەی "ولف همپستۆن" کران. لە کاتی ڕووداوەکەدا کەس لە ناو کووخەکەدا نەبووە.*

لە نموونەی یەکەمدا هەرچەندە هەواڵەکە کەمێك نائاشکرایە، بەلام وشەی زیادەی تێدا نییە. بابەتی دووەم وردەکاریەکانی ڕووداوەکەی تێدایە، بەلام درێژییەکەی دوو هێندەی نموونەی یەکەمە. ئایا دەکرێت ئەم تێکستە کورت بکرێتەوە بەبێ ئەوەی وردەکارییەکانی لابرێت؟!

نموونەی(٣)

*لۆرییەکی دوو تەنی بۆ ئەوەی ڕێبوارێك نەشێلێت لە جادەی "پرترد*

*A454" دەرچوو و خۆی کێشا بە کوخێکی کۆنی سەدەی حەڤدەیەمدا. لۆرییەکە گۆشتی هەلگرتبوو، دوێنێ سەعات هەشتی بەیانی، نیو سەعات پێش رووداوەکە لە گوندی ترسکوتی سەربە "ولڤهەمپستۆن" کەوتبووە رێ، بە قسەی شایەتحاڵەکان خێرایی لۆرییەکە ٣٠ میل زیاتربووە لە سەعاتێکدا، ئەوەش زیاتر لە رادەیەیە کە رێگەی پێدراوە. هەر ئەوەش بووەتە هۆی لە دەستدانی کۆنترۆلی شۆفێرەکە. شارەزایانی بیناسازیی پێیانوایە بۆ دەرهێنانی لۆرییەکە پێویست بە سلنگ ونویل دەکات. شۆفێرەکەو دوو رێبوار بە هۆی برینداربوونیان بران بۆ نەخۆشخانەی" ولڤ همپستۆن" ، لە کاتی رووداوەکەدا کەس لە کووخەکەدا نەبووە.*

هەرچەندە نمونەی سێیەم هێندەی یەکەم کورت نییە، بەلام زۆربەی زانیارییەکانی رووداوەکەی تێدایە. تا پێت دەکرێت لە جیاتی وشەی درێژ وشەی کورتتر بەکاربهێنە.

## دەستە واژە کلێشەییەکان:

خۆت لە دەستەواژەی کلێشەییو سواو دووربگرە، ئەوە کێشەی زۆربەی نووسەرانەو ناتوانن خۆیان لە دەستەواژە کلێشەییەکان دوورخەنەوە. هۆکەشی ئەوەیە ئەو دەستەواژانە کار ئاسانییان بۆ دەکاتو دۆزینەوەیان ئاسانە، بەلام نابێت رۆژنامەنووسانو ریپۆرتەرەکان ئەو حەقە بدەن بە خۆیانو رەخنە لە نووسەران بگرن لەبەر ئەوەی ئەوا دەکەن، چونکە خۆیان لە هەموو کەسێك زیاتر ئەوکارە دەکەنو کردوویانەتە مۆدە.

لە سەرەتادا کاتێك ئەو دەستەواژانە بەکار دەهێنرێن، زۆر مایەی نیگەرانی نیین، بەلام زۆر بەکارهێنانیان دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی

کاریگەرییان. لەم سەردەمەدا کە پەیوەندییە جیهانییەکان خێراترن لە جاران، وشە کلێشیەکان زۆر زوو دەسوێن.

لە کاتی پێداچوونەوە بە تێکستەکاندا، هەوڵبدە وشە کلێشەییەکان بدۆزەرەوەو لە جیاتی ئەوان وشەی ڕونترو ڕاشکاوانەتر بنووسە. تەنها لە کاتی گواستنەوەی قسەی کەسانی تردا وشە کلێشەییەکان بنووسەوە، چونکە مرۆڤ لە قسەکردنی ڕۆژانەدا زۆرترین وشەی کلێشەیی بەکار دەهێنێت.

لە هەندێك حاڵەتدا نووسەر بە ناچاری وشەیەکی کلێشەیی بەکاردەهێنێت، چونکە هیچ وشەیەکی تر ناتوانێت ئەو مانایە بگەیەنێت.

## زمانی پسپۆڕیی:

ئەو نووسەرانەی بۆ بڵاوکراوە بازرگانیو پیشەییەکان کاردەکەن، هەندێك زاراوەی تەکنیکی تایبەت بە خۆیان لەو بوارەدا هەیەو خوێنەرانیش ماناکانیان دەزانن، بەڵکو چاوەڕێی ئەوە دەکەن ئەو جۆرە زاراوانە لەو بڵاوکراوانەدا ببینن، بەڵام دەبێت لە بڵاوکراوە گشتییەکاندا ئەو زاراوانە زۆربەکەمی بەکار بهێنرێنو لە کاتی پێویستدا ماناکانیان شی بکرێتەوە.

## هێما کورتکراوەکان:

وەکو چۆن پێشتر باسمانکرد، نووسەر نابێت چاوەڕێی ئەوە لە خوێنەران بکات ئاشنای هێما کورتکراوەکان بن. بۆیە لە پاڵ بەکارهێنانی هێما کورتکراوەکاندا ماناکەشی بنووسە. هەندێك هێما هەن پێویست بە نووسینی

ماناكانیان ناكات، چونكه هەموو كەسێك ئاشنایەتی لە گەڵیاندا هەیە، باشتر وایە لە یەكەم بەكارهێنانی هێماكەدا، ماناكەی بنووسرێت، دواتر پێویست ناكات.

## زانیاریو رووداوەكان:

یاسایەكی پەیامنێریی هەیە دەڵێت: پێویستە زاراوە كورتكراوەكان تەنها جاری یەكەم بە درێژییو بەشێوەی تەواو بنووسرێن. هەم لە كاتی گەیاندنی زانیاریو هەم لەكاتی گێڕانەوەی رووداوێكیشدا، دەبێت رۆژنامەنووس هەمان شت بكات، چونكە مەرج نییە خوێنەر ئاگای لەو زانیارییانە هەبێت. بۆ نموونە چاپەمەنییەكانی بریتانیا وشەی *"گلاستۆن بری"* بۆ ڤیستفاڵی مۆسیقای پۆپ بەكاردەهێنن كە ساڵانە لە شاری "سومریست" ساز دەكرێت، بەڵام لەوانەیە هەندێك كەس بە شاری *"گلاستۆن بری"* ی تێبگەن كە چەند میلێك لە شوێنی ڤیستفاڵەكەوە دوورە، بۆیە دەبێت بەم شێوەیە باس لە ڤیستفاڵەكە بكرێت:

*" بەرپرسانی ڤیستفاڵی موزیكی پاپی " گلاستۆن بری" كە ساڵانە لە گوندی " پیلتۆن" ی شاری سومرست ساز دەكرێت، بەنیازن ئەمساڵ ریكۆردی ژمارەی بەشداربووانی ڤیستفاڵەكە بشكێنن، ئەوەی جێگەی باسە رێژەی بەشداربوون لەم ساڵانەی دواییدا كەمی كردووە"*

لەم بابەتەدا بە روونی وشەی *"گلاستۆن بری"* بۆ خوێنەران روونكراوەتەوە، لە بابەتی دووەمدا وشەی *" واترگێت"* چۆن چۆنی بۆ خوێنەر روونكراوەتەوە:

چۆنێتی گەیشتن بەو شوێنەیان بەراوردكردوە بە رووداوی "واترگێت"،

واتە ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٧٢ بە فەرمانی دەسەڵاتداران هەندێك لە بەڵگەنامەکانی حکومەتیان دزی. دواتر لێکۆڵینەوەکان بوونە هۆی لەکارلابردنی راوێژکارانی سەرۆك کۆمار "ئیچ ئورهالدمان" و "جان دی ئیرلشمان" و لە هەمووی گرنگتر بووە هۆی لێکۆڵینەوە لە گەڵ خودی سەرۆك کۆمار" ریچار نیکسۆن"

## درێژدادڕیی

یەکێك لە کێشە گەورەکانی زمانی ئینگلیزی ئەوەیە، ژمارەی ئەو وشانەی بۆ گەیاندنی مانای زاراوەیەك بەکاردێن یەکجار زۆرن. بۆیە نووسەر دوو دڵ دەبێتو ناچارە چەند وشەیەك بەکار بهێنێتو ئەوەش دەبێتە هۆی درێژدادڕیی. ئاگادارە بە هەوڵەکانت بۆ بەکار نەهێنانی وشەی کلێشەیی، نەبێتە هۆی درێژ بوونی تێکستەکەتان.

**نموونەی ١**

*ئەو بڕیارەی ئەنجومەن بۆ دروستکردنی جۆرە خانوویەك کە لە گەڵ پاراستنی ژینگەدا بگونجێت. لە لایەن ڕێکخراوەکانی ژینگە پارێزییەوە پێشوازی لێکرا، ئەو خانووانە بە ڕەنگی سەوز بۆیاخ کراونو ئەوانەی تێدا نیشتەجێ بوون دەتوانن بە هاوبەشی پارچە زەویەك بۆ چاندنی سەوزە بەکاربهێنن. لە قۆناغی پلاندانانا ئەندامانی ئەنجومەن بیرو بۆچوونی پسپۆڕانی ژینگەپارێزییان پەسەند کردو دڵنیایان کردنەوە کەوا لەمەودوا سوود لە پێشنیازەکانیان وەردەگرن. تەواو کردنی خانووەکان لە پێش تەواوبوونی کاتی خۆی مایەی سەرسوڕمان بوو بۆ ئەندامانی ئەنجومەن، بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبێت ئەو ڕاستییانەی بە نهێنی ماونەتەوە سەبارەت*

*بە کرینی زەویەکە ئاشکرا بکرێن.*

پاش لادانی وشە زیادەکان هەواڵەکە بەم شێوەی لێدێت.

**نموونەی ٢**

*رێکخراوەکانی ژینگە پارێزی پێشوازیان لەو بریارەی ئەنجوومەن کرد سەبارەت بە درووستکردنی جۆرە خانوویەك لە گەڵ ژینگەیەکی پاکدا بگونجێت. دانیشتوانی ئەو خانووە سەوزانە دەتوانن بۆ چاندنی سەوزە لە پارچە زەوییەکی هاوبەش کەڵك وەرگرن. لە کاتی پلانداناندا ئەندامانی ئەنجوومەن پێشوازیان لە بۆچوونی پسپۆرانی ژینگە پارێزیی کرد، تەواوکردنی خانووەکان پێش کاتی خۆی بووە هۆی سەرسورمانی ئەندامانی ئەنجوومەن. بەهەر حاڵ دەبێت راستییە پەیوەندیدارەکان بە کرینی زەویەکە ئاشکرا بکرێن.*

*پاش چەندین دانیشتن و وتووێژی رووبەرووی درێژخایەن، ئەنجوومەن بەرنامەی پەرەپێدانی ژینگە پارێزیی پەسەند کرد.*

دەستنیشانکردنی بابەتە زیادەکان لە سەرەتادا سەختە. نووسەر دەبێت خۆی لە سەر ئەوە ڕابهێنێت کە بەیەك چاوپێخشان زیادەکان دیاری بکات. بگەرێت بە دوای زاراوەی هاوماناو دوبارەدا وشە نازەروورییەکان فرێ بدات. بەم پێیە رستەکەی سەرەوە بەم جۆرەی لێدێت:

*پاش دانیشتن و وتووێژی زۆر، ئەنجومەن بەرنامەی پەرەپێدانی ژینگە پارێزیی پەسەند کرد.*

## خواستن ئیستعارە:

بۆ داهێنانی زیاتر، زۆر جار لە نووسیندا کەڵك لە ئیستعارەگردنی وشەو دەستەواژەی تایبەت وەردەگیرێت. ئەگەر بتوانیت ئەو ئیستعارەیە زۆر بە جوانیو لە جێگەی خۆیدا بەکار بهێنیت، ئەوا وێنەیەکی جوانو تەواو لە هزری خوێنەردا درووست دەکەیت. بەڵام دەبێ خۆت لە بەکارهێنانی ئیستعارەی بێ سوود دووربخەیتەوە. هەر لە کاتی نووسینی هەواڵدا بەکارهێنانی ئیستعارە لە چەند حاڵەتێکداو بەبێ پاساو بەو مانایە دێت کە نووسەرەکە دەیەوێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی وشەی سادەو ئامادە پانتایی بابەتەکە پڕکاتەوە.

لە کاتی بە کارهێنانی ئیستعارەدا هەوڵبدە لە بابەتە سەرەکییەکە دوور نەکەویتەوەو زیادە ڕۆییش نەکەیت،

خۆت لە پێکەوەلکاندنی ئیستعارەکان دووربگرە، چونکە ئەو کارە نیشانەی ئەوەیە نووسەر شارەزایی لە بەکارهێنانی ئیستعارە بە شێوەیەکی ڕاست نییە. لە یەك حاڵەتدا دەکرێت ئیستعارەکان پێکەوە بلکێنرێن، ئەویش ئەو کاتەیە کە نووسەر بیەوێت تێکستێکی تەنز ئامێز بخوڵقێنێت.

## دەربڕینی ڕەوان:

یەکێك لەو هونەرانەی دارشتن کە دەکرێت نووسەر لە ڕێگەیەوە بێنەوەی وشەو زاراوەی نەگونجاو بەکاربهێنێتو مەبەستەکانی خۆی بگەیەنێت، دەربڕینی ڕەوانە. ئەم بابەتە لەو کاتانەدا دەردەکەوێت کە باسی جەنگو مەرگو مەسەلە جنسییەکان دەکرێت، چونکە لەو حاڵەتانەدا لەبەر

مەسەلە هەستيارەكانو رايگشتى ناكرێت بە ڕوونىو بىێ پەردە باس لەو بابەتە بكرێت. پەيامنێرانى جەنگ لەم حاڵەتانەدا هەندێك دەربڕينى وەك زيانى گيانى، زيانى لابەلا، بۆمبى ژير، تەقە لە يەك كردنو بۆچوونى رەگەز پەرستانە، بەكاردەهێنن. ئەم دەربڕينانە زۆر هۆشيارانە بەكار دەهێنرێنو بەگشتى لە لايەن نووسينگەى پەيوەنديية گشتييەكانى وەزارەتى بەرگرييەوە رەواجيان پێدەدرێت. كارى ئەو جۆرە نووسينانە ئەوەيە شەڕو شۆڕ بە شێوەيەك پيشانبدەن نەبێتە هۆى ورووژاندنى رايگشتىو دروستكردنى نارەزايەتى.

لە كاتى ريسوايىو تاوانە جنسييەكانيشدا، هەندێك دەربڕينى وەك " پلەوپايەى ريسواكەر" بەكار دەهێنرێت. هەندێك وشەو دەستەواژەى وەك " كۆچى دوايى، نەهاتە هۆشو برينى كوشندە" بۆ كەمكردنەوەى كاريگەرى مردنى كەسێكەو لەلايەن پزيشكو پۆليسو هێزە چەكدارەكانەوە دروستكراوە.

## زاراوەى داهێنەر:

لە وتووێژى رۆژانەدا هەندێك وشەى داهێنراو دەبێتە مۆدەى رۆژ، وا دەزانرىێ ئەو وشانە زۆر گرنگن، بەڵام مەرج نييە لە بناغەدا ئەوە وابىێ. ئەو وشانە زياتر لە ريكلامو بابەتى سياسىو ئاگادارييەكاندا سەرهەڵدەدەنو پاشان دەبنە وێردى سەر زمانى خەڵك، بۆ كاريگەرى زياتر رۆژنامەنووسانيش بەكارى دەهێنن. زمانى كۆمپيوتەريى ليستێكى درێژى لەو جۆرە وشانە تێدايە وەك " ئينتەرنێت"، "داونلۆد"، پێشكەوتنى تەكنەلۆژياش وشەگەلێكى زۆرى داهێناوە. راديۆو تەلەفزيۆنەكان رۆژلە

دوای رۆژ ئەو وشانە زیاتر لای خەڵك شیرین دەکەن.

ناوی تایبەت:

بۆ دڵنیابوون لەوەی ناوەکان بە شێوەیەکی راستو وەك ئەوەی کە هەیە نووسراون، دەبێت تەماشایەکی وردی پیتەکانیان بکرێت. چونکە هەندێك ناو هەن بە چەند شێوەیەك دەنووسرێن، سەعاتو مێژوو رۆژو بڕی پارەو ژمارەکان دەبێت چەند جارێك بەراورد بکرێنەوە.

دەبێت چەند جار هەڵە بڕ بکرێت؟

پێش ئەوەی بابەتەکە رەوانەی مێزی هەواڵ بکەیت، دێڕبەدێڕ پێیدا بچۆرەوە. بە تایبەت ئادرەسو ناوو ژمارەکان، پاشان بۆ جارێکی تر بابەتەکە بخوێنەوەو هەڵە ئیملاییەکانی راست بکەرەوەو خاڵبەندیو رێزمانەکەی تەواوبکە. لە خۆت بپرسە ئایا بابەتەکەت هەڵەی تێدانەماوە؟ بەبێ شەرم بابەتەکەت بە دەنگی بەرز بخوێنەوە، هاوکارەکانیشت هەمانشت دەکەن، ئەگەر تا رادەیەك لێی دڵنیانیت، پشوویەك بدەو دواتر جارێکی تر بیخوێنەوە.

# ٤

# گفتوگۆ لە گەڵ پەیامنێرێکدا

*"تریستیان نیکولز"* کە تەمەنی ٢٢ ساڵانەو خوێندکاری پەیامنێرییە لە رۆژنامەی "ئیڤینینگ هراڵد" چاپی *(پلای مووت)* لە بریتانیا. پێشتر لە پەیمانگای خوێندنی باڵای *( پلای مووت)* خولێکی دوو ساڵی تایبەت بە راگەیاندن تەواو کردووە. خەڵاتی باشترین خوێندکاری وڵاتەکەی وەرگرتووەو چەندین وتاری لە پەیمانگاکەیدا پێشکەش کردووە. *"نیکولز"* لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا لە گۆڤارێك لە گوندەکەی خۆیدا کاری کردووە، تاکو گەیشتووەتە ئەم رادەیە زۆر خۆی ماندوو کردووە:

★ چۆن لەوە ئاگادار بوویتەوە لە رۆژنامەی *" ئیڤینینگ هراڵد"* هەلی کارکردنت بۆ رەخساوە؟

- بە رێکەوت بوو، لە پەیمانگا بۆ تەواوکردنی خولی ئەزموونی پراکتیکی رەوانەی ئەو رۆژنامەیە کرام، لە بەشە جیاجیاکانی کارم کرد، سەرەتا لە بەشی گرافیك پاشان لە بەشی ئاگادارییەکان، لە کۆتایدا لە بەشی نووسیندا خۆم دۆزییەوە، لە رێگەی ئەو پەیوەندییانەوە بوو هاتمە رۆژنامەکەوە، پێشتر بۆ ماوەی دوو هەفتە لە رۆژنامەی *" ساندی ئینڈی پندنت"* کە رۆژنامەیەکی لۆکاڵیەو تایبەتە بە هەواڵەکانی رۆژئاوای وڵات کارم کرد.

★ ئایا ئەوە یەکەم جاری کارکردنتان بوو ؟

- ئەوە یەکەمین کارکردنی من بوو لەو بوارەدا، پاش تەواو کردنی خوێندن گرێبەستەکەم ئیمزا کرد، پێشتر لەو پلانەی حکومەت بۆ

دۆزینــەوەی کـار نـاوی خـۆمم نوسـیبوو، ڕۆژێـك تەلـەفۆنم بـۆ کـراو پێیـان ڕاگەیاندم ڕۆژنامەی *" ساندی ئینلدی پنلنت"* پێویـستییان بـە پـەیامنێرێك هەیە، پاش ئەوە نامەیەکم بۆ نووسینو دواتر چووم بۆ چاوپێکەوتن، ئەوان بـۆ خـولێکی ئـەزموونیی شـەش مـانگی قبوولێـان کـردمو دوای تـەواوکردنی خولەکـە داوام لێکـرا دەسـتبەکاربم، نزیکـەی هـەژدە مـانگ لـە گروپـی بڵاوکـراوە تایبەتەکانـدا سـەرقاڵ بـووم، لـەوێ ڕۆژنامــە بازرگانییــەکانمان چاپدەکرد، زۆر شت فێر بووم، بەڵام ئەزموونی پەیامنێریی فێر نەبووم.

* پـاش ماوەیــەك کـارکردن لــە بڵاوکـراوە تایبەتییــەکانی بازرگـانی، کۆکردنەوەی هەواڵ بۆ ڕۆژنامەیەك چۆن بوو بە لاتەوە؟

- من ڕۆژانە لە گەڵ پـەیامنێرانی ڕۆژنامەکە کارم دەکـردو پێمدەگوتن حەزم لێیە ڕاپۆرتیان بۆ بنووسم، لە سەرەتادا بـە نووسـینی بابـەت لـە سـەر هاوڕێکانمو هەڵسوکەوتەکانیان دەستمپێکرد، بەم شێوەیە بوو چوومە بەشی نووسـینی ڕۆژنامەکــەوە، چــەند مانگێــك لــەوێ مامــەوەو ئەوەشــم بــە خۆبەخشانە ئەنجامدا.

* بۆ ئەو کارە مووچەت وەردەگرت؟

- نـەخێر، مـن تـەنها لـە بڵاوکـراوە تایبەتییەکانـدا مووچـەم وەردەگـرت، پاش ئـەوەی چـەند مانگێـك لـە ڕۆژنامەکـەدا کـارم کـرد ڕۆژێـك تەلـەفۆنیان بۆکردمو پێیان ڕاگەیاندم سبەی دەبێت لە کۆبوونەوەدا بەشداری بکەم، لـەو کۆبوونەوەیەدا وتیان بڕیاردراوە بەشـی بڵاوکـراوە تایبەتـەکان بگوێزرێتـەوە بـۆ *"فـالۆت"*، مـن تـازە شـوقەیەکم بـە کـرێ گرتبـوو، زۆر سـەخت بـوو بگوازمەوە، بۆیە دەستم کرد بە نامـە نووسـینو تەلـەفۆنکردن بـۆ ئەموئـەو، لەوکاتــەدا پەیوەنـدیم کـرد بــە *"ئیڤینینـگ هراڵـد"* ەوە، داوایـان لـێ کـردم نامەیەك بۆ سەرنووسەرەکەیان بنووسمو داوای چاوپێکەوتنی لە گەڵدا بکەم،

بەم جۆرە ئەم کارەم دەستکەوت، چوار مانگە لێرە سەرقاڵی فێربوونم.

★ بۆ ئەوەی زیاتر شارەزا بیت، ئایا هیچ بەرنامەیەکت بۆ بەشداریکردن لە خولی تردا هەیە؟

- وا بڕیارە ئیدارەی ڕۆژنامەکە ماوەیەکی تر ڕەوانەی خولێکی لەو جۆرەم بکات.

★ وەك یەکەم ڕۆژی بوونە پەیامنێر، هیچ یادگارییەکتان هەیە؟

- هیچ کاتێك حەزم لەوە نییە بە تەلەفۆن گفتوگۆ بکەم، لە بیرم دێت جارێکیان بەڕێوەبەری بەشەکەم داوای لێکردم سەعات ٨:٣٠ ی بەیانی تەلەفۆن بۆ یەکێك بکەم، کاتێك تەلەفۆنم بۆ کرد وتیان هێشتا نەهاتووە، منیش وازم هێنا، بەڕێوەبەرەکەم وتی: " ئەوە بیانویەکی خراپە، تۆ دەبێت پەیوەندی بەو کەسەوە بکەی، بۆ تەلەفۆنت بۆ ماڵیان نەکرد؟" بە خۆمم وت "چۆن دەبێت سەعات ٨:٣٠ ی بەیانی تەلەفۆن بۆ ماڵی کەسێك بکەیت؟!" لە سەر ئەوە زۆریان سەرزەنشت کردم.

★ لە سەرەتای دەست بەکاربوونت لە سەر کارەکەت تووشی هیچ کێشەیەك نەهاتی ؟

- نەخێر، بەڵام لە ئەنجامدانی کارەکەمدا سوودم لە هاوکاریو ڕێنماییەکانی هاوکارەکانم وەردەگرت.

★ هاوکارەکانت یارمەتییان دەدایت؟

- بەڵێ، گەر حەزت لە فێربوون هەبێت، ئەوان یارمەتیت دەدەن، لە دەرەوەی کارەکەتدا دەبێت ئاشنای تەکنیكو کارە هونەرییەکانی پیشەکەت بیت، چونکە زۆر بە کەڵکت دێت.

★ تکایە هەندێك زیاتر تیشك بخەنە سەر کارەکانتان؟

- پێش هەموو شتێك بەیانی زوو گوێ لە ڕادیۆی "پلای مووت" دەگرم،

هەواڵەکانی تەلەفزیۆنیش لە دەست خۆم دەرناکەم، دواتر تیلیتێکست دەخوێنمەوە، لە ڕێگای نێوان شوێنی کاروماڵەکەم گوێ لە هەواڵەکانی رادیۆ دەگرم لە رادیۆی سەیارەکەم، لە ڕۆژنامەش تەماشای ڕۆژنامەی "*ویسترن مۆرننیگ*" دەکەم، دوای ئەوە دەچمە پشتی مێزەکەمو لە ئینتەرنێت سەیری هەواڵی ئاژانسەکان دەکەم تاکو بزانم هیچی نوێ هەیە یان نا، دواجار سەیری لیستی ئەو کارانە دەکەم کە لە دەفتەری کارەکانی ڕۆژنامەکەدا بۆ ئەو ڕۆژە تۆمارکراوە.

★ ئەو دەفتەرە بۆچی مەبەستێك بەکاردەهێنرێت؟

- لە دەفتەرەکەدا ناوی هەموو کارمەنـدانو ئەو ئەرکانەی کە دەبێت ئەمرۆو سبەی ئەنجامبدرێن تۆمارکراوە، ئەو دەفتەرە بۆ بەدواداچوونی کارەکان زۆر گرنگە، کاتێك بەکەسێك دەڵێیت سێ شەممە تەلەفۆنت بۆ دەکەم، دەبێت لەو دەفتەرەدا بینووسیت، پێویستە بەبەردەوامی دەفتەری ئەرکەکان ببینیو لە گەڵ بەڕێوەبەری بەشەکەدا سەبارەت بە گۆڕانکارییەکان قسە بکەی، بەدواداچوون بۆ مەسەلە ناوخۆییەکانی ئەو شەو و ڕۆژە دەکەیت.

★ هیچ ڕۆژێك ڕێکەووتوە کارێکت نەبێت ئەنجامی بدەیت؟

- ئەگەر هیچیش نەبێت هەر پێویستە کارێکم بۆ دروست بێت، تەلەفۆن بۆ ئەملاو ئەولا دەکەمو هەر بابەتێك سەرنج ڕاکێش بێت بەدواداچوونی بۆ دەکەم.

★ دەفتەری تۆمارکردنی ڕۆژانەو تەلەفۆنتان لایە؟

- بەڵێ سێ جۆر دەفتەرم لایە.

★ لە ڕۆژنامەکەتاندا لە ژێر چاودێری کێدا کار دەکەیت؟

- چوار کەس، بەرپرسی بەشە جیاجیاکان.

★ شیفتی کارکردن لە ڕۆژنامەکەدا چۆنە؟

- چەند شیفتێکە، هەیە لە ٦:٥٠ ی بەیانی تاکو ٢:٣٠ ی پاش نیوەڕۆ، هەیە لە ٨ ی بەیانی تاکو ٤:٣٠ ی پاش نیوەڕۆ و لە ١٠ی بەیانی تاکو ٦ ی ئێوارە، شیفتێکیش هەیە تاکو درەنگانێك دەمێنێتەوە ئەوەیان لە ٢ی پاش نیوەڕۆ تاکو ١٠:٣٠ ی یان ١١ی شەو دەمێننەوە، دواین ڕۆژی هەفتەش پێموایە شیفتەکان لە ٦و ٧و ٨و١٠ ی بەیانی دەستپێدەکەن، شەممەکان چەند سەعاتێك کاردەکەین و یەك شەممانیش بەیانی سەعات ٨ یەك کەس دێت و ئێوارەکەشی سەعات ٢ کەسێکی تر دێت کاری ئەوانە تەنها وەڵام دانەوەی تەلەفۆنەکانە.

★ئەو کاتانەی لە سەر کارەکەت نیت، پێت وایە دەحەوێیتەوە؟

- بە تەواوی پەیوەندیم لە گەڵ کارەکەمدا ناپچڕێنم، هەر کە گەیشتمەوە ماڵ تەلەفزیۆنەکەم دەکەمەوە، نەك بۆ تەماشای زنجیرە تەمسیلییەکان، بەڵکو بۆ بینینی هەواڵەکان، پاشان ڕۆژنامەیەك هەڵدەگرم و لە گەڵ چاخواردنەوەدا دەیخوێنمەوە، کاتێکیش دەچمە دەرەوە بۆ ئەوەی شتێك بخۆم، هاوڕێکانم پرسیاری هەواڵەکانی ڕۆژم لێدەکەن و لێرەشدا موناقشەی جیدی دەست پێدەکات، بۆیە هیچ کاتێك لە کارەکەم دانابڕێم.

★ ئەو کاتەی تایپکردنی ڕاپۆرتە هەواڵییەکان تەواو دەبێت، ئایا پرێنتی دەکەیت و دەیخەیتە سەر کاغەز و تەسلیمی بەشی هەواڵی دەکەیت، یان لە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا لە فایلێکدا هەڵیدەگریت؟

- کاتێك بە تەلەفۆن چاوپێکەوتن دەکەم، وردە کارییەکانی لە ناو دەفتەرەکەمدا دەنووسمەوە، پاشان هەواڵەکە تایپ دەکەم و بە نیتۆرك ڕەوانەی بەشی هەواڵی دەکەم.

★ بیستوومە لەم دووایانە ڕاپۆرتێکت لە سەر سەفەرە دەریاییە

**سەرنەکەوتوەکەی پیت گاس pet goss نووسیوە و ڕووداوی جیابوونەوەی بەشێك لە شاسی بەلەمەکەیت گێڕاوەتەوە، ئەوە چۆن بوو؟**

- هاوڕێیەکم لە ڕۆژنامەی میرۆر mirror کاردەکات پێی ڕاگەیاندم بەلەمەکەی *پیت گاس* لە نزیك *"دورگەی سیلی"* خەریکە نوقمی ژێر ئاو دەبێت، لە سەرەتادا بڕوام پێنەکرد، ئەویش لە سەرەتادا باوەڕی نەدەکرد، بەڵام توانیم قەناعەتی پێبهێنم، پێیوتم دوای پێنج خولەکی تر تەلەفۆنی بۆ بکەم، کاتێك پەیوەندیم کردەوە وتی بڕۆ بۆ فڕۆکەخانەی پلای موت و سواری فڕۆکە بەو بەیانی ڕۆژی هەینی بگەڕێوە، ئەو کاتە چوارشەمە بوو، من سێ ڕۆژ لە دورگە بچووك وجوانەکەی *"سن ماری"* مامەوە، پێشتر ئەوێم نەدیبوو، نزیکەی ٣٥ ڕۆژنامەنووس لە وڵاتە جیاجیاکانی دونیاوە هاتبوون، تەنانەت نەم توانی فڵچەی دان و جل و بەرگی تەواو لە گەڵ خۆمدا بەرم، من پێشتر لە کەشافەدا بووم، ئەوکات دروشمی ئێمە ئەوە بوو *"هەردەم ئامادەبە"*، بەڵام وادیار بوو ئەو خووەم لە بیر چوبویەوە.

*** چۆن پەیوندیت بە ڕۆژنامەکەتەوە دەکرد؟**

- تەلەفۆنم بۆ سەرۆکی بەشەکەم کردو مەسەلەکەم تێگەیاند، ئەو داوای هەواڵێکی لێدەکردم لە نزیکەی (٣٥٠) وشە پێك هاتبێت، دواتر لینکی کردم بە هەواڵ نووسەکانەوە، لەو کاتەدا لە سەرماندا خەریك بوو ڕەق دەبوومەوە، قەڵەم و کاغەزێکم بەدەستەوە بوو، دەبوو تەماشای دەریام بکردبایەو دیمەنی کەوتنە ژێر ئاوی بەلەمە گەورەکەم بۆیان باسکردایەو هەستی خۆمیان بۆ دەربڕم، لەو شوێنەدا مەسەلە مەسەلەی کۆکردنەوەی زانیاری نەبوو، چونکە شتەکە بە بەرچاوی خۆمەوە ڕوویدەدا، دەبوو ڕووداوەکەو ئەو بارودۆخە خەماوییەی ئەو خەڵکە تووشی هاتبوون بگێڕمەوە، بەلەمێکی گەورەی ٤،٥ ملیۆن پاوەندی خەریکە دەکەوێتە ژێر

ئاوەوە.

★ ئایا توانیت لە گەڵ خودی کاپیتان پیت گاس وتوویژ ئەنجام بدەی؟

- بە قاچاخی سواری بەلەمەکەی BBC بووم، لە گەڵیاندا چەند جارێك بە دەوری بەلەمەکە خولاینەوە، بە ڕاستی ئەزموونێکی سەیر بوو.

شەوی چوارشەممە چوومە دەرەوە شتێك بخۆم، سەعات٥:٣٠ لە خەو هەستام حاڵم باش نەبوو، چوومە دەرەوە لەوێ چاوم کەوت بە پیت گاس و توانیم پێش هاتنی ئەوانی دی چەند قسەیەکی لە گەڵدا بکەم، ئەو ڕۆژە کاپیتان گاس لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی نارەسمیدا بەشداری کرد.

★ ڕاپۆرتەکانت چۆن لە دورگەی سلی یەوە دەناردەوە؟

- تەلەفۆنم دەکرد بۆ سەرۆکی بەش و ئەویش لینکی دەکردم بە هەواڵ نووسەکانەوە، منیش بابەتەکەم بۆیان دەخوێندەوە.

★ بە چ جۆرە کۆمپیوتەرێك بابەتەکانت تایپ دەکەیت؟

- کومپیوتەرێکی ماکونتۆشم هەیە، بەرنامەی Wrdم لە سەری دابەزاندووە.

★ دەتوانیت بێئەوەی تەماشای کیبۆردەکە بکەیت تایپ بکەیت؟

- نەخێر، بەڵام دەتوانم بە خێرایی چاپ بکەم، هەموو جارێکیش تەماشای کیبۆرد ناکەم.

★ لە نووسیندا خێرایت؟

- خەریکە فێر دەبم، پێش دوو ساڵ دەستم بە خێرا نووسین کردووە، بەڵام بەردەوام نەبووم.

★ بۆ بابەتەکانت خۆت وێنە دەگریت؟

- لە کاتی چاوپێکەوتنی کورتدا خۆم ئەو کارە دەکەم، خولی وێنەگرتنم تەواو نەکردووە، بەڵام کاتێك لە دەرەوە چاوپێکەوتن دەکەم خۆم وێنەیان

دەگرم، گەر چاوپێکەوتنەکان وێنەیان لە گەڵدا بێت، بابەتەکە جوانتر دەبێت.

* ئایا پێویستە شارەزای وێنەگرتن بیت؟

- بەڵێ پێویستە.

* ئایا فیلم و کامێرات پێدەدەن؟

- بەڵێ، کامێرایەکی بچووکی گیرفانی و فیلمی پێویستمان پێدەدەن.

* چۆن پێشکەوتنی پیشەیی خۆت هەڵدەسەنگێنیت؟

- حەزم لەوەیە کارێکی زۆر ئەنجام بدەم، هەندێك جار پێموایە سەعاتەکانی ڕۆژ بەشی ئەو ئەنجامدانی ئەو کارانەی لە هزرمدایە ناکات. حەزدەکەم لە کەناڵە جیاجیاکان کار بکەم و توانای خۆم لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن تاقی بکەمەوە، ئێستا تا بڵێی لە کارەکەم ڕازیم.

* ئایا لە کارکردن لە شارەکەی خۆت هیلاك نابیت؟

- هێشتا پلای مووت زۆر شتی تری تێدا ماوە فێری بم، جگە لەوە من لەم شارەدا لە دایك بووم، کاتێك بزانم ئەزموونی تەواوم لەم شارە پەیدا کردووە، لێرە نامێنێم، حەزم لەوەیە ڕۆژێك لە کەناڵێکی نیشتمانی سەرتاسەریدا کار بکەم.

* لە هەفتەیەکدا چەند سەعات کار دەکەیت؟

- نزیکەی چل سەعات، هەڵبەت ئەوە تەنها کارکردنم لە ڕۆژنامەدا دەگرێتەوە، پاش تەواو بوونی کارەکانم بەشداری لە کۆڕو سیمینارە جۆراوجۆرەکان دەکەم، واتە لەوێشدا سەرقاڵم، خەڵك سەرنجم ڕادەکێشن و هەرکەسێك لە ژیاندا ڕۆڵێکی تایبەت دەگێڕێت، من حەزم لەوەیە لە دەرەوەبم لەنزیکەوە لە گەڵ خەڵکی جیاجیادا ئاشنایی پەیدا بکەم.

* مۆڵەتی یاسایی خۆتان چەند ڕۆژە؟

- لە ساڵێکدا پێنج هەفتە، پێش سێ ساڵ گەر پێیان بگووتبام لە بەرامبەر چل سەعات کارکردن لە هەفتەیەکدا ساڵی پێنج هەفتە مۆڵەتت دەدەینێ، لەوانەیە دڵم بوەستایە، بەڵام وردە وردە لە ڕێگەی کۆلیژو ئزموونی کارکردنمدا گەیشتومەتە ئەو باوەڕە، ئێستا کارگەیشتوەتە ئەوەی دەڵێم "کێ مۆڵەتی دەوێت؟ من کارکردنم دوێ ! "

* تا چ رادەیەك کارەکانتان لە پشت مێزەوە ئەنجامدەدەن؟

- نزیکەی ٨٠٪ کارەکانم.

* ئەوە بێزارتان ناکات؟

- راهاتووم، هێندەش ناخۆش نییە، بە پێچەوانەوە ئەوانەی بە تەلەفۆن پەیوەندییان پێوە دەکەم بێزار دەبن، چونکە پێیانخۆشە لە نزیکەوە قسەیان لە گەڵدا بکەم، بەڵام من ئەو هێمنییەی ناو رۆژنامەکەم پێخۆشە.

* ئایا ئەرکی دیکەی وەك پێداچوونەوە بە بابەتەکانی خۆتان پێناسپێرێت؟

- بەڵێ وایە، لەم دوایەدا سیستمێکی کۆمپیوتەری نوێمان بە ناوی "Tera" کڕیوە لە دانانی مانشێتو نووسینی ناوی نووسەرو پێداچوونەوە بە بابەتەکەدا یارمەتی پەیامنێر دەدات، سیستمێکی یەکجار باشەو بەباشی وەڵام دەداتەوە چونکە یارمەتی پەیامنێر دەدات لە ڕێکخستنی بابەتەکەدا رۆڵی زیاتر بگێڕێت، لە جیاتی نووسینی بابەتەکە خۆی لە نەخشەسازیەکەدا بەشداری دەکات، لە راستیدا هەموو رۆژنامەوانەکان ئەو شێوازەیان بە دڵە.

* ئایا رۆژنامەکەتان پەیرەوی لە یاساکانی کۆمیسیۆنی سکاڵای چاپەمەنییەکان دەکات؟

- بەڵێ کاتێك دەست بەکاربووم سەرمێزەکەم پڕ بوو لەو فەرمانانەی کە

دەبێت بیانكەم یان نەیانكەم، سەرۆكی بەشەكەشم هەندێك ڕوونكردنەوەی پێدام، بەڵام یەكێكی تر هاتو هەموو ڕۆژەكەی بەوە كوشتم دەبێ چۆن كار بكەم.

★ ئەو یاسایانە دەبنە ڕێگر لە بەردەم كارەكانتدا؟

- لە ڕاستیدا نەخێر، بەلای كەمەوە لە نووسینی هەواڵە لۆكاڵییەكاندا.

★ ئایا كاری ڕۆژانەی تۆ كار دەكاتە سەر ناوەڕۆكی سەروتارەكان؟

- وەك پەیامنێر دەتوانیت هەر بابەتێك حەزت لێیە بیخەیتە ڕوو، لە ڕاستیدا پەیامنێر بابەتەكەی دەفرۆشێتە سەرۆكی بەشەكە، كەواتە دەبێت هەموو هەڵەكان بقۆزیتەوە، پێویستە باشترین گۆشەنیگا بدۆزیتەوەو بە سەرۆكی بەشەكەت بڵێیت لەو تێڕوانینەوە بابەتەكەت نووسیوە، من ئێستا لە سەر كۆمەڵێك بابەتی جیدی كار دەكەم، كارەكانم زیاتر پەیوەندیان بە ژیانی خەڵكەوە هەیە، من هێشتا خۆم بە فێرخواز دەزانم.

★ ئایا ئەندامی سەندیكای ڕۆژنامەنووسانیت؟

- بەڵێ من ئەندامی سەندیكای پەیامنێرانی نیشتمانیم.

★ هیچت ماوە بۆ وتن؟

- پێم وایە من قەرزاری ئەو خۆشەویستییەم بۆ كارەكەم، بۆ گەیشتن بەم كارە مەترسی زۆرم دیوە، من هەمیشە ڕووخۆشمو ورەم بەرزە، هیچ كاتێك هەڕەشەی كوشتنم لە سەرۆكی بەشەكەم نەكردووە.

## ٥

# دارشتن و تۆمارکردنی هەواڵ

گەربتوانی بە هەمان ئەو خێراییەی لە سەر کاغەز دەنووسیت لە سەر کیبۆردی کۆمپیوتەرەکەت تایپ بکەیت، ئەوکات بە خۆت دەڵێی ئەری من جاران چۆن توانیومە کار بکەم، بۆ ئەوەی پەیامنێرێکی شایستەت لێدەربچێت، پێویستە بتوانیت لە یەك دەقەدا سەد وشە بنووسیت، خێرا نووسین شێوازێکی گرنگە بۆ دەستکەوتنی زانیارییەکان، بە تایبەت ئەو کاتانەی ریکۆردەرو مینی دیسکت لە بەردەستا نەبێت (لە کاتی دادگاییەکان و کۆبوونەوەکانی پەرلەمان)، یان ئەوکاتانەی پاتری ریکۆردەرەکەت تەواوی کردبێت و کارەباش نەبێت، ئاگاداربە خێرا نووسین لە مامۆستایەکەوە فێر بیت باشترە تاکو ئەوەی لە رێگەی کتێب و کاسێتەوە، جگە لەوەش پێشئەوەی بچیتە هەر خولێکی فێربوونی خێرا نووسینەوە باشتر وایە خۆت هێندێك راهێنانت کردبێ، چونکە کارێکی ئاسان نییە لە سەرەتاوە بتوانیت لە یەك دەقەدا سەد وشە بنووسیت. هەوڵبدە بە بەردەوامی کۆمەڵێ پاندان و قەڵەم رەساست پێبێت، پێنووسی HP بۆ خێرا نووسین باشە.

## راهاتن لە سەر تایپ کردن:

زاڵبوون بەسەر تایپکردندا تایبەتمەندییەکی گەورەیە بە راهێنان و راهاتن دەتوانی بە خێراییەکی زۆرو بێتەماشاکردنی کیبۆرد تایپ بکەیت،

ئەوەش پارمەتیت دەدا تاکو نووسینەکانت لە کۆمپیوتەرەکەتدا هەڵبگری، بۆ تایپ کردن بە شێوەیەکی خێرا بەرنامەی تایبەت هەیە، دەتوانیت لەو کاتانەی ئیشت نییە لە خولەکانی خێرا نووسین کە تایبەتن بە بەتەمەنەکان بەشداری بکەیت.

## ڕاهاتن و شارەزایی لە سەر دارشتن:

بۆ نووسینی هەواڵە جیاجیاکانی وەك هەواڵی زبرو هەواڵی نەرمو راپۆرتە هەواڵو راپۆرتە وەسف، چەندین جۆر ستایل هەیە، ئەگەرچی ئەو ژانرانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەلام چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەشیشیان هەیە، وەك وەسفو پێشەکیو وەرگرتنی وتەکانی بەرامبەر. هەواڵە زبرەکان کۆمەڵێك زانیاری نوێیان تێدایەو گرێدراون بە خوێنەرانەوە، هەواڵە زبرەکان تەنها بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی شەڕو تاوانو کارەساتە سرووشتییەکانو سیاسەت نین، بەڵکو دەکرێت لە هەواڵێکی زبردا باس لە زەماوەندێکی شکۆمەندو یانەیەکی وەرزشیش بکرێت.

هەرچەندە نووسینی هەواڵو چیرۆك زۆر لەیەك جیاوازن، بەلام وەك چۆن لە چیرۆکدا بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەر پێویستیت بە پێشەکی هەیە، لە هەواڵیشدا پێویستت بەو پێشەکییە هەیە، دەبێت نووسەر لەسەرەتای هەواڵەکەیدا کۆمەڵێك زانیاری سەرەکیو رەگەزی هەواڵ بخاتە بەردەستی خوێنەرەکانی وەك:

کێ

چ شتێك

کەی

**له كویٚ**

زۆر جــار دەتوانیــت هــەموو ئــەو زانیاریانــە لەپــەرەگرافی یەكــەمی هەواڵەكەدا جێبكەیتەوە:

*سەردەستەی باندی چەتەكان، فردی فامپڵ (كێ) دوێنێ شەو (كەی) لە ماڵەكەی خۆی لە ئەفنی گرین ( لە كوێ ) دەسگیركرا ( چی روویدا ).*

لـە كـاتی لێكۆڵینــەوە لەسـەر هـەر رووداوێـك ئـەم پرسـیارانە بكـە : چ كەسێك یان كەسانێك لە رووداوەكەدا رۆڵیان هەبووە؟ چی روویـداوە؟ كـەی روویداوە؟ لە كـوێ روویـداوە؟ پەیڕەوكردنی ئـەم شـێوازە، لـە كۆكردنـەوەی زانیاریدا یارمـەتیت دەدا، كاتێـك زانیارییـەكان بـە دەسـت دێـن، دەمێنێتـەوە سەر ئەوەی بە چ شێوەیەك هەواڵەكە دابڕێـژیت هـەم بـۆ ئەوانـەی زانیـاری پێشوەختیان لەسـەری هەیـەو هـەمیش بـۆ ئەوانـەی هـیچ زانیارییـەكیان لـە بارەوە نییە، پێویستە لیـدی هەواڵەكـە زانیارییـە سـەرەكییەكانی تێـدا بێـت، دەتوانی (چۆن؟) و (بۆ؟) هەواڵەكە لە ناوەراستەكەیدا روون بكەیتەوە:

*لـە پاش وەرگـرتنی هەنـدێك زانیـاریو دوابـەدوای ئـەو دەسـترێژەی كـە پێش دوو رۆژ لە بیلی باگنالی دووژمنی دێرینی خێزانی فامپل كـرا، پـۆلیس توانی فامپل لەیانەیەكی شەوانەدا دەسگیر بكات،*

ئایا دەكرێت ئەم رووداوە بەم شێوە دابڕێژرێت؟

*دوێنێ شەو لە ماڵی فامپڵ سەردەسـتەی چەتەكان پاش ئـەوەی كەسـێك هەواڵی لێدا دەسگیركرا،*

یان:

*فردی فامپل سەردەستەی چەتەكان، دوێنێ شەو لە ماڵەكەی خۆیدا پاش هەواڵ لێدانی دەسگیر كرا،*

هەرچەندە ئـەم رسـتانە هـەمان زانیارییـان تێدایـە سـەبارەت بـە كـەس و

شوێن و ناوەڕۆکی ڕووداوەکە، بەڵام شێوازە جیاجیاکانی داڕشتنیان ناتوانێت وەك یەکەم پەرەگراف سەرنجی خوێنەران ڕاکێشێت،

ڕێکخستنی زاراوەکان گرنگییەکی تایبەتی هەیە، خوێنەر هەرکە چاوی بە *"سەردستەی چەتەکان"* دەکەوێت، تێدەگات ئەو ڕاپۆرتە تایبەتە بە مەسەلەی تاوان، بڕگەی دووەم *"پۆلیس"* ئەو باوەڕەی لا پتەو دەکات، ئەو زاراوانە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە سەر دەست نیشانکردنی بابەتی ڕاپۆرتەکەو دیاری کردنی مانشێت بۆی، لە هەمانکاتدا چاوخشانێك بەسە تاکو لەوە تێبگەین ناوەڕۆکی هەواڵەکە چییە، ڕووداوەکە تەنها پەیوەست نییە بە دزێکی ئاساییەوە، بەڵکو کەسانی تر لە پشتی پەردەوە هەن،

ڕۆژنامەکان پڕن لە زانیاری، بەڵام خوێنەر ئەو کاتەی بەدەستەوە نییە هەموو بابەتەکان بخوێنێتەوە، بۆیە پێی باشە چاوێکی خێرا بەسەر هەموو مانشێت و وێنەکاندا بخشێنێت، کەم کەس هەیە هەموو ستوونەکانی ڕۆژنامەیەك بخوێنێتەوە، بۆیە نووسەران دەبێت لە هەڵبژاردنی زاراوەکاندا وردبین بن، تاکو سەرنجی خوێنەر بۆلای بابەتەکانیان ڕاکێشن،

پاشماوەی ڕووداوەکەش بەم جۆرەیە:

نموونەی (١):

*وا باس دەکرێت فامیلی٥٢ ساڵان پاش ئەوەی باگناڵی ٤٦ ساڵانییان بردووە بۆ نەخۆشخانە تاکو دوو گوللەکەی سینگی دەرکەن، خۆی حەشار دابوو، پاش تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر ئەو تەقەکردنەدا باگناڵ مەترسی مەرگی لەسەر نەماوە، ئەم دوو چەتەیە ململانێی ئەوەیان بوو هەر چوار یانەکەی قومارکردنی شاری (ئەفنی گرین) کۆنترۆڵ بکەن و پێشتریش شەریك و هاودەستی یەکتر بوون، لە ساڵەکانی ١٩٧٠ هەردووکیان بە تۆمەتی دزی و دەسترێژی و فرت و فێڵ، ماوەیەك لە زیندانی (ئۆپن فیلّ) بەند کرابوون،*

*پاش دەستگیرکردنی فامپیل، پۆلیس رایگەیاند بە پێی زانیاری ورد هەستاوون بە گرتنی و دڵنیان ئەو کەسە لەو شەڕە تەقەیەدا بەشداری کردووە،*

سەرنجی ئەوەبدەن ئەگەر رێکخەری هەواڵ بیەوێت زانیارییە نا پێویستەکان لابدات، یەکسەر هەڵدەستێ بە لادانی دوابڕگەی راپۆرتەکە، چونکە ئەوە کەم بایەخترین بەشی هەواڵەکەیە، نووسەران بەشە گرنگەکانی بابەتەکەیان لە سەرەتاو ناوەڕاستی هەواڵەکەی دادەنێن، دوابەشی هەواڵەکەش بە شێوەیەك دادەڕێژن تاکو گەر پێویستی کرد هەڵی گرن،

ئەم راپۆرتەی لە خوارەوە دێت باس لە ساڵڕۆژی زەماوەندێکە، پێکهاتەکەی لەوەی دی دەچێت:

نموونەی (٢):

*ژن و مێردێکی بەساڵاچوو کە لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا لە رستۆرانێکی ئاکسفۆرد شایر یەکتریان ناسی، بڕیاریانداوە ئەم هەفتەیە جەژنی شەستەمین ساڵی زەماوەندەکەیان بگێڕن،*

*ئالفرید و راشیل مودلیپ ساڵی ١٩٤٣ کاتێك هەردووکیان سەربازبوون و بۆ نیشتمان تێدەکۆشان لە ریستۆرانتی (گای سوری ویستۆن ئین دوود) یەکتریان ناسی، ئەم ریستۆرانە ئەو کاتە شوێنی حەوانەوەی ئەو سەربازە لاوانە بوو کە لەو ناوچەیە خزمەتیان دەکرد،ئالفرید راشیلی ئەو کاتە بینی هاتە ژوورەوە تاکو داوای پەرداخێك ئاو بکات، ئالفریدی لاو ئەو کاتە خوێندکاری دەریاوانی بوو لەو بارەوە دەڵێ:" منیش خەریکی ئاو خواردنەوە بووم، بۆ من شتێکی سەیر بوو کەسێك هاو سەلیقەمە،بیرم لەوە کردەوە سڵاوی لێبکەم، بە جلە سەربازییەوە راشڵم زۆر جوان هاتە پێش چاو"،*

*ئەو دووانە لە ساڵی ١٩٤٦ زەماوەندیان کردو لەشاری موتلی کە ئالفرید ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانییەکەیەتی سەقامگیر بوون، ساڵی ١٩٦١ لە گەڵ هەرسێ منداڵەکەیدا گواستیانەوە بۆ شاری کاتسۆل،*

*یەکشەمەی ئاینده ئالفریدو راشیل لە کلێسای شاری کاتسیل ئەو یادە دەکەنە جەژنو جارێکی تر پەیمان بۆ یەکتر نوێ دەکەنەوە، پاش ئەو مەراسیمە لە گەڵ خزمو کەسو کاری هەردوولا دەچن بۆ ریستۆرانتی "گای سور" کە دەکەوێتە دوری سی میل لە کلێسەکەوە تاکو هەمووان پێکەوە ئەو یادە بە خواردنو خواردنەوە بکەنە جەژن،*

هەردوو راپۆرتەکە لە دیدێکی مرۆییەوە، واتە بەرجەستەکردنی رەگەزی "چ کەسێك" دارێژراوون، هەردوو راپۆرتەکە بە دەستەواژەی "*سەردەستەی دزو جەردەکان*" و "*ژن ومێردێکی بەساڵاچوو*" دەست پێدەکەن، لە بەر ئەوەی رووداوەکە پەیوەندی هەیە بە کەسانی تایبەتەوە، باشتر وایە هەواڵەکانیش بەوان دەست پێبکات،

## بەرەو پێشبردنی راپۆرت

وەك چۆن چیرۆك نووسێك بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازی حیکایەتخوانەکانی جاران بەسەرهاتی چیرۆکەکەی دەباتە پێشەوە، پەیامنێریش چیرۆکە راستەقینەکەی خۆی بە خستنەڕووی یەك لە دوای یەکی رووداوەکان دادەرێژێ، لە چیرۆکێکی خەیاڵیدا پاڵەوانەکە لە گەڵ رەگەزێکدا رووبەڕوو دەبێتەوە کە ناراستەکان دەگۆڕێ، پاشان کێشەیەك سەرهەڵدەداو پاڵەوانەکە بەدوای چارەسەردا دەگەرێتو ئەنجا دۆخەکە ئاسایی دەبێتەوەو چیرۆکەکە کۆتایی دێت، پێچەوانەی چیرۆکنووس،

پەیامنێر ناتوانێت خۆی بەسەرهاتی رووداوەکان بخولقێنێت، بەڵکو دەبێت بە شێوەیەك بیانخاتە روو بۆ خوێنەر ماناداروو جێگەی بڕوا بێت،

گریمان دەتەوێت راپۆرتێك سەبارەت بە کەوتنەوەی ئاگرێکی گەورە ئامادەکەیت، هەندێك وتەی سەرۆکی ئاگر کوژێنەوەو فەرماندەی پۆلیست لایە، هەرچەندە وتەی هەردووکیان سەبارەت بە یەك بابەتە، بەڵام وتەی کامیان لە سەرەتای راپۆرتەکەت دادەنێیت؟

ئەمە وتەکانی فەرماندەی پۆلیسە:

نموونەی١: *لە ماوەی سێ مانگادا ئەمە سێیەمین جارە ئاگرێکی وا گەورە دەکەوێتەوە، پێناچێ هەرهەموویان بە ئەنقەست روویاندا بێت، بەڵام ئێمە پێمانوایە ئەمجارەش پەیوەندی بە دوو جارەکەی ترەوە هەیە، چونکە لە پشتی بیناکە دەبەیەکی بەنزین و چەند پارچە پەڕۆیەك دۆزراوەتەوە، ئێمە بەنیازین لە گەڵ خاوەنی ئەو پیکابە سەوزەی کە پێش ئاگر کەوتنەوەکە لێرە بینراوە قسە بکەین،*

قسەکانی سەرۆکی ئاگر کوژێنەوە بەم جۆرەیە:

نموونەی٢: *ئێستا ئێمە لە ناو بیناکەدا خەریکی پشکنینین، تاکو بەڵگەی تر بدۆزینەوە، بەڵام دەبێت بڵێین لە پشتی بیناکەدا دەبەیەکی سووتاوی بەنزین و چەند پارچە پەڕۆیەکمان دۆزیوەتەوەو ئەوە دەردەخەن ئاگرەکە بە ئەنقەست کراوەتەوە و کەسێك بەنزینی کردوە تەسەر پەرۆکان و نیازی ئەو ئاگرەی هەبووە، ئەو ئەگەرەش هەیە ئاگرەکە لە چەند شوێنێکی جیاجیا کرابێتەوە، هەربۆیە ئێمە بەردەوامین لە لێکۆڵینەوە،*

لە سەرەتادا ئەو بابەتانەی لە هەردوو وتەکەدا هەن و بەهای هەواڵیان تێدایە بژمێرین،

قسەکانی فەرماندەی پۆلیس:

بە پێی بەڵگەکان ئاگرەکە گەورەیە.

مەبەستی لە پشتەوە نییە.

پەیوەستە با ئاگرکەوتنەوەکانی پێشترەوە.

پۆلیس بەدوای پیکابێکەوەیە.

وتەکانی سەرۆکی ئاگرکوژێنەوە:

لە بیناکەدا پشکنینو گەڕان بەردەوامە.

هەندێ بەڵگە لە بەردەستایە.

ئەگەری ئەوە هەیە ئاگرەکە لە چەند لایەکەوە کرابێتەوە.

لە بیرت نەچێت کەوتنەوەی ئاگرێکی گەورە تاوانێکی جەزائیەو ئەمەش واتە ئەفسەرێکی پۆلیس بەرپرسی لێکۆڵینەوەکەیە، ئەگەر ئاگر کەوتنەوەکە بە رێکەوت یان بە ئەنقەست نەبێت، ئەنجا سەرۆکی ئاگرکوژێنەوە دەبێتە بەرپرسی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی هۆکارەکان.

ئێستا دەتوانیت دەست بکەیتە نووسینی راپۆرتەکەت:

*ئەمە سێیەمین جارە لە ماوەی چەند مانگێکدا، ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورە بینایەکی بازرگانی بە تەواوەتی دەسووتێنێت، پۆلیس ئەگەری ئەوەی رەتنەکردووەتەوە ئاگرەکە بە ئەنقەست کەوتبێتەوە. بەرپرسانی ئاگر کوژێنەوە سەرقاڵی گەڕانن لە ناو بیناکە بۆ دۆزینەوەی بەڵگەی زیاتر، لە هەمانکاتدا پۆلیس بەدوای پیکابێکی سەوزدایە کە پێش کەوتنەوەی ئاگرەکە لە شوێنەکەدا بینراوە.*

*ئەگەرچی دەبەیەکی بەنزینو چەند پەڕۆیەك لە پشتی بینا سووتاوەکەدا دۆزراونەتەوە، سەرۆکی ئاگرکوژێنەوەکان پێیوایە ئاگرەکە لە چەند جێگەیەکەوە کرابێتەوە.*

*پۆلیس هێشتا نەیتوانیوە مەبەستی راستەقینەی ئەم کارە تێکدەرانەیە*

*بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو دەبە بەنزین‌و پارچە پەڕۆیانەی لە پشتی بیناکەدا دۆزراونەتەوە، ئەو باوەڕە پتەو دەکەن ئەم ئاگر کەوتنەوەیە پەیوەندی بەو دووانەی ترەوە هەبێت.*

لەم بابەتەدا کەڵکت لە وتەی هەردوو کەسەکە وەرگرتووە، بەڵام دەبێت بابەتەکان بە پێی گرنگییان ڕێکبخەیت، دوو جار باسی دەبەی بەنزین‌و پەڕۆکانت کردووە، دەبێت یەکێکیان لابرێت، بەکارهێنانی وشەی "ئەگەرچی" لە سەرەتای برگەی دووهەم کاریگەرییەکەی کەمدەکاتەوە. بۆیە ئەو رستەیەش لادە. پەرەگرافی دووەم بە وتەکانی فەرماندەی پۆلیس‌و پەرەگرافی سێیەم بە وتەی سەرۆکی ئاگرکوژێنەوەکان دەستپێبکە، وردەکارییەکان‌و پێشەکییەکەش بۆ هەواڵەکە زیادبکە، هەندێ زانیاری وەك کاتی کەوتنەوەی ئاگرەکەو خاوەن‌و کرێچییەکانی بیناکەو ئەو کاڵایانەی لەوێ درووست دەکران یان هەڵدەگیران، ئەو مەترسییانەی لە بەرهەم هێنانی کاڵا دەکەوێت بخەرە روو، هەواڵەکە بە شێوەیەك ڕێکبخە هەموو ئەو وردەکاریانەی تێدا بێت‌و پاشان گرێیبدەرەوە بە ئەو دوو ئاگرەکەوتنەوەی پێشتر روویانداوە.

## پەرەگرافی یەکەم:

*لە کاتێکدا کۆمەڵگایەکی بازرگانی لە ولینگفۆرد پارك ئیست بەتەواوی ئاگری تێبەربوو، پۆلیس ئەگەری ئەوەی رەتنەکردۆتەوە بە ئەنقەست ئەو ئاگرە کەوتبێتەوە، ئەمە سێیەمین ئاگرکەوتنەوەی ترسناکە لە ماوەی چەند مانگێکدا لە شوێنێکی بازرگانی شاری ولینگفۆرد دەکەوێتەوە. خاوەنی بیناکە ( لندفال ئیستیتس) ەو لە لایەن کارگەی پلاستیکی (ماکیفرز) ەوە*

بەکرێگیراوە، ئاگرەکە لە سەعات نۆی شەو کەوتووەتەوەو بیناکە بەتەواوەتی وێران بووە، وتەبێژی کارگەکە وتی لەوە " سەری سوڕدەمێنێ" بۆ ماکیفرز بووەتە ئامانجی خرابکاران؟

## پەرەگرافی دووەم:

لە کاتێکدا بەرپرسانی ئاگرکوژێنەوە لە بینا وێرانەکەدا بەدوای زانیاری و بەڵگەی نوێدا دەگەڕێن، پۆلیس بە نیازە وتەی شۆفێری ئەو پیکابە سەوزە وەربگرێت کە پێش ڕووداوەکە لەوناوچەیە بینراوە، ئەفسەری پۆلیس" رالند ماتاری" بە پەیامنێرەکەمانی وت: " پێناچێت مەبەستێکی تایبەت لە پشت کەوتنەوەی ئەم ئاگرەوە هەبێت، بەڵام پێمانوایە بە هۆی دۆزینەوەی ئەو دەبە بەنزین و پەڕۆیەی لە شوێنی ڕووداوەکەدا دۆزراونەتەوە، ئەم ئاگر کەوتنەوەیە پەیوەندی هەیە بەو دوو ڕووداوەی پێشووەوە"

## پەرەگرافی سێیەم:

سەرۆکی یەکەی ئاگرکوژێنەوەی "ولینگفۆرد" کیم لاپلە، سەرقاڵی ڕێکخستنی پرۆسەی پشکنینە بەدوای بەڵگەی زیاتر سەبارەت بە ئاگرکەوتنەوەکە، ئەو پێیوایە ئاگرەکە لە چەند شوێنێکەوە کرابێتەوە، خاتو لاپلە لە گفتوگۆیەکدا لە گەڵ پەیامنێرەکەمان جەختی لەسەر ئەوە کردەوە بەهۆی ئەم ئاگرکەوتنەوەیەوە هیچ گازێکی ژەهراوی بڵاو نەبووەتەوە.

## پەرەگرافی چوارەم:

*کارگەی پلاستیکی ماکیفرز دروستکەری لولەو ئاوەڕۆی پلاستیکیەو لە ساڵی١٩٩٢ دەستی بە بەرهەمهێنان کردووە، ئەم کارگەیە ١٢٠ کرێکاری هەیەو زۆربەیان بە شێوەی فول تایم کاردەکەن. وتەبێژی کارگەکە رایگەیاند کارگەکەیان سیستەمی ئینزارو ئاگرکوژێنەوەی تێدایەو بەم نزیکانە لە لایەن فەرمانبەرانی ئاگرکوژێنەوە فەحس کراوە، بەڵام کامێرای ئاسایشمان نییە.*

## پەرەگرافی پێنجەم:

*ئەو دوو ئاگرکەوتنەوەیەی پێشوو لە دەرەوەی ولینگفورد لە مانگی حوزەیران و تەمووزدا روویاندا، بوونە هۆی لە دەستدانی ٥٠٠ هەلی کارکردن و زیانی پێنج ملیۆن پاوەندیشیان لە هەردووکۆمپانیای "ئارندلز" و"تردارز" دا.*

ئێستا با بزانین پێکهاتەی ئەم راپۆرتە پەسەندە؟

## پەرەگرافی یەکەم:

ئەم پەرەگرافە بە هەندێك واژە دەستی پێکردووە کە ئەوە دەردەخەن مەسەلەکە گرنگە، (*بەتەواوی وێران بوو، پۆلیس ئەگەری ئەوەی رەتنەکردووەتەوە کە بە ئەنقەست ئەو ئاگرە کەوتبێتەوە*)، یەکەم زانیاریی لە سەر خاوەن و کرێچی بیناکە لەم پەرەگرافەدا هاتووە، دەبێت پەرەگرافی

یەکەم کورتەیەکی هەموو ڕووداوەکەی تێدا بێت، هەرچەندە دەتوانرێت لە یەکەم پەرەگرافدا هەموو وتەکانی بەرپرسەکان دابنرێت. بەڵام دووایین ڕستەی ئەم پەرەگرافە زۆر مایەی پەسەند نییە، ( *وتە بێژی کارگەکە)* بەتایبەت لە پەرەگرافی چوارەمدا باس لە مکیفرز کراوەو هەندێك لە وتەکانی وتەبێژی کارگەکەش خراونەتەڕوو، ئەو ڕستەیە هەبلگرەو لەو جێگەیە دایبنێ کە لە پەرەگرافی چوارەمدا باستکردووە، بەم شێوەیە ڕستەی کۆتایی لە پەرەگرافی یەکەم *(بە تەواوی وێران بوو)* لە گەڵ دەستەواژەی *(لە بینا وێرانەکەدا)* کە لە سەرەتای پەرەگرافی دووەمدا هاتووە زیاتر دەگونجێت، لەو ڕستەیەی باسمان کرد وشەی *( سەری سوڕ دەمێنێ)* وتەیەکی ناتەواوەو دراوتە پاڵ وتەبێژێکی نەناسراوەوە تاکو مانای زیانەکانی ئاگرکەوتنەوەکە بگەیەنرێتە خوێنەر. تا پێتدەکرێت خۆت لە گواستنەوەو وتەی ناتەواو دووربگرە، چونکە دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی خوێنەر.

## پەرەگرافی دووەم:

دەبێت درێژەی ڕووداوەکە لەپەرەگرافی دووەمدا بەردەوام بێت، بە پێدانی زانیاری زیاتری وەك: *(گەڕان بەدوای بەڵگەی زیاتر لە لایەن پۆلیس و ئاگرکوژێنەوە)* لیدی هەواڵەکە ڕوونتر دەبێتەوە. وتەکانی ئەفسەری پۆلیس بابەتەکە زیاتر دەکاتەوە، لەو وتانەدا ئەوە هەیە زانیاری لە سەر ئاگرکەوتنەوەکانی پێشوو کەمتر دراوە، لە ئەنجامدا خوێنەر خۆی گریمانەی ئەوە دادەنێت لە ئاگرکەوتنەوەکانی ڕابردوودا دەبەی بەنزین و پەڕۆ هەبووبێت، ئەمەش بەو مانایە دێت ئەو کەسەی ئاگرەکانی کردووەتەوە بە ئەنقەست ئەو بەڵگانەی بەجێهێشتووە، هیچ کات گریمانە بۆ خوێنەر

بەجێمەهێڵەو بەشەفافی و بە ئاشکرا بنووسە. ئەگەر کابرای تاوانبار بەڵگەیەکی بە جێهێشتبێت، دەستپێکێکی باشە بۆ بەدواداچوونی رووداوەکە، دەبێت پلەو پایەی ئەو کەسەی چاوپێکەتنی لە گەڵدا دەکەیت بە روونی باسبکەیت، لە قسەکانی فەرمانددەی پۆلیسەکاندا وادیارە بەرپرسان بە شێوەیەکی جیدی بە دوای مەسەلەی هۆکارەکانی ئەم ئاگر کەوتنەوەیەدا دەگەڕێن، لە بەرئەوەی وتنەوەی پلەو پایەی بەرپرسان بۆ چەند جارێك کارێکی دژوارە، بۆیە دەکرێت لە جارەکانی تردا ناوەکانیان بنووسیت.

## پەرەگرافی سێیەم:

دەستپێکردنی رستەکە بە دەستەواژەی *( سەرۆکی فەرمانگەی ئاگرکوژێنەوەی ولینگفۆرد)* سنووری ئەو ناوچەیەی کاری تێدا دەکات دەخاتەڕوو، ئەوەش بۆ رۆژنامەیەکی لۆکاڵی جێگەی گرنگی پێدانی زۆرە، خوێنەران دەیانەوێت لەوە دڵنیابن فەرمانگە خزمەتگوزارییەکانی شارەکەیان دەتوانن لە کاتی رووداوێکی لەو جۆرە، بەسەر کێشەکاندا زاڵبن، ئەگەر نەتوانن ئەوا بابەتێکی باشت دەستکەوتووە بۆ راپۆرتێکی نوێ. لێرەشدا وەك پەرەگرافی یەکەم جەخت لەسەر وتەکانی سەرۆکی ئاگرکوژێنەوە دەکرێتەوە، کەواتە بابەتەکە بە کەلکوەرگرتن لە زەمەنی ئێستا ئامادەکراوە "ئاگرەکە کوژاوەتەوەو کارمەندان سەرقاڵی پشکنینی بینا وێرانەکەن" تاکو چاپکردنی راپۆرتی پاشتر، رووداوەکە بەم جۆرە بەردەوام دەبێت، بۆیە نابێت لە پەرەگرافەکانی دواییدا باس لە پێشکەوتنی زیاتر بکرێت.

# پەرەگرافی چوارەم:

لەم بەشەدا باس لە پێشینەی ڕووداوەکەو ئەو زیانە مادیو مرۆیانەی لە ئاگرەکە کەوتووەتەوە دەکرێت. سەرنجی چۆنێتی باسکردنی هێڵی بەرهەمهێنانی کارگەکەبدە، دەبینی لە سەر بنەمای زەمەنی ئێستا باسکراوە، ئەم کارگەیە چیتر توانای بەرهەمهێنانی لولەو بۆری ناوەڕۆی نییە، کەواتە ئیشارەتکردن بۆ زەمەنی ئێستا ئەوە دەردەخات تا پێش ڕووداوەکە ئەم کارگەیە ئەو بەرهەمانەی دەخستە بازاڕەوە، تەنانەت باس لەوەش کراوە بە هۆی ئەم ڕووداوەوە ١٢٠ کەس کارەکانیان لە دەستداوە. لە کاتی چاپکردنی ئەم ڕاپۆرتەدا ئەوە بە ئاشکرا ڕووننەکراوەتەوە ئایا هەر ١٢٠ کەسەکە کارەکانیان لەدەستدەدەن یان نا؟ لەوانەیە کارگەکە ئەم کرێکارانە لە جێگەیەکی تردا دابمەزرێنێت. وتەبێژی کارگەکەش زانیارییەکی کەم لەمبارەوە دەخاتەڕوو و تەنانەت نایەوێت ناوەکەشی باس بکرێت. کەواتە سەبارەت بە چارەنووسی هێزی کار زانیاری ورد لەبەردەستدا نییە. دەبوایە ئەو خاڵەش بخرایەتەڕوو لەکاتی ئاگر کەوتنەوەکەدا کەس لە کارگەکە هەبووە یان نا؟

لە کاتی نووسینی هەواڵدا ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەرچاو بگرە:

هیچ کاتێك هەواڵەکان بە چاوپێکەوتنو وتەی خەڵك دەستپێنەکەی: *"دەمەوێت دەست لە کاربکێشمەوە"، سەرۆکی ئەنجومەن ڕایگەیاند،* نووسەران زۆر بەدەگمەن بابەتەکانیان بەو شێوەیە دەستپێدەکەن، چونکە ئەم ستایلە هیچ کاریگەرییەکی نییە، بەتایبەت ئەگەر کەسەکە نەناسراو بێت.

رستەکانت بە ژمارە دەست پێمەکە، تەنها لەوکاتەدا نەبێ کە بتەوێ مەبەستێکی دیاریکراو بگەیەنی، *"لەوانەیە دووسەدو پەنجا کرێکار کارەکانیان لەدەستبدەن"*

هەواڵەکانت بە پرسیارکردن دەستپێمەکە: *"ئایا پاش پێنج ساڵی تر ئێوە سەردانی بانکەکەی خۆتان دەکەن؟ "*

باشتروایە بنووسیت: *"تا چەند ساڵی تر بانکە ئەلکترۆنییەکان دەبنە مەترسی بۆ سەر بانکە تەقلیدییەکان"*

خستنەڕووی مەسەلە سەرەکییەکە دوامەخە.

راستەوخۆ بچۆرە ناو مەبەستە سەرەکییەکانەوە. باسکردنی رووداوەکان بە ناراستەوخۆیی بۆ وتاری درێژ هاتوە: *"بەیانی زوو ئەوکاتەی خەڵك مراجعەی بانك دەکەن"*

# ٦

# ڕۆژنامەنووسی ئازاد

ئەو بۆچونەی کە پێیوایە *"پێویستە ڕۆژنامەنووسی ئازاد ئەزموونی کارکردنی لە ڕۆژنامەدا هەبێت"*، شتێکی ڕاست نییە، هەندێك ڕۆژنامەنووسی ئازادی سەرکەوتوو هەن هەرگیز لە هیچ خوێندنگەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا نەیانخوێندووە، توانای خێرا نووسینو وێنەگریو بڕوانامە یاسایی، مەرجێکی سەرەکی نییە، نووسەرێکی ئازاد تەنها پێویستی بە فەرهەنگێكو دەفتەرێکی تەلەفۆن هەیە.

بە درێژایی دەیەکانی ١٩٨٠و١٩٩٠ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ژمارەی کارمەند هەمیشەییەکانی خۆیان تا ڕێژەیەکی بەرچاو کەمکردەوە، سەیر لەوەدایە ئەو کەمکردنەوەی کارمەندانە هاوکات بوو لە گەڵ زۆربوونی ئەو پاشکۆ هەفتەیانەی لە گەڵ بڵاوکراوەکاندا چاپ دەکران، جگە لەوەش ژمارەی گۆڤارە نوێیەکان بە شێوەیەکی بێوێنە زیادی کردبوو.

دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش بەر ئەم کەمکردنەوەیە کەوتن، بەڵام بە هۆی لافاوی ئەو هەواڵو بابەتانەوە لەلایەن نووسەرە ئازادو خۆبەخشەکانەوە بە خۆڕایی بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەنێردرا، ئەو کەمکردنانەوە کاریگەری لە سەر ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەجێنەهێشت، لەوانەیە ئەمە تارادەیەکی زۆر مایەی سەر سوڕمان نەبێت، چونکە ئەو گۆڕانانە لەکاتێکدا بوو خەڵکێکی زۆر کۆمپیوتەری تایبەت بەخۆیان کڕیبوو. دەکرێت پەرەسەندنی هۆکارەکانی یارمەتیدانی نووسینو

فراوانبـوونی خواسـت لـه سـەر بڵاوكراوەكـان لـەم سـەردەمە، بـە ناوچـەیەك بـشوبهێنین ئـاڵتوونی تێدا بێـتو رۆژنامـە نووسـەكان پـەلاماری بـدەن، زۆر لەوانە ئەو كەسانە بوون هەرگیز لە رۆژنامەیەكدا كاریـان نـەكردبوو، بـەڵام دەبێـت دڵنیـا بیـت لـەوەی دەتـوانی بابـەتێك ئامادەبكـەی ببێتـە جێگـەی سـەرنجی رۆژنامـەكان، هەڵبـەت دەبێـت ئـەو راسـتییە بڵـێین، زۆرێـك لـە رەخنـەگران پێیانوایـە لـەم قۆناغـەدا هەواڵە نـەرمو بێبایەخـەكان، جێگـەی هەواڵـە زبرەكانیـان گرتبـووەوە، بـە گـۆڕانی خاوەنـدارێتیو گرتنەبـەری سیاسەتی نوێ، بابەتی رۆژنامەو گۆڤارەكان كەمە كەمە لەجیاتی بابەتەكانی وەك شەڕو برسێتی بوون بە بابەتی سادەی ژیانی رۆژانە، بۆ نموونە باس لـە باخو بێستانی دەوڵەمەندو ئەشرافەكان دەكرا، یان بابەتێك لە سەر گـۆڕینی عەمباری ژێر زەمینەكان بۆ ژووری خوێندنەوە! ئەوانە چەند نموونەیـەكی زەقـی ئـەو بابەتانـەن لـە سـاڵانی ١٩٨٠ بـە شـێوەیەكی رێكوپێـك لـە بڵاوكراوەكانـدا چـاپدەكران، رەخنـەی شـانۆو سـینەماو ریـستۆرانتەكانو تەنانەت سەفەرنامەكانیش ببوونە خۆراكێكی باش بۆ پەیامنێرانی ئازاد، لـە كاتێكدا نووسەری رۆژنامەكان زۆرترین كـاتی خۆیـان لـە ژووری نووسـەراندا بەسـەر دەبـرد، كەچـی رۆژنامەنووسـی ئـازاد دەیتـوانی سـەربكات بـە هەرشوێنێكدا خۆی مەبەستی بێتو باسیش لە هـەر بابەتێك بكات كە بە دڵـی خـۆی بێـت. چـیرۆكی رووداوەكـان لەهـەموو رۆژنامـە لۆكـاڵیو سەرتاسـەرییەكاندا لایـەنگری زۆریـان هەیـە، بـەو حاڵەشـەوە نابێـت پـەیام وەرگرە جیهانیەكانیش لە بەرچاو نەگرین.

## دەبێت لە کوێوە دەست پێبکەین؟

باشـترین جێگـە بـۆ دەسـپێکردنی کـاری پـەیامنێری ئـازاد ڕۆژنامـە لۆکاڵییەکانە، لـەم ڕێگـەوە کەسـەکە دەتوانێـت هـەم ئـەزموون پەیـدا بکـاتو هەمیش باوەڕ بەخۆبوونی لا درووسـت ببێـت. یـەکێك لـە پێداویـستییەکانی کارکردن لە هەربڵاوکراوەیەکدا ئەوەیە پەیام وەرگرەکانت بە باشی بناسیت، بـۆ نموونـە ئامـادەکرنی ڕاپۆرتێـك لـە سـەر داربـڕە کەنەداییـەکان بـا زۆر بەباشیش نووسرابێت، بەڵام بۆ گۆڤارێك تایبـەت بێـت بـە ژنـان زۆر گـرنگ نییـە. ئـەو هەڵەیـەی زۆربـەی نووسـەرە تازەکارەکـان دەیکـەن، ئەوەیـە بـۆ خـستنەڕووی بابەتـەکانیان بڵاوکراوەیـەکی گونجـاو نادۆزنـەوە، ئـەو هەڵەیـە تەنها لە سنووری بابەتەکەدا ناوەستێت، بـەڵکو سـتایلی داڕشـتنەکەش ڕۆڵـی گرنگـی خـۆی هەیـە بـۆ قبـوڵکردنی بابەتەکـە لـە لایـەن بڵاوکراوەکانـەوە. گۆڤارەکانیش وەك ڕۆژنامەکان شێوەی داڕشتنێکی تایبەت بـە خۆیـان هەیـە. دەبێت نووسەر ئەو ستایلە بناسێتەوەو پەیڕەوی لێبکاتو ئەو کارە نەخاتـە ئەستۆی ئەوەی لە ڕۆژنامەکەدا ئەرکی پێداچوونەوەی لـە ئەسـتۆیە. کاتێـك لێکۆڵینـەوە لـە سـەر بڵاوکراوەیـەك دەکـەیت پێویـستە ئاگـات لـە شـێوازی داڕشـتنەکەی بێـت بـۆ ئـەوەی بزانـی ئایـا ئـەو زمانـەی لـەو بڵاوکـراوەدا بـەکاهاتووە زمـانێکی ناسـكو خـودان ڕسـتەی درێـژو وەسـفییەو سـتایلی داڕشتنەکەشی نوێو وردو ڕاشکاوە.

ئەوەشـت لـە بەرچـاو بێـت بابەتـەکانی ئـەو بڵاوکراوەیـە لـە چ ڕوانگەیەکـەوە تەماشـا دەکـرێنو ئـەو هۆکارانـە چـین دەبنـە هـۆی ئـەوەی بابـەتێك لـە لایـەن بڵاوکراوەکـەوە پەسـەند بکرێـت؟ بـۆ نموونـە لەوانەیـە

هەندێك زانیاریت سەبارەت بە تیپێکی مۆسیقا هەبێت کە توانیویەتی لە شارەکەی خۆیدا ناوبانگ بەدەست بهێنێت. ئامادەکردنی بابەتێك لەسەر ئەو تیپە تەنها لەو کاتەدا سەرنج راکێش دەبێت لە روانگەیەکی نوێو تایبەتەوە لێکۆڵینەوەت کردبێت، گەر وانەبوو باشتر وایە بابەتەکە لە بیر بکەیت. باسکردنی ئەوەی تیپێکی موسیقی توانیوێتی پلەکانی سەرکەوتن ببڕێت، مانای ئەوە نییە هەواڵێکی سەرکەوتووت ئامادەکردووە.

## سەفەرنامە:

سەفەری دورودرێژو لە سەرحسابی رۆژنامەو تەنها بۆ نووسینی سەفەرنامە، بووەتە خەونو خەیاڵ، لەراستیدا بۆ نووسینی سەفەرنامە پێویست ناکات لە جێگەکەی خۆت زۆر دووركەویتەوە، گەشتیارە تازەکان تینووی بینینی جێگەی نوێو نەدۆزراوەن، بۆیە دەتوانیت لەو هەلە کەڵك وەربگریتو دەسبکەیت بە ریکلام بۆ گۆشەیەکی نەناسراوی ئەو دنیایەی کە گەنجێکی زۆر بە نرخی لە ناخی خۆیدا حەشارداوە.

ئەگەر سەبارەت بە "*دیسنی لند*"ی پاریس بنووسیت، بێگومانبە لەوەی سەرنووسەرەکە باوێشکێك دەداتو بابەتەکەت فرێدەداتە ناو بابەتە بێکەڵكو بێناوەڕۆکەکانی ترەوە. راستە ( *دینی لند*) تا بڵێیت جوانو دڵرفێنەو خەڵك حەزیان لێیەتی، بەڵام ئەو بابەتە هێندەی لە سەر نووسراوە تڵپی تەری تیا نەماوە. لە جیاتی ئەوە دەتوانی لە سەر گوندێك بنووسیت کە دەکەوێتە دووریی چەند کیلۆمەترێك لە ( دیسنی لیند) و جوانیو ئارامیو پێشینە مێژوویەکەی ئەوە دەهێنێت خوێنەری پێوە سەرقاڵ بکەیت. ئێستا دەکرێت بڵێیت بابەتێکی پڕبایەخت دۆزیوەتەوە،

ئەوە بەنـدە بـەوەی کـە ئـەو گۆڤـارەی بابەتەکـەتی تێـدا بڵاودەکەیتـەوە هەفتانەیە یان مانگانە یان وەرزییە، کەواتە هەفتەیـەك تـا چـەند مانگێکت لـە بەردەسـتدایە بـۆ ئامـادەکردنی بابەتەکـەت. باشـتر وایـە تـۆ بەرنامـەی کارەکـەت پـێش چـەند مانگێـك ئامـادە کردبێـت، ئـەوەش هـەمان کـارە کـە دەستەی نووسەرانی گۆڤارێك پێیهەڵدەسـتن. ئەگـەر بـەنیازیت سـەبارەت بـە کڕین‌و گەشت‌و گوزار لە پشووی جەژندا بابەتێك بنووسیت، دەبێت پێش ١٢ مانگ دەسـتت کردبێـت بـە کۆکردنـەوەی زانیـاریی، ناتوانیـت چـەند ڕۆژێـك پـێش جـەژن زانیـاریی پێویـست کۆبکەیتـەوەو بابەتەکـەت بنووسـیت‌و چاوەڕێی ئەوەش بیت پێش جەژنی هەمان ساڵیش چاپ بکرێت، چونکە بۆ ئەو ژمارە تایبەتەی جەژن لە چەند مانگی ڕابردوودا ئامادەباشی کـراوە، لـە ڕاسـتیدا بـۆ هـەر بابـەتێکی وەرزیـی پێویـستە سـاڵێك پێـشتر خـۆت ئامـادە کردبێت.

نـاوەڕۆکی گۆڤـارە مانگانـەو وەرزییـەکان پەیوەنـدییان بـە وەرزەکانـەوە هەیە، مومکین نییە بابەتێکیان تێدا بدۆزیتـەوە بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان نەبەستراببێتە فەسـڵێکەوە، ئەگـەر دەتـەوێت ئـەو بابەتـەی لـە سـەر خـولێکی وەرزشی وەرزیـی نووسـیوتە کاریگـەریی هـەبێت، دەبێـت لـە هـەمان وەرزدا بڵاوبێتەوە. بەڵام دەکرێت پێش خولەکە بابەتێك لەسەر وەرزشکارێك‌و ئـەو مەشقانەی بۆ خۆ ئامادەکردن دەیکات، ئامادەبکەیت.

باشـترین شـێواز بـۆ درووسـتکردنی پەیوەنـدی لـە گـەڵ سەرنووسـەری گۆڤارێك ئەوەیە نامەیەکی بۆ بنووسیت‌و بە کـورتی نـاوەڕۆکی بابەتەکـەتی بۆ باسبکەیت:

*بـەڕێزخاتو سمـیس، ئایـا ئـەم بابەتـەی کـە لـە خـوارەوە بـە کـورتی دەیخەمەڕوو بۆ گۆڤـاری" ئەسـپەکان‌و ڕێگـەکان" دەگونجێـت سـەرمایەدارێکی*

ئەمریکایی بە ناوی (توم بریدل) بەمدواییانە گۆڕەپانێکی ئەسپسواریی لە سەر شێوازی (کاوبۆی) یییەکانی ئەمریکا لە (همپشایر) درووستکردووە، فێرخوازان دەتوانن لەم شوێنەدا فێری ئەسپسواریو لەوەڕاندنی پەز و وڵاخ و شوانییو گاوانیی ببن، بۆ ئەو مەبەستە توم ٢٥ دانە لە ئەسپەکانی خۆی لە (کولورادۆ)وە هێناوە بۆ همپشایرو لغاوو زین کراوون، ئەمە یەکەمین هەنگاوی لەو جۆرەیە لە بریتانیا. تۆم بە نیازە گەر سەرکەوتوو بوو جێگەیەکی دیکەش بۆ هەمان مەبەست بکاتەوە. لە بەر زۆری داخوازیی خەڵك تۆم ئەم هەنگاوەی ناوە. تۆم لە ساڵانی ١٩٨٠ لە ئەمریکا و کەنەدا بەوە ناوبانگی دەرکردووە دەتوانێت سواری ئەسپی رامنەکراوو سەرشێت بێتو پاشان وەك ئەکتەری بەدیل لە هۆلیود کاری کردووە. کاتێك سەرقاڵی وێنەگرتن بوون لە بریتانیا ئاشقی شاری همپشایر بووەو پاشان بڕیاریداوە مەزرایەك بکڕێت و بیکات بە شوێنی فێربوونی ئەسپسواریی، تۆم دەیەوێت جگە لە فێرکردنی خەڵك بۆ خوی لە کێبەرکێکانی سەرتاسەری وڵاتدا بەشداری بکات. من لەم بابەتەمدا بە شێوەیەکی ورد باسم لە هونەرەکانی پەروەردەکردنی ئەسپو شێوەی خزمەتکردنی و مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە ئەسپسوارییو نرخی تێچوونی فێربوونی ئەسپسواری، کردووە.

من نووسەرێکی سەربەخۆم، تاکو ئێستا چەندین بابەتی جیاجیام بۆ بڵاوکراوەکان نووسیوە، گەر پێتانباشە دەتوانم سلایدی ٣٥ میلی مەتریی نایاب لەگەڵ راپۆرتەکەمدا بنێرم.

لەگەڵ رێزی(جوهان دۆ)

پێویـسته کاتێـك نامەکـەت دەنووسـیت لـە گـەڵ سـیفەتی کەسـەکەدا ناوەکەشی بنووسیت، گەر نـەتزانی دەتوانیـت تەلـەفۆن بکـەیت بـۆ بارەگـای گۆڤارەکەو ناوەکان وەربگریـت. ئاگاداربـە نـاوی سـەر نووسـەر لەگۆڤارەکـەوە وەرنـــەگریت چـــونکە لەوانەیـــە لەوکاتـــەدا سەرنووســـەرەکە گۆڕابێـــت، بەبەردەوامی پاکەتی نامەو پول لەگـەڵ خۆتـدا هـەڵبگرەو ئاگـات لـەوە بێـت کۆپییـەکی بابەتەکـەت بنێریـت، ئەوکاتـەی خۆیـان داوای دەکـەن بینێـرە، ئەگـەر پـاش مانگێـك وەڵامـت بـۆ نەهاتـەوە بـە تەلـەفۆن داوای وەڵام بکـە، بڕیاردان پێویستی بەکاتی پێویست هەیە.

## نووسینی راپۆرت بۆ رۆژنامە:

ئـەو راپۆرتـەی لەسـەرەوە باسمـانکرد، دەکرێـت هـەم رەوانـەی رۆژنامـە لۆکاڵییـەکانی بکـەیتو هـەمیش بـۆ بڵاوکـراوە سەرتاسـەرییەکانی بنێریـت. ئەسپـــسواریی وەرزشـــێکی خۆشـــەو بـــە دڵنیاییـــەوە لـــە سەرتاســـەری وڵات خەڵکێکی زۆر حەزیان لە خوێندنەوەی ئەم بابەتە هەیە. لەوانەیە چیرۆکی (تۆم) بۆ خوێنەرانی دەرەوەی وڵاتیش جێگەی سـەرنج بێـت، چونکە پێـشتر لە وەرزشی گابازیدا بەشداری کردووەو تەنانەت لە هەندێك فیلمیـشدا رۆڵـی بینیوەو لەوانەشە خەڵك بیناسنەوە.

پـێش هەرشـتێك پێویـستە پـەیام وەرگـرو جـۆری سـتایلی رۆژنامەکـە هەڵسەنگێنیت. ناردنی بابەت بۆ رۆژنامەیەك کە پێشتر بابەتی لـەو جـۆرەی بڵاونەکردبێتەوە کارێکی بێهودەیە، هەروەها ناردنی ئەوبابەتە بـۆ سـەرۆکی بەشـی ژنـانی رۆژنامەکـە کـارێکی بێـسوودە، چونکە راپـۆرتێکی وەك ئـەم راپۆرتە بۆ بەشی بابەتـە تایبەتـەکان گونجـاوترە. کەواتـە پـێش هـەر شـتێك

بزانە کام بەشی رۆژنامەکە ئەو جۆرە بابەتانە بڵاودەکاتەوە. خاڵێکی دی ئەوەیە پێش ئەوەی بابەتەکەت بە چەند رۆژنامەیەك بفرۆشی، دەبێت ئاگاداریان بکەیتەوە کامیان پێشتر مافی بڵاوکردنەوەیان هەیە، پاش ئەوەی بابەتەکەت بە رۆژنامەیەك فرۆشت دەبێت بڵاوکراوەکانی تر لەو مەسەلەیە ئاگادار بکەیتەوە.

## پەیوەندی کردن بە رۆژنامەکەوە:

بێگومان سەرنووسەری رۆژنامەکان رۆژانە کۆمەڵێك بابەتیان لەو نووسەرانەوە پێدەگات کە دەیانەوێت تواناکانی خۆیان لەم بوارەدا پیشان بدەن، هەرچەندە هەندێك لەو بابەتانە باشن، بەڵام زۆربەیان سەرکەوتوو نین. هەندێك جار ناوەرۆکی بابەتەکە بۆ بڵاوکراوەکە گونجاو نییە، لەوەش بترازێ سەرنووسەر ئەو کاتەی نییە هەموو بابەتەکان بخوێنێتەوە، کەواتە کارەکە دەسپێرێتە سکرتێری رۆژنامەکەو ئەویش تا پێیبکرێت تەماشای بابەتەکان دەکات. هەندێك جار بابەتێك سەرنج رادەکێشێت‌و بە باش دەزانرێت، بەڵام ئەوە شێوەیەکی گونجاو نییە بۆفرۆشتنی بابەتێك.

بۆ فرۆشتنی بابەتێك بە رۆژنامەیەك تەلەفۆن بکە بۆ سەرۆکی ئەوبەشەی دەتەوێت. پێویستە کاتێکی گونجاو بۆ تەلەفۆنکردنەکەت هەڵبژێریت تاکو ئەو بتوانێت وەڵامت بداتەوە. بۆ ئەم کارە پێویستە بڕوات بە خۆت هەبێت‌و زانیاری تەواوت سەبارەت بە چۆنێتی کارکردنی رۆژنامەکە هەبێت. بە شێوەیەکی ئاسایی هەموو بەیانییەك سەرۆکی بەشەکان کۆبوونەوە دەکەن بۆ بەرنامەدانان بۆ ژمارەی داهاتوو. زۆرجار کۆبوونەوەکان پێشنیوەرۆ تەواو دەبن. کەواتە ئەگەری ئەوە هەیە هەواڵی

پێویــستیان بــۆ پڕکردنــەوەی لاپــەڕەکان نــەبێت. کەواتــە ئەگــەر پــێش کۆبوونەوەکەو پێش نانی نیوەڕۆ پەیوەندی بکەیت شانسی زیاترت هەیە بۆ وەرگرتنی بابەتەکەت. خاڵێکی دی کە دەبێت بیزانیت ئەوەیە سەرۆکی ئـەو بەشەی دەتەوێت بابەتەکەتی بۆ ڕەوانەبکەیت کێیـە؟ کەواتـە تەلـەفۆن بکـە بـۆ بەداڵـە یـان سـکرتێری ڕۆژنامەکـەو پرسـیاری ناوەکـەی بکـە،.پــێش پەیوەنـدی کـردن کورتەیـەکی ڕاپۆرتەکـەت بنووسـە بـۆ ئـەوەی لـە کـاتی قسەکردن سوودی لێوەربگریت.

لـەکاتی قـسەکردن لەگـەڵ سـەرۆکی بەشـەکە، بـە تایبـەت ئەگـەر پێـشتر ئاشنایەتیت لە گەڵیدا نەبووبێت، مەبەستەکەتی بە کورتیو بـە پـوختی بـۆ باس بکە، بۆ ئـەو مەبەسـتە کـەڵك لـەو کورتـە باسـەی نووسیوتە وەربگـرە، ســەرۆکی بەشــی ڕۆژنامــە ناودارەکــان بــە زۆری بــە گومانــەوە وەڵامــی تەلەفۆنەکان دەدەنەوە، وەك بڵێیت کەسێك دەیەوێت دەست درێـژیان بکاتـە سەر، بەگشتی بە گومانەوە وەڵامی ئەوانەی نەناسراون دەدەنەوە.

دڵتان لەو هەڵسوکەوتانەی ئەوان سارد نەبێتەوە، ئەگەر کاتێـك تەلـەفۆن بکـەیت ئـەوان کـاتی زیاتریـان هـەبێت، هەسـت بـەوە دەکـەن لـە کارەکەتـدا شـارەزاییت هەیـە، شـێوازی پەیوەنـدی کردنەکـەت دەبێتـە نیـشانەیەك بـۆ ئەوەی دەزانی چۆن هەڵسوکەوت لە گەڵ کارەکەی خۆتو ئەواندا بکەیت.

پــێش هــەر شـتێك دڵنیابــە لــەوەی ئــەو کەسـەی ئێـستا قـسەی لەگەڵـدا دەکــەیت هــەمان ئــەو کەســەیە تــۆ ویــستووتە، پاشــان خــۆت بناســێنە، بەدڵنیاییــەوە حــەز لــەوە ناکــەی پـاش وتووێـژێکی درێـژ بـۆت دەربکـەوێت ئەوەی قسەی لە گەڵدا دەکەیت بۆ خۆی تازەکارەو هاتووە تاکو فێر بێت.

پەیوەندییەکەت دەکرێت بەم شێوەی خوارەوە بێت:

ڕۆژنامەی (ئەلف) فەرمووو؟

بەیانیت باش، دەمەوویست بزانم سەرۆکی بەشی بابەتە تایبەتەکانی رۆژنامەکەتان کێیە؟

خاتوو (ب)ە.

*دەتوانم قسەی لە گەڵدا بکەم؟*

تەنانەت ئەگەر پێشتریش ناوەکەیت لە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکە بینیبێت، جارێکی دی پرسیاری ناوەکەی بکە. کارمەندانی رۆژنامەکان دەگۆڕێن و بە هەڵە قسەکردن لە گەڵ کەسێکدا بە زیان بۆ سەر تۆ دەگەڕێتەوە. رۆژنامەنووسی سەرکەوتوو ئەوەیە زانیارییەکانی راست بن.

بەڵێ فەرموون

ئێوە خاتوو (ب)ن؟

بەڵێ.

*سڵاو من ناوم (پ)ە، نووسەرێکی ئازادم، شتێکم لایە لەوانەیە بۆ ئێوە مایەی سەرنج راکێشان بێت، حەز دەکەن گوێ بگرن؟*

*ئەوە کاتێکی خراپە، چونکە ئەو پرسیارە ئەو ئەگەرە بۆ بەرامبەرەکەت جێدەهێڵێت پێشنیازەکەت رەتبکاتەوە، بەڵام لایەنە ئەدەبییەکەی وادەخوازێت ئەو پرسیارە بکەیت، ئەگەر سەرۆکی بەشەکە وەڵامی تەلەفۆنەکەی تۆی دایەوە بەو مانایە نییە، دەتوانی بابەتەکەت رەوانە بکەیت بۆی، ئەگەر لە وەڵامدا وتی کاتی بە دەستەوە نییە سوپاسی بکەو خواحافیزی لێبکە. ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بوو ئەوا بابەتەکەی خۆتی بۆ باسبکە.*

*تکایە بفەرموون*

*کەسێکی کەمئەندام بە ناوی (مایکرۆفۆنی مایکلدۆرف) پیاوێکە بەلەم درووستدەکات، بەم دوایانە بەلەمێکی درووستکردووە بە یەك سەوڵ*

*کاردەکات، ئەو بە نیازە بەو بەلەمەی و بەو تاکە سەوڵە هەموو درێژیی ڕووباری تایمز ببڕێت، تاکو ئێستا کەس ئەو کارەی نەکردووە، ئەم هەنگاوەی ئەو دەبێتە هۆی شکاندنی ژمارەیەکی پێوانەیی، پێموابوو ئەم بابەتە بۆ ڕۆژنامەکەی ئێوە شتێکی سەرنجڕاکێش بێت. ئێوە ڕاتان چییە؟*

*ئەم کورتە باسە ناوی کەسەکەو کارەکەی و تایبەتمەندییەکانی تێدایە، هەواڵەکەش بریتییە لەوەی کەسە باسکراوەکە کەمئەندامەو شەڕ لە گەڵ ئەو کەمئەندامییەی خۆی دەکات و ئەمەش بۆتە هۆی ناوبانگ بۆی. بابەتەکە بۆخۆی نوێیەو پێشتر باسنەکراوە، لەوانەیە ئەم کارە لەکتێبی ریکۆردەکاندا تۆمار بکرێت، (بەلام بۆ یەکەم جار لەم ڕۆژنامەیەدا چاپدەبێت)، پرسیارەکەی تۆش ئەو توانایە بۆ سەرۆکی بەشەکە فەراهەم دەکات بابەتەکە ڕەتبکاتەوە. ئەو شێوەی هەڵسوکەوتە ئەوە دەردەخات لەکارەکەتدا پشتت بە خۆت بەستووە، با بابەتە پێشنیازکراوەکەت زۆر سەرنجڕاکێش بێت، بەڵام لەوانەیە بە هۆیەکی تایبەتەوە ڕەتبکرێتەوە.*

*ڕاستییەکەی نازانم.*

*دەکرێت فاکسی کەم؟ ئەگەر بەدڵتان بوو زۆرباشە وئەگەریش....*

*زۆرباشە بێزەحمەت فاکسی بکەن، بەڵام ناتوانم وەعدتان پێبدەم، تکایە با لە ٥٠٠ وشە زیاتر نەبێت.*

*سوپاس، تاکو سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ فاکسی دەکەم.*

ئەگەرچی ئەو وتووێژە بەو مانایە نییە کارەکە تەواو بووە، بەڵام واتە مەسەلەکە هەنگاوێك چووەتە پێش و سەرۆکی بەشێك ڕازی بووە تەماشای ڕاپۆرتی کەسێکی هەرە نەناسراو بکات، تەنانەت ئەم بابەتە ئەگەر بلاویش نەکرێتەوە تۆ توانیوتە لە ڕێگایەوە خۆت بناسێنیت و توانای خۆت بۆ نووسین و ئامادەکردنی هەواڵ و ڕاپۆرتی سەرنجڕاکێش دەربخەیت.

گەر بابەتەکەت بلاونەکرایەوە لەوانەیە هۆکاری بلاونەکردنەوەکەیت پێنەڵێن، بەڵام سەرۆکی بەش بۆ پەسەندنەکردنی بابەتێك لە هەموو سەردەمێکدا دەتوانێت بەڵگەی تەواوی پێبێت، ئەوەش لە یادمەکە رۆژنامەکان حەزیان لە بلاوکردنەوەی ئەو راپۆرتو هەواڵانە نییە کە لە ئایندەیەکی دووردا روودەدەن، چونکە هەر رۆژنامەیەك‌و پاشکۆ هەفتانەکەی پێویستییان بەو بابەتانە هەیە کە دەکرێت بەخێرایی بلاوکرێنەوە.

لە بیرت نەچێت بابەتەکەت هێشتا پەسەند نەکراوە. کەواتە لە پشتی هێڵی تەلەفۆنەکەوە باس لە نرخی بابەتەکەت مەکە، ئەرکی تۆ ئەوەیە راپۆرتەکەت لە کاتی دیاریکراودا رەوانەکەیت، بە شێوەیەك دابڕێژەوە لە کاتی بڕیاردان لە سەر بلاوکردنەوەی پێویست بکات کەمترین هەڵەی تێدا بکرێت.

ئەگەر بابەتەکەت sokی لەسەرکرا ئەو دەم باس لە ژمارەی پیتەکان‌و کاتی ناردنەوەی راپۆرتەکەت بکە. هەوڵبدە بەبەردەوامی هەواڵەکە لە کاتی خۆیدا بنێریت بۆ رۆژنامەکەو لە داڕشتنەوەیدا ورد بین بە، ئەنجامدانی ئەو خاڵانە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرۆکی بەشەکە سەرنجی رابکێشرێت بۆ لای تۆ، جارێکی دی ئەگەر بتەوێت بابەتیان بۆ بنێریت کارەکەت ئاسانتر دەبێت.

**پێکهاتەی راپۆرتەکە:**

راپۆرتی باش هەر لە پەرەگراف یەکەمەوە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێت، پێشەکی هەواڵەکە یان لیدەکەی ئەگەر هاتوو درێژ بوو دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر دەست لە خوێندنەوەی بابەتەکە هەڵبگرێت، ئەگەر ویستت سەبارەت بە شاخەوانی بابەتێك بنووسیت دەبێت هەر لە سەرەتاوە

ڕستەیەکی لەم شێوەیە بنووسیت: (شاخی وا گەورە لە هیچ کوێیەکی دونیا نییە).

ئەگەر زانیت ناوەڕاستی بابەتەکەت هەندێك ئاڵۆزیی تێدایە پێشنەوەی بابەتەکەت لە سەر کۆمپیوتەر تایپ بکەیت هەموو ئەو خاڵانەی دەتەوێت لە پەرەگرافەکاندا بیانخەرەڕوو و جێگەی پەرەگرافەکانیش بە وردی دەستنیشانبکە، ئەگەر لە جێگەیەك هەستتکرد بابەتەکە ناتوانێت مەبەستەکانت بگەیەنێت، لە خۆت بپرسە کەموکوڕییەکان لە کوێدان؟ پاشان ئەو بەشە لابدە یان شتی دیکەی بۆ زیادبکە.

پەرەگرافی یەکەم: کاردانەوەی من کاتێك بۆ یەکەمجار شاخەکەم بینی.

پەرەگرافی دووەم: پێشبینی من کاتێك لە شاخەکە نزیك دەکەوتمەوە.

پەرگرافی سێیەم: تا زیاتر سەردەکەوم ڕێژەی ئۆکسجین لە هەوادا کەمتردەبێت لە قاچو پشتمدا هەست بە ئازاردەکەم.

پەرەگرافی چوارەم: لێرەدا حاڵەتێکی ڕۆحانی باشم هەیەو سەبارەت بە خواو سروشت هەست بە نزیکایەتی زیاتر دەکەم.

پەرگرافی پێنجەم: سەرکەوتن بۆ لوتکە، لێرەوە هەموو دونیا دەبینم، من لە باوەشی پەروەردگاردام.

سەرۆکی بەش هەرکە بابەتێکی پێدەگات سەرەتا چاوێك بە ناوەڕاستی بابەتەکەدا دەخشێنێت بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکەکەی تێبگات، بە پێی ئەو ئەزموونانەی هەیەتی کاتێك بەو کارە هەڵدەستێت تێدەگات نووسەری بابەتەکە چەندە بە سەرکارەکەیدا زاڵەو ئیشەکەی بە سەرکەوتوویی ئەنجامداوەو لەئامانجە سەرەکییەکەی دوور نەکەوتووەتەوە. نووسەرە تازەکان لەوانەیە بتوانن سەرەتای بابەتەکانیان زۆر بەجوانی دەستپێبکەنو سەرنجی خوێنەران بۆ لای بابەتەکە ڕابکێشن، بەڵام پاراستنی ئەو

سەرکەوتنە بە تایبەت گەر راپۆرتەکە دوورو درێژ بێت کارێکی ئاسان نییە، بۆیە گەر ناوەڕاستی بابەتەکە نەیتوانی قەناعەت بە سەرۆکی بەشەکە بێنێت، ئەوا یەکسەر بابەتەکە ڕەتدەکاتەوە.

## ناوەڕۆکی راپۆرتەکە:

ئەوکاتەی دەست بەنووسین دەکەی هەندێك لایەنی نوێت لە سەر بابەتەکە بۆ دەردەکەوێت پێشتر لە بەرچاوت نەبوون، لە راستیدا تۆش وەك خوێنەر بە تێڕوانینێکی واقعی تەرەوە تەماشای بابەتەکەت دەکەیت. وەك نووسەرێك دەبێت ئەوەندە بڕوا بە خۆبوونو ورەت هەبێت راپۆرتو هەواڵەکە بەو شێوەیە بێت کە ویستووتە.

## زمانی زاراوە و راپۆرتەکە:

ئەوکاتەی دەنووسیت هەرگیز هەوڵی ئەوە مەدە توانای نووسینەوەت بۆ خوێنەر دەربخەیت، هەوڵبدە بەسەر ئەو حەزەی خۆتدا زاڵ بیتو هەوڵبدە پەیامەکەت بگەیەنیت، لە بەکارهێنانی زاراوەی قورسو دەستەواژەی گران خۆت دوربگرەو مەهێڵە بەسەرتدا زاڵ ببن، ئەو زاراوانە بەکەمی بەکاردێن، بەکارهێنانی زمانی ئاڵۆز خوێنەر تووڕە دەکات، خوێنەر پێیباش نییە توانای خۆتی بە سەردا زاڵبکەیت، ئەگەر سەرەتای راپۆرتەکەت بە وشەگەلێك دەستپێبکەیت ماناکەی قورس بێت، گومانت نەبێت زۆربەی خوێنەران دەچنە لاپەڕەکانی ترو بەدوای بابەتو هەواڵو راپۆرتی تردا دەگەڕێن، یان بە توڕەییەوە رۆژنامەکە فڕێ دەدەنە گۆشەیەکەوە. پێشنیازێکی دی ئەوەیە پاش لێبوونەوە لە نووسین بەدەنگی بەرز بابەتەکەت بخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی لە شێوازو مانای ناوەڕۆکی بابەتەکە بگەیت.

## کۆتایی راپۆرتەکە:

نووسینەوەوەی کۆتایی راپۆرتەکە دەبێت هەر وەك سەرەتای دەسپێکردنەکەی بە باشترین بەشی کارەکە تەماشای بکرێت. ئەو بابەتانەی سەبارەت بە رووداوێکی راستەقینە دەنووسرێن پێویستناکات وەك چیرۆك هەر دەبێ کۆتایی هەبێت. ئەگەر ویستت پاش سەفەرێکی شاخەوانی راپۆرتێکی لە سەر ئامادەبکەیت پێویست بەوە ناکات کۆتایی بابەتەکە تایبەت بێت. دەتوانیت بەوە راپۆرتەکەت تەواوبکەیت کەوا بڕیارت داوە لە ئایندەشدا سەفەری تر بۆ ئەو شوێنە بکەیت، ئاشکرایە شاخەکان هەمیشە لە جێگەی خۆیاندا دەمێننەوەو شاخەوانەکانیش بەبەردەوامی ئەندێشەی سەرکەوتن بۆ لوتکەی شاخەکان لە مێشکیاندا دەمێنێتەوە

دەبێت کۆتایی بابەتەکە خوێنەر ناچاربکات سەبارەت بە راپۆرتەکە زیاتر بیرکاتەوە، نابێت کۆتایی راپۆرتەکە دوایین قسە بێت سەبارەت بەو بابەتە، چونکە لە دونیای واقعیدا شتێك نییە ناوی دووا قسە بێت، ئەگەر بڕیار وایە راپۆرتەکە بگاتە کۆتایی، خوێنەریش دەبێت هێندەی نووسەر بەشداری لەو کۆتاییەدا بکات.

## ستایلی راپۆرتەکە:

هۆکاری ئەوەی رۆژنامەکان پەنایان بردووەتە بەر رۆژنامەنووسە ئازادەکان ئەوەیە ئەوان دەتوانن بە زمانی خۆیان بنووسن و بۆچوونە شەخسیەکانیشیان سەبارەت بە بابەتێك بخەنە روو، ئەو خاڵە زۆرجوان دێتە بەرچاو، بەلاّم لەوانەیە ئەو کەسەی لە بەشی پێداچوونەوەی هەواڵە،

ئەو بابەتەی سەبارەت بە شاخەوانی نووسیوتە کورتبکاتەوەو هەندێك لە بەشەکانیشی بە جۆرێك دابڕێژێتەوە تەنانەت خۆشت نەیناسیتەوە. کاتێك بۆ رۆژنامەیەك دەنووسیت ئاگات لەسنووردارییی لاپەڕەکانی بێت. بیهێنە پێشچاوی خۆت ئەو راپۆرتەی بەلای تۆوە زۆر گرنگو پەسەندە، لە بەر کەمی جێگا لە پانتاییەکی بچووكو لە خوارەوەی لاپەڕەی ئاگادارییەکان لە نێوان دوو ئاگاداریدا دادەنرێت. بۆیە باشتروایە تا پێتدەکرێت نووسینەکەت کورت بێت، هیچ پێویست ناکات بابەتو نووسین لە بلاوکراوەکاندا درێژ بن، هەندێك بابەتی پڕ بایەخ هەن لە چەند سەد وشەیەك تێپەر ناکەن.

## دۆزینەوەی بابەت:

بۆ نووسینی راپۆرت پێویستت بەوە نییە پسپۆریت لە بوارێکی تایبەتدا هەبێت. نووسەری سەرکەوتوو ئەوەیە دینامەیکییەتی تێدا بێت. لەراستیدا نووسین لە سەر ئەوبابەتانەی زانیارییەکی کەمت لە بارەیانەوە هەیە کارێکی باشە، چونکە وات لێدەکات هەلسوکەوتەکانت وردبینی تێدا بێتو واقعیانەتر بێتو دیدگاکانی پێشووت نەخەیتە ناو بابەتەکەوە.

ئەگەر مەبەست ئەوە بێت لە هەرکاتو ساتێکداو لە سەر هەر مەسەلەیەك کە بە دڵتە بنووسیت، چەندین شێواز هەیە بۆ دۆزینەوەی بابەتی سەرنجراکێش، پێویستە وەك ئەو رۆژنامەنووسەی لە خودی رۆژنامەکەدا کاردەکات تۆش پەیوەندیت بە خەڵکی جیاجیاوە هەبێت بۆ ئەوەی بە بەردەوامی ئاگات لە رووداوەکان بێت. ئەگەر بڕیارتداوە ژیانی خۆت لە سەر رۆژنامەنووسیی ئازاد بەرێوەببەیت، پێویستە لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر خەڵکدا پەیوەندیت هەبێت.

## ئەو بابەتانەی زۆر دووبارە دەبنەوە:

هەندێك نووسەری بە ئەزموون هەن لە سەر ئەو بابەتانەی پێشتر چاپکراون، جارێکیدی شتی لە سەر دەنووسنەوە، بۆ ئەم مەبەستە پێویست دەکات ژمارەیەکی زۆر گۆڤار بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی بابەتێك بدۆزیتەوە بەلای خوێنەری نوێوە پەسەند بێت، زۆر جار ئەو گۆڤارانەی ناوبانگیان نییە، بابەتی سەرنج ڕاکێشیان تێدایە، گۆڤارە تایبەتەکان سەرچاوەیەکی باشن و تەنانەت دەکرێت لە هەواڵە لۆکاڵییەکانیش ڕاپۆرتی باش دەر بهێنرێت.

بە هیچ شێوەیەك بۆت نییە ئەو ڕاپۆرت و بابەتانە بەکاربهێنیت کە هی خەڵکی ترن، ئەوکارە بە دزیکردنی ئەدەبی لە قەڵەم دەدرێت، بەو کارەت نەك هەر خۆت، بەڵکو ئەو گۆڤارەی بابەتەکە چاپ دەکات تووشی کێشە دەبێت، بەڵام ئەگەر بابەتێك دووبارە لە سەری بنووسرێت، کێشە نییە، ڕووداوەکان موڵکی کەس نیین، وەڵێ دەبێت لەو بابەتەی دەتەوێت لە سەری بنووسیت لێکۆڵینەوەبکەی، بۆ ئەوەی بزانیت ئەوە دەهێنێت جارێکیدی لە سەری بنوسرێت، ئەگەر لەوە دڵنیا بویت، ئەو کات دەتوانیت لەو ڕوانگەیەوە کە خۆت پێتباشە ڕاپۆرتێك ئامادەبکەیت، لەوانەشە پاش بڵاوبوونەوەی بابەتەکەی تۆ کەسێکیدی لە سەر هەمان بابەت شتێك بنووسێت.

سەرچاوەیەکیدیکەی دۆزینەوەی بابەت، بریتییە لە کتێب، ڕۆژنامە لۆکاڵییەکان، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سایتەکانی ئینتەرنێت، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە بەردەوامی چاودێری ڕاپۆرت و هەواڵەکانی یەکدی دەکەن. هەر ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەواڵەکان لە ئاستێکی فراواندا بڵاوببنەوە.

ئەو ستايلەی نووسەرە گەورەكان لە ڕێگەيەوە بابەتی درێژ دەنووسن، ئەمڕۆكە بە تەواوەتی تەشەنەی سەندووە، بەڵام سەرچاوەی ئەم ستايلە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژنامەوانی ساڵانی ١٩٦٠، هەردوو ڕۆژنامە نووس *(تـوم وڵف و ترومان كالۆت)* لە پەرەسەندنی ئەو ستايلە ڕۆڵی بەرچاويان هەبوو. ئەم ستايلی داڕشتنە بە سوود وەرگرتن لە شێوازەكانی چيرۆكنووسين، شۆڕشێكيان لە داڕشتنی ڕاپۆرتو هەواڵنووسيندا بەرپاكردو لە نيوەی يەكەمی سەدەی پێشوودا بووە هۆی گەشەسەندنی ڕۆژنامەوانی نوێ. لەم ستايلەدا نووسەر بە ڕەنگو بۆنێكی تايبەت كە زياتر لە شێوازی چيرۆكنووسان دەچێت، هەڵدەستێت بە وەسفكردنی كەسايەتی، شوێنو ڕووداوە ڕاستەقينەكان.

# ٧

# گفتوگۆیەك لە گەڵ ڕۆژنامەنووسێکی ئازاد

کـاری ڕۆژنامـە نووسـە ئازادەکـان هەمیـشە سـەرنجڕاکێشو پڕجـۆشو خرۆشە، زۆربەی سەرنووسەران ئەو بابەتانەیان پێباشە کە لـە گـەڵ سـتایلی بڵاوکراوەکانیانـدا دەگونجێـتو جێگـەی حـەزی خوێنـەرانن. زۆربـەی ئـەو بابەتانـــەی لەلایـــەن نووســـەرە ئازادەکانـــەوە بـــۆ ڕۆژنامـــە لۆکـــاڵیو سەرتاسەرییەکان دەنێردرێن ناوەڕۆکەکانیان باس لە کۆمەڵێك بابەتی سادەو ساکاری ڕۆژانە دەکەن.

کـاتی موسـلی *"Kate Moseley"* ڕۆژنامـە نووسـێکی ئـازادە، خـولی فێربـــوونی ئـــابووری خێزانـــی تـــەواو کـــردووەو لـــە گـــەڵ ڕێکخراوێکـــی خزمەتگوزاریو راوێژکاریی خۆراك کاردەکاتو ئـەرکی وێنـەگرتنو چۆنێتی لێنـانو ئامـادەکردنی چێشتە. ئـەزموونی نووسـینی هـەواڵی لـە پەیوەندییـە گشتییەکاندا هەیە. موسلی لـە گـەڵ چـەندین گۆڤـاری وەك "Home and " Wmans Weekly"و nehor newz""و"Freezer Digest "BBC Good Food Mgazine " و you Magazine new" "و" و چەندین گۆڤاری دیکەی تایبەت بە ژنان وەك بەرپرسی بەشی چێشتلێنان کـاریکردووە. جگـە لـەوە لـە بەشـی پەیوەندییـە گـشتییەکانی رادیـۆدا کاردەکاتو لە بوارەکانی نووسینو بەرهـەمهێنانی کاسێتو تـابلۆی ریکلامو

بازرگانیدا چالاکی هەیە.

★ ئایا لە سەرەتادا بڕیارتاندابوو ببنە رۆژنامەنووس، یان بە رێکەوت هاتنە ئەم بوارەوە؟

- هیچ کاتێك بیرم لەوە نەدەکردەوە رۆژێك بێتو بەم شێوەیە ببمە رۆژنامەنووس، راستە کاتێك لە پەیمانگا بووم بیرم لەوە دەکردەوە ببمە سەرۆکی بەشی چێشتلێنان لە گۆڤارێکی سەرتاسەریدا، بەلام ئەوەش لە بواری فێرکردنی چێشتلێنانو وێنەگرتن نەك نووسین. بۆیە دەکرێت بڵێین بە شێوەیەك لە شێوەکان بە رێکەوت بوو هاتمە بوارەکەوە.

★ ئایا بۆ ئەوەی ببیتە رۆژنامەنووس هیچ خولێکی فێربوونت بینیوە؟

- فێربوون بە شێوەیەکی تایبەت نەخێر، کاتێك چوومە Anchor News بەشداریم لە خولێکی دوو رۆژەی فێر بوونی ستایلی نووسینی ریکلامو رۆژنامەنووسی لە ناو ریکخراوێکدا کرد، پاش تەواوکردنی خولەکە بڕوانامەیان پێدایـن، بەلام ئەوە لە رابردوویەکی دووردا روویدا، تەنانەت من ناوی ئەو کۆمپانیایەم لە یاد نەماوە کە خولەکەی کردەوە. پێش دە ساڵیش لە خولێکی دە رۆژیدا بەشداریم کرد کە رادیۆی (ویلت شایر) لە بریستۆڵ سازیدابوو. لەخولێکی شەوانەی تایپکردن لە سەر تابیعە بەشداریم کرد، بەلام من هێشتا فێری کۆمپیوتەر نەبووم، کەچی دەبێت لەو بوارەشدا شارەزایی پەیدابکەم.

★ ئەگەر تۆ سەرنووسەری رۆژنامەیەك بیتو بتەوێ رۆژنامەنووسێك لای خۆت دابمەزرێنیت، ئەو تایبەتمەندییانە چین کە لە بوارەکانی کەسێتیو پیشەییو بڕوانامە رەچاویا دەکەیت؟

- بە شێوەیەکی گشتیی حەزکردنو شەوق بۆ ژیانو کارکردن بۆ من گرنگە،

ئەوکەسە دەبێت بزانێت لەکوێ زانیاریی دەستدەکەوێت، پێویستە توانای پلاندانان‌و نووسینی ڕاپۆرتی دوورو درێژی هەبێت. دەبێت بە ڕادەیەکی پێویست لە خۆی دڵنیا بێت‌و بزانێت چۆن داوای یارمەتی لە خەڵکیدی دەکات‌و زانیاریی وەردەگرێت. ئەو کاتەی بە تەلەفۆن قسە دەکات زۆر هێمن‌و بە ئەدەب بێت‌و بزانێت کۆمپیوتەر بەکار بهێنێت‌و بتوانێت لەچەند سەرچاوەیەکی جیاجیاوە زانیاریی وەربگرێت‌و بە شێوەیەکی لۆژیکی‌و دلگیرانە بنووسێت. گرنگ نییە بەشێکی تایبەتی خوێندبێت، یان ئەزموونی کارکردنی هەبێت، ئەوە بەسە حەزی لەم کارە بێت.

* بە ڕای تۆ پەیامنێریی ڕادیۆ و ڕۆژنامە لە شێوازی کارکردنیاندا لێکنزیکن یان پێچەوانەی یەکن؟

- شێوازی نووسینی هەردووکیان جیاوازە، لە کاتی نووسینی تێکستێکی ڕادیۆییدا پێویستە تایبەتمەندییە شەخسی و لێهاتووییەکانی ئەوەی چاوپێکەوتنەکە دەکات‌و ئەوەی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵدا دەکرێت لە پێش چاو بگیرێن. دەبێت پرسیارەکان بە تەواوی بنووسرێن‌و وەڵامەکانیش بە شێوەی یاداشت‌و بە کورتی بنووسرێن تاکو ئەوەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکرێت بە دڵی خۆی وەڵامیان بداتەوە. دەبێت بزانیت کاتت نییە، بۆیە بە خێرایی بچۆرە سەر ئەسڵی مەسەلەکە، گفتوگۆ زۆر بە ئاسانی ئەنجامدەدرێت‌و لە نووسین سادەترو ئاسانترە.

* ئایا نووسین سەبارەت بە چێشتلێنان هیلاکتان ناکات؟

- بەندە بەوەی بۆ کێ دەنووسی، ئەوکاتەی بابەتێك دەنووسی‌و لێیڕازیت وەکو خۆی لە گۆڤارەکەدا بڵاو دەکرێتەوە هەستێکی تایبەتت لادرووست دەبێت. بەڵام هەندێکجار هەڵەبڕو ئەوانەی لە گۆڤارەکەدا دەستیان دەڕوات، بە شێوەیەك دەستکاری بابەتەکەت دەکەن بە تەواوەتی دەیگۆڕن‌و

ستایلەکەی تێکدەدەن، هەندێکجار ئەم کارە نەک هەر جارێک بەڵکو چەندین جار دووبارە دەبێتەوەو تەنانەت جار هەیە کاتێک بابەتەکەی خۆت دەبینی زۆر بە دژواری تێدەگەیت ئەوە بابەتەکەی خۆتە. جاریش هەیە خاڵی باش بۆ بابەتەکە زیاد دەکرێت. بەڵام کاتێک *(تایبەت مەندییە پیشەییەکانی تۆ)* لە تێکستەکە دەردەکەن زۆر بێزار دەبیت، لەو گۆڤارانەی کە رێکخراوەکان دەریدەکەن ئازادی کارکردنی زیاترم هەیە. بۆ نموونە دەتوانم چەندین وتەی خەڵکی تێدا جێبکەمەوەو بابەتی سەیرو تەنز ئامێز بنووسم.

* بۆ ئەو کەسانەی حەزیان لەوەیە ببنە رۆژنامەنووسی ئازاد چی پێشنیازێکتان هەیە؟

- پێشنیازم ئەوەیە رۆژانە تەماشای ئەو دەفتەرە بکەیت کە ناوی سەرچاوەکانی هەواڵی تێدا تۆمارکراوە، تاکو گەر پێویستی کرد بۆ وەرگرتنی هەواڵو زانیاری بە پەلە پەیوەندییان پێوەبکەیت، دەبێت ئاگات لە تایبەتمەندی ئەو گۆڤارانە بێت کە بابەتیان بۆ رەوانە دەکەیتو شێوەی ژیانو تایبەتمەندییەکانی خوێنەرانیش لە بەرچاو بگرە، پێشئەوەی دەست بە نووسین بکەیت بیر لە هەموو راپۆرتەکە بکەرەوە، بەو زانیاریانەدا بچۆرەوە کە سەبارەت بە بابەتەکە کۆت کردوونەتەوە. بابەتەکان بە کورتی باسبکەو خۆت لە درێژدادڕییو شیکردنەوەو روونکردنەوەی بابەتەکە بەدوور بگرە، بە زانیارییو سەلیقەی خۆت زیاتر بابەتەکە برازێنەوەو لە شێوەی پەخشانێکی سادەو رەوانو لەزەت بەخشدا دایبڕێژە.

* پێتوایە لەو رۆژەوەی دەستت داوەتە کاری رۆژنامەنووسی تا ئێستا، چ گۆڕانێک لە رۆژنامەوانیدا روویداوە؟

- من ئەوکاتە تابیعەیەکی کۆنم هەبوو ژمارەی ئەو وشانەی تایپم دەکردن دەبوایە بە ئەندازەی پانی ستونی رۆژنامەیەک بێت، دەبوایە

هەواڵەکەمان پارچە پارچە بکردبایەو بمانلکاندایە بە کاغەزێکەوە. بۆ ئەو مەبەستە ڕێژەیەکی زۆر سەمغمان سەرفدەکرد، هەندێکجار بەشێکی هەواڵەکەمان لێ ونـدەبوو، ئەوکارە دوو سێ ڕۆژی پێدەچـوو، ڕۆژێکیش دەبوایە ڕۆژنامەکە ببرێتە لای کرێکارانی چاپخانەکە، پاش ئەو کارە گۆڕینی ناوەڕۆکی هەر هەواڵێك پارەیەکی زۆری تێدەچوو، ئێمە شەش مانگ پێشتر کارمان دەکردو گۆڤارەکەمان لە فینلەندا چاپ دەکرا.

* بەڕای تۆ ئەو گۆڕانانەی درووستبوون ئیجابیین؟

- ئەم دۆخە زۆر باشە، ئەمڕۆ دەتوانین بە کۆمپیوتەر هەواڵەکان بنووسینەوەو لە ڕێگەی ئیمەیلەوە بابەتو وێنە ڕەوانەکەینو تەنانەت نەخشەسازی ڕۆژنامەکەش بە کۆمپیوتەر بکەین. من هێشتا بە کەمیی کەڵك لە ئینتەرنێت وەردەگرم، بەڵام دڵنیام ئینتەرنێت خێرایی کارەکان زیاتر دەکات. کێشەیەك هەیە ئێستا ئەوانی تر لە جاران ئاسانتر ئەتوانن دەستکاری بابەتەکانی تۆ بکەن.

* ئایا هیچ پێشنیازێکی ترت هەیە بۆ ئەو پەیامنێرانەی تازە دەستبەکاربوون؟

- تا پێتدەکرێت ئەو بڵاوکراوانە بخوێنەوە کە پەیوەستن بەو بابەتانەی دەتەوێت لە سەریان بنووسیت یان بەلای کەمەوە چاویان پێدا بخشێنە. ئەو بابەتانەی لە خوێندنەوەیان لەزەتت بردووە جیایانبکەرەوە، ئەو مانشێتو بیرۆکە باشانەی بە خەیاڵتدا دێن لە جێگەیەکدا بیاننووسەوە.

# ٨

# نووسەر لە رۆڵی وێنەگردا

ئەگەر ریپۆرتەری رۆژنامەکانو رۆژنامەنووسە ئازادەکان بتوانن لە پاڵ ئامادەکردنی راپۆرتەکانیان چەند وێنەیەکی باشی رووداوەکە بگرن، گرنگییەکەی لە باسکردن نایەت. نووسەرێکی ئازاد دەبێت لە گەڵ ئەو راپۆرتەی کە دەیفرۆشێت بە رۆژنامەو گۆڤارەکان، چەند وێنەیەکی باشیش بنێرێت. ئەو توانایە یەکێکە لە پێداویستییەکانی نووسین بۆ بڵاوکراوەکانو دەبێتە قازانجێکی ماددی باش بۆی. ئەوەش لە بەرچاو بگرین ئەو کارە پێویستی بە هەندێك خەرجیی بۆ کرینی فیلمو کامێرا هەیەو کاتی زیاتریشی دەوێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش سوودەکانی لە زیانەکانی زۆرترەو زۆربەی پەیامنێرەکان پێیانباشە ئەو وێنانە بڵاوبکرێنەوە کە خۆیان بۆ راپۆرتەکانیان گرتویانن.

بەڵام ئەو وێنەگرەی تەنها وێنەی شەخسیو خێزانیی گرتووە، چۆن دەتوانێت وێنەیەك بگرێت بە دڵی سەرۆکی بەشی فۆتۆگرافی بڵاوکراوەکەو لە هەمووی گرنگتر بە دڵی خوێنەران بێت؟

کامێرا:

ئەو بۆچوونەی پێیوایە باشترین وێنە دەبێت بە باشترین جۆری کامێرا بگیرێتو بۆ ئەوەی وێنەیەکی باشمان دەستبکەوێت پێویستە پارەی زۆر خەرجبکەین، بۆچوونێکی هەڵەیە.

*نموونە: "دون مەك كولن" كاتێك یەكەم وێنەی رووداوێكی لە ساڵی ١٩٥٨ نارد بۆ رۆژنامەی "Observer" بووە هۆی ئەوەی رۆژنامەكە گرێبەستێكی لە گەڵدا ئیمزا بكات تاكو بۆ ئەوان كار بكات. سەیر لەوەدایە وێنەكە بە كامێرایەكی ئاسایی گیرابوو، لە وێنەكەدا كۆمەڵە گەنجێكی بەرەڵا دەردەكەوتن لە لەندن لە بەردەم كەلاوەیەك بەشێوەیەكی سەرسەریانە وەستابوون، لەخوارەوەش ئەفسەرێكی پۆلیس كە بە چەقۆ كوژرابوو كەوتبوو، شێوەی وێنەكەو رووناكییەكەی زۆر گونجاو بوون، لە وێنەی رەش‌و سپیدا رەچاو كردنی ئەو خاڵانە زۆر سەختە، چونكە لەوانەیە بە هۆی زۆری‌و كەمی روناكی وێنەكە سپی یان تاریك دەرچێت. مەك كولن بەوپەڕی لێبوردەییەوە وتوویەتی رێكخستنی وێنەكە بە رێكەوت بووە. ئەوەش لە یاد نەكەین هەندێك جار شانس رۆڵی خۆی دەگێڕێت لە وێنە گرتندا. ئەو وێنەیە ژیانی "مەك كولن"ی بە تەواوی گۆڕی‌و بووە هۆی ئەوەی ببێتە یەكێك لە بەناوبانگترین وێنەگرەكانی هەواڵ لە بریتانیا.*

ئەو كامێرانەی بە زۆریی وێنەگرانی هەواڵ وێنەی پێدەگرن پێیدەوترێت "slr" و كورتكراوەی "Singl Lens Reflect". دەبێت بووترێت ئەو بڕگەیە گومڕا كەرانەیە، چونكە ئەو كامێرایە تاك هاوێنەیی نییەو دەكرێت چەند هاوێنەیەكی تری لە سەر ببەسترێت. هەر لە بەر ئەو تایبەتمەندییەشە ئەو كامێرایە بۆ پەیامنێران گونجاوە، بۆ وێنەگرتنی رۆخسارو دیمەنەكان كەڵك لە كامێرای گران بەها وەردەگیرێت.

هەموو ماركەكانی كامێرای بەكارهێنراوی SLR لەبازاڕ دەست دەكەون، هیچ كات بە پێی كۆنی‌و جۆری كۆمپانیای بەرهەمهێن رای خۆت لە سەر ئەو كامێرانە مەدە، ئەگەر لە رووی میكانیكییەوە كامێراكە كێشەی نەبوو ئەوا بیكڕە، ئەوە لە یاد مەكە هەندێك كامێرا هەن، بەتایبەتی ئەگەر

شەخسی بێت زۆر بە باشی ئاگاداری لێکراوەو لەوانەیە کەم بەکار هاتبێت، بەڵام ئەو کامێرانەی کەبەدەستی خەڵکانی شارەزاو لێزانەوەبوون زۆر بەکارهاتوون، هەرکە تەماشای بکەیت دەبینی لوس یان گرنجگرنجی پێومیە، کاتێك دەچیتە سەر کارێك باشتر وایە دووکامێرا تەنانەت سێ کامێرا (دوو کامێرایSLR و کامێرایەکی بچووکی ئۆتۆماتیکی) لە گەڵ خۆتدا ببە، دەبێت هەردوو کامێراSLR کە، توانای ئەوەیان هەبێت هاوێنەیان لە سەر ببەسترێت.

## هاوێنە:

بۆ زۆربەی ئەرکەکان سێ جۆر هاوێنە پێویستە: هاوێنەی ستاندارد بۆ گرتنی وێنە بە ئەبعادی پرسپکتیڤیو سرووشتی. هاوێنەی واید ئەنگڵ "Wide angle" بۆ وێنەگرتنی گۆشەی کراوەو فراوان. هاوێنەی تیلی فۆتۆ"Telephoto" بۆ گرتنی دیمەنە دوورەکان. ئەگەر دەتەوێت ببیتە پەیامنێرێکی سەرکێش باشتر وایە هاوێنەیەکی زۆر باشو هاوێنەیەکی چاوەماسی بۆخۆت پەیدابکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت وێنەی زۆر سەرنجراکێش بگریت. پێویستە پێشتر کەرەستە زەرووریەکانی ترت هەبێت. کامێرای کومپامت "Compact cameras"ی ئۆتۆماتیکیش هەیە.

## کەرەستەی لاوکی:

بۆ روناککردنەوەی ئەو تەنو لەشانەی لە دوورییەکی دیاریکراوەوە وێنەیان دەگریت پێویستیت بە فلاش هەیە. دەزانیت رووناکی فلاشەکە بەر ئەو تەنانە ناکەوێت کە دەکەونە دەرەوەی ئەو دوورییەی لێی وەستاویت،

چونکه توانـای ڕوونـاکی فلاشـەکان بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراون. ئەوکاتـەی شـەتەری کامێراکـە دەکرێتـەوە، فلاشـی کـامێرای slr بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکەوێتەکار زۆربەی فلاشەکان ستانداردێکی جیهانییان هەیە دەکرێت هەموویان لە سەر کامێرای slr ببەستی.

زۆربەی وێنەگرەکان بۆ ڕێگرتن لە نەلەرینەوەی کامێراکانیان فلاشەکان لە سەر شتێکی چەسپاو دادەنێن. ئەوەش لەو کاتانەدا دەبێت کە خێرایی شەتەرەکە کەمە، وێنەگری هەواڵەکان لە گەڵ خۆیاندا ستاندی تیلسکۆپی دەبەن‌و کامێراکەی لە سەر دەبەستن‌و دەکرێت بەرزو نزم بکرێتەوە، ئەمە پێچەوانەی سێپاکانی کامێرایەو جێگەیەکی کەمتر دەگرێت‌و کاتێك وێنەگر پێویستی پێی نابێت دەتوانێت بیخاتە گیرفانییەوە. زۆربەی وێنەگرەکانی هەواڵ بۆ گرتنی وێنەیەکی هەواڵی کەڵك لە پێوەری ڕووناکیی سەر کامێراکانیان وەردەگرن، زۆربەی کامێراکانی slr سیستەمێکی ئەندازەگرتنی ئۆتۆماتیکی لە سەر هاوێنەکانیان دانراوە کە لە دەرزیەك دەچێت لە چاوی کامێراکەدا. بە چەرخاندنی دەرگای ڕێکخستنی ڕووناکییەکەی دەبێت ئەو دەرزییە بە شێوەیەك ڕێك بخرێت لە نێوان (+) و(-) کەدا بێت. لە کامێرا کۆنەکاندا پێوەری ڕووناکییەکانیان پێویستی بە باتری هەیە، بۆیە گەر ئەو نیشانەیەت لە چاوی کامێراکەتدا نەبینی باترییەکانی بگۆڕە.

## فیلم:

هەڵبژاردنی جۆری فیلم کارێکی زۆر گرنگە، چونکە کار لە کوالیتی وێنەکان دەکات. ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی وێنەکە کاتێك تەماشای وێنەکەی کرد دەزانێت تۆ فیلمی باشت بەکارهێناوە یان خراپ.

هەموو ئەو فیلمانەی دەیکرپیت ٣٥ میلی میترین، ئەوە ئەو فیلمەیە کە بۆ کامێراکەی تۆ گونجاوە، سینەماکارانیش بۆ فیلمەکانی خۆیان هەر ئەو فیلمە بەکاردێنن. تایبەتمەندی ئەو وێنانەی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بلاو دەبنەوە جیاوازن، گۆڤارەکان حەزدەکەن لەو وێنانەی بە سلاید رەنگاو رەنگ و٣٥ میلی مەتری گیراون، چونکە دەرخستنیان زۆر خێراترە، بۆیە پێش ئەنجامدانی کارەکەت سەبارەت بە جۆری فیلمەکان پرس بە سەرنووسەری بلاوکراوەکە بکە. لە بیرت نەچێت بەسەرنووسەرەکە بلێ ئەرکی شتنەوەی فلیمەکە لە ئەستۆی تۆیە یان رۆژنامەکە. ئەگەر خۆت هەلناسی بە شتنەوەی فیلمەکە دەبێت فیلمێك بکرپیت کە لە موختەبەرکاندا زوو بشۆرێتەوە،

باشترین رێگە ئەوەیە لەبازاڕ فیلمەکانت بە کۆ بکرپیت و لە سەلاجەدا هەلیانبگریت، بەم شێوەیە کەمتری تێدەچێت.

## ئیزۆ (ISO):

وشەی ISO کورتکراوەی "رێکخراوی جیهانی ستاندارد"ە و لە جێگەی ئەنجوومەنی ستانداردی ئەمریکا ASA دانراوە، ئەم دوو رێکخراوە یەکەیەکی پێوانەی هاوبەشییان هەیە بۆ خێرایی فیلم. لەراستیدا ئیزۆ بە پێی خێرایی حەساسییەتی فیلمەکان ژمارەیان پێدەدات. فیلمێکی iso٤٠٠ خێراییەکەی دوو هێندەی فیلمێکی iso ٢٠٠یەو چوار ئەوەندەی فیلمێکی iso١٠٠یە. بۆ وێنەگرتن لە رووناکی زۆردا پێویستت بە فیلمێك هەیە خیرایی حەساسییەتەکەی کەم بێت. بەلام بۆ ئەو رۆژانەی تاریك و هەورن هەروەها لە ژووری داخراودا فیلمێك گونجاوە حەساسییەتەکەی زۆر بێت.

ئــەو فیلمانــەی خێراییــەکانیان زۆرەو جۆرەکانیــان باشــە لــە هــەموو هەلومەرجێکـدا دەکرێـت کـەڵکیان لێوەربگیرێـت، هەنـدێك فۆتۆژورنالیـست هەین فیلمێك بە کاردێنن خێراییەکـەی( ٨٠٠،١٦٠٠ و تەنانـەت ٣٢٠٠)ە، بـەڵام پێوەری گشتیی ئەوەیە فیلمێك بەکار بهێنرێت خێرایی زۆر نـەبێت، چونکە بە باشترین شێوە وێنەکەت بۆ پیشان دەدات. لە بیرت نەچێت لە کاتێکدا فیلمەکـە دەخەیتــە نــاو کامێراکـەوە خێرایـی کامێراکـە لـە گـەڵ خێرایـی فیلمەکەدا ڕێکبخەیت. گەر وا نەکەیت ڕێژەی روناکییەکە، ناگونجێت لە گەڵ خێرایی فیلمەکەداو لە کاتێکدا فیلمەکە دەشۆیتەوە دەبینیت وێنەکە تاریك یان زۆر سپی دەردەچێت.

## چۆنێتی وێنەگرتن:

ئەو بۆچوونەی دەڵێت وێنەگری باش ئـەو وێنەگرەیـە دەرچـووی بەشـی هونـەر بێـت لـە زانکۆیـەك و ئـەزموونی کـارکردنی هـەبێت لـە جێگەیەکـدا، بۆچونێکی چەوتە. بڵاوکراوەکان ئـەو وێنانـەیان ناوێـت خـەڵاتی بـەنرخیان پێدرابێت، بەڵکو ئـەوان وێنەیـەکیان دەوێ بەکـەڵکیان بێـت و روون و ئاشـکرا بێت و پەیامێکی بۆ بینەرەکەی پێبێت. بـۆ ئـەوەی ببیتـە وێنـەگرێکی باشـی هـەواڵ کارەکـە هێنـدە دژوار نییـە، بـەڵام پێویـستە رەچاوی ئـەم پرەنـسیپە سادانە بکەیت:

ئـەو کامێرایـەی خـۆت پێـشتر فیلمـت تێخـستووە لـە گـەڵ خۆتـدا هـەڵبگرە، لەوانەیــە ئــەو کاتــەی بــۆ کــڕینی شــتێك دەچــیتە دەرەوە بابــەتێکی سەرنجڕاکێشت توش بێت، کامێرای کامپکت و ئۆتۆماتیـك بـۆ ئـەم مەبەسـتە بەکەڵك دێن و دەکرێت لە گیرفاندا هەڵبگیرێن.

له فرۆکەخانەدا پێشنەوەی کامێراکەت بە ژێر تیشکی ئێکسدا ڕەتبکەیت، بیخەرەناو کیسەیەکی پلاستیکی شەفافەوەو پیشانی پۆلیسەکەی بدە. ئەوە کارێکی زەرووری نییە، بەڵام باشتر وایە خۆتی لە سەر رابهێنیت.

هەوڵبدە لە هاویناندا کاتێك وێنەی شوێنێکی کراوە دەگریت، بەیانیان زوو یان ئێواران ئەوکارە بکەیت، بۆ رووناککردنەوەی بابەتی وێنەکەت کەڵك لە تیشکی خۆر وەربگرە.

نیوەڕوان واتە ئەو کاتەی روناکی زۆرەو خەڵك ناچارن پێڵوەکانیان لە یەك نزیك بکەنەوە، وێنەی کەس مەگرە. ئەوە لە بیر مەکە باشترین سەرچاوەی رووناکی بۆ وێنەگرتن، تیشکی خۆرە. کەواتە لە کاتی وێنەگرتندا پشت لە خۆر بکە.

لەو کاتەی دیمەنەکە زۆر رووناکە، گەر ویستت وێنەیەکی تایبەت بگریت؛ بۆ نموونە وێنەی ئاو، فیلتەری کەمکردنەوەی رووناکی بەکار بهێنە.

کاتێك وێنەی چەند کەسێك لە بەردەم تیشکی بە هێزی خۆردا دەگریت، بۆ ئەوەی چاوەکانیان دانەخەن، پشتیان بکە لە خۆرەکەو فلاش بەکار بهێنە تاکو سێبەری سەر دەموچاویان دەرنەکەوێت.

بابەتێك بۆ وێنە گرتن دیاریبکەو لە چەند گۆشەیەکەوە وێنەی بگرە، لە هەر وێنەیەکدا دەرگای رێکخستنی رووناکییەکە بە رێژەیەك بگۆڕە لە گەڵ خێرایی حەساسییەتی فیلمەکەدا جیاواز بێت. بۆ گرتنی وێنەی دیمەنێك سوود لە چەند هاوێنەو فیلتەرو فیلمێکی جیاجیا ببینە. لە کاتی وێنەگرتندا شوێنی خۆتو کامێراکە بگۆڕە. بۆ نموونە پاڵبکەوەو کامێراکە رووبکەرە سەرەوە یان لە سەر سەکۆیەکەوە وێنەی خوارەوە بگرە، هەندێك جار ئەو وێنانە بە شێوەیەکی سەر سوڕهێنەر جوان دەردەچن.

وێنەی جوڵەو رەنگی جیاجیا بگرە. تا پێتدەکرێت لە وێنەکانتدا مرۆڤ

پیشان بدە. بۆ نموونە باشترین وێنە بۆ بابەتێك لە سەر سەفەر دیمەنی کۆمەڵە کەسێکە لە کاتی گەشتکردندا، سەرنووسەرو بەرپرسی بەشی وێنەی ڕۆژنامەکان عاشقی ڕەنگی شەفافو درەخشانو خەڵکی سەرنج ڕاکێشن، کەواتە هەوڵبدە کەڵك لەو بابەتانە وەربگریت.

١.ناراستەی بابەتە جوڵاوەکان دەبێت بۆناوەوەی کادری کامێراکە بێت نەك دەرەوەی. دەبێت ماوەیەکی گونجاو لە نێوان بابەتە سەرەکییەکەدا هەبێت بۆ ئەوەی گەر پێویستی کرد لێی بقرتێنرێت.

دەبێت ڕەنگەکان لە گەڵ یەکدا بگونجێن. ئەگەر بابەتی وێنەکە لە پشتی ستێرنی سەیارەیەکی سووری سپۆرتەوە بوو، باشتروایە ڕەنگی جلەکانی کراوە بن، گەرلە تاریکیدا وێنەیەکی ڕەشو سپیت گرت، هەوڵبدە ڕناکی بەکاربهێنیت.

چەند فیلمێك لە گەڵ خۆتدا هەڵبگرەو کۆمەڵێك وێنەی دیمەنێکی دیاریکراو بگرە. جاری وا هەیە سەرنووسەر لەناو ١٠٠ یان ١٥٠ وێنەدا، تەنها ٦ دانەیانی لا پەسەند دەبێت. لە نێوان وێنە زۆرەکاندا هەندێکیان باش دەبن، بەڵام زۆربەیان بەکەڵکی بلاوکردنەوە نایەن، وێنەگریی ئەوەیە!

ئەگەر دڵنیانیت بتوانی بە کامێرای slr وێنەی باش بگریت، کامێرای بچووکی ئۆتۆماتیکی بەکار بهێنە. تایبەتمەندی ئەوکامێرایە لەوەدایە بەشێوەی ئۆتۆماتیکی ڕادەی ڕووناکیو هاوێنەکەی ڕێکدەخات. ئەم کامێرایە بۆ وێنەگرتنی فەزای داخراو زۆر باشەو زۆر لە وێنەگرە پسپۆڕەکان ئەو کامێرایە بەکاردەهێنن.

ئەگەرکەست دەستنەکەوت وێنەی خۆت بگرێت تەنێك دەست نیشانبکە بەقەد لاشەی مرۆڤێك بێت، کامێراکەت لەسەری زووم دابنێو بیخەرە سەر

وێنەگرتنی ئۆتۆماتیکیو جلێك كە لە گەڵ دیمەنەكەدا بگونجێ لەبەربكەو چاوەڕێبە تاكو وێنەكەت دەگرێت.

## ناردنی وێنەكان لە ڕێگەی پۆستەوە:

پەیامنێریی ئازاد لەكاتی ناردنی وێنەكانی بە پۆستە بۆ ڕۆژنامە دەبێ كۆمەڵە خاڵێك لە بەرچاو بگرێت، پێشئەوەی وێنەكان رەوانەكەیت، زانیاری تەواو لە سەر ئەوەی چ وێنەیەكتو لە چ كاتێكدا بۆ كێ ناردووە لە دەفتەرەكەتدا تۆماربكە. ئاگات لە یاسای *(كۆپی رایت)* و مافی خاوەنداری بێت *( سەبارەت بەو مەسەلەیە لەم فەسڵەدا روونكردنەوە دەدرێت)*، هەرگیز بەو مەبەستەی لەوانەیە سەرنووسەر سوود لە وێنەكانت وەربگرێت وێنە مەنێرە، بەڵكو پێشوەخت بە تەلەفۆن یان بە نووسین سەبارەت بە مەسەلەكە لە گەڵیدا قسە بكە. پێش ناردنی وێنەكان لیستێك بكەرەوەو تێدا تۆماریانبكە. تەنانەت ئەو وێنانەش كە نەتناردوون تۆماربكە. لە لیستەكەدا شوێنو مێژووی گرتنی وێنەكان بنووسە. بۆ هەریەكەیان ژمارەیەكی تایبەت دابنێ بۆ ئەوەی پاشتر گەر بە بەدوایاندا گەڕایت بە ئاسانی بیاندۆزیتەوە. ئەو وێنانە دەبنە بەشێك لە ئەرشیفی تۆ، بۆیە باشتر وایە هەر لە سەرتاوە پۆلێنیان بكەی. هەوڵبدە لەسەر وێنەكە هیچ شتێك نەنووسیت، بەڵام ژمارەیان لێبدە، دەتوانیت بۆ ئەو مەبەستە ئەو ژمارانەی لێبدەی پێشتر لە شێوەی چەسپ بە كۆمپیوتەر ئامادەكراونو زۆریش گران نین. دەكرێت لە ڕێگەی كۆمپیوتەرەكەی خۆتەوە ئەوكارە بكەیت. دەتوانی لە سەرئەو چەسپانەدا جگە لە ژمارەكە، ناوو ژمارە تەلەفۆنی خۆتو ئادرەسەكەشت بنووسیت. ئەگەر فیلمەكە هی خۆت بوو ئەوا هەر خۆت

خاوەنی وێنەکانی.

بۆ ناردنی سلایدەکان دەتوانیت پاکەتی تایبەت بکڕیت‌و سلایدەکانتی تێبکەیت، بۆ ئەوەی زیانیان لێنەکەوێت. گەر سلایدەکانت زۆر بوون ئەوا بیانخەرە ناو پاکەتێکی گەورەترەوە کە تایبەتە بەو مەبەستە.

باشتروایە بە پۆستەی تایبەت وێنەکانت بنێریت، چونکە گەر ون بوون ئەوا دەتوانیت بەدوایدا بگەڕێیت. گەر ویستت وێنەکانت بۆ بگەڕێتەوە، بە تایبەت گەر لە دەرەوەی وڵات بوو. کارێکی باش دەکەیت ئەگەر خەرجی گەڕانەوەکەی لە گەڵدا بنێریت.

پێش داخستنی پاکەتی نامەکەت لە بیرت نەچێت کە:

نامەیەکی کورت بنووسیت‌و هۆی ناردنی وێنەکانی تێدا روون بکەیتەوە.

هەواڵەکە راستەوخۆ بۆ سەرۆکی بەشی هەواڵ بنێرە، نەك سەرۆکی بەشی وێنە، وێنەکانیش بۆ بەشی وێنە.

لیستێك ئامادەبکە بۆ تۆمارکردنی زانیاری تەواو سەبارەت بە ناوەڕۆك‌و شوێنی هەر وێنەیەك، بۆ نموونە *(ژمارە ٢ ئەسپی سپی لە ئەستەبڵی* یاریگا).

بەم جۆرە سەرۆکی بەشی وێنە کاتێك پاکەتەکە دەکاتەوە دەتوانێت راستەوخۆ وێنەکان بناسێتەوە. ئەم هەنگاوە ئەو تێبینییە لای رۆژنامەکە درووستدەکات کەوا شارەزاییت لە کارەکەتدا زۆر زۆرە. هیچ کاتێك سلایدو نێگەتیڤی وێنەکان لە ناو جلدە پلاستیکیەکانەدا مەنێرە بۆ رۆژنامە، چونکە ئەگەری کەوتنیان هەیە. جگە لەوە لە کاری ئەرشیفکردنیاندا کێشە درووست دەکات. گەر لەپاکەتی پلاستیکی تایبەتدا هەڵیانبگریت، سەرۆکی بەشی وێنە دەتوانێت بە ئاسانی لە جێگەیەکدا دایانبنێت‌و لە کاتی پێویستدا سوودیان لێوەربگرێت.

شێوازێکی دیکەی ناردنی وێنە ئەوەیە لە سەر CD کۆپی بکەیت، گەر لە ماڵەوە سکانەرێکت هەبێت ئەو کارەت زۆر بەئاسانی بۆ دەکرێت. پێش ناردنی وێنەکە بەم شێوازە پرسێك بە سەرۆکی بەشی وێنە بکە.

## مافی خاوەندارێتیی بەرهەم:

ئاشکرایە مافی خاوەندارێتی وێنە بۆ وێنەگرە، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت وێنەگر بۆ رۆژنامەیەك یان ئاژانسێك کاربکاتو مانگانە وەربگرێت. لەو وڵاتانەی یاسای تایبەتییان بە کۆپی رایت کردن هەیە، مافی خاوەندارێتی وێنە تا کەسەکە لە ژیاندا بێتو تەنانەت پاش پەنجا ساڵ دوای مردنیشی پارێزراوە، واتە منداڵو نەوەکانی ئەو مافەیان وەك میراتی بۆ دەمێنێتەوە.

وێنەگرانیش وەك نووسەران سەبارەت بە مافی خاوەندارێتی، دەبێت ئاگایان لە ئەرکەکانی خۆیان بێت.

وێنەگرانی ئازادیش وەکو نووسەرە ئازادەکان مافی خاوەندارێتییان هەیەو دەبێت لەکاتی وتوێژکردن بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان ئەو مەسەلەیە لە گەڵ لایەنی بەرامبەردا باس بکەن.

گرێبەستەکە دەبێت بە نووسراو بێتو هەردوولا ئیمزای بکەن.

وێنەگر ئەو مافەی هەیە گەر جارێکی دی وێنەکە بڵاوکرایەوە لە بەرامبەر ئەو بڵاوکردنەوەیە بڕێك پارە وەربگرێت.

دەبێت لە کاتی بڵاوکردنەوەی وێنەکەدا ناوی وێنەگرەکە بنووسرێت.

لە بەر ئەوەی بە شێوەیەکی ئازاد وێنە دەگریت، ئیمتیازی خاوەندارێتی بۆ تۆیە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە خۆت بۆ کەسانی دی دەست بەرداری دەبیت. لەوانەیە بە رێکەوت وێنەی رووداوێك بگریتو دواتر ئەو رووداوە

ببێتە ڕووداوێکی مێژوویی. ئاژانسەکانی دەنگوباس پارەیەکی زۆر دەدەن بەو وێنانەو دەیفرۆشنەوە بە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن. بۆ نموونە هێشتا وێنەکانی -کەنەدی- (سەرۆك کۆماری پێشووتری ئەمریکا)و (ڕوخانی دیواری بەرلین) وەك دوو ڕووداوی مێژوویی لە بڵاوکراوەکاندا چاپ دەکرێن. هەر بۆیە خواست لە سەریان زۆرە. گەر بڕیارتدا خاوەندارێتیی وێنەکە تەنها بۆ بڵاوکراوەکە بێت، لە گرێبەستەکەدا ئەوە بنووسە. ئەگەر هاتوو وێنەکە لە هەر بڵاوکراوەیەکی دیکەی جیهانییدا چاپ کرا، دەبێ بڕێك پارە بە تۆ بدرێت.

پێش ڕێکەوتن لە گەڵ کڕیارەکاندا، ئەوەیان بۆ ڕوونبکەرەوە مافی خاوەندارێتی بۆ تۆیە، گەر مافی خاوەندارێتیت دابەوان ئەوا لە کاتی دووبارە چاپکردنەوەی وێنەکاندا هیچت پێنادرێت.

لە بیرت نەچێت نوسخەیەکی دیکەی وێنەکە یان نێگەتیڤەکەی لای خۆت هەڵبگرە. چونکە لە کاتی سەرهەڵدانی کێشە لە دادگا لە سەر مافی خاوەندارێتیی پێویستت پێی دەبێت.

## وێنەگرتنی خەڵك و شوێن:

بە پێی بنەما ئەخلاقیو عورفییەکانی بریتانیا ئازادیت وێنەی خەڵكو شوێنە گشتییەکان بگریت، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش گەر ئاگات لە خۆت نەبێت لەوانەیە کەسێك لەم کارەی تۆ بێزار بێت. بۆیە هەوڵبدە لە هەلومەرجە ئاساییەکاندا مۆڵەت لە کەسەکان وەربگریت. زۆربەی خەڵکی بە ڕوویەکی کراوەوە پێشوازیی لە داخوازییەکەت دەکەن.

لە کاتە نائاساییەکانی وەك شەڕو مانگرتنو ئاژاوەکاندا هەوڵبدە

هۆشیارانە هەڵسوکەوت بکەیتو ئاگات لە پشتەوەی خۆت بێت. لەوانەیە هەندێك کەس بە سیخوڕت بزانن‌و پێیان وابێت حکومەت تۆی خزاندووتە ناویانەوە. هەندێك جار هەر لەبەر ئەوەی پەیامنێریت دەکەویتە بەر هەڕەشەوە. لە هەندێك وڵاتدا وێنەگرتنی خەڵکی کوچەو کۆڵانەکان بە شێوەیەکی نهێنیی، مەترسییەکەی زیاترە لە شوێنەکانی دی. هەردەم ڕەچاوی بواری کولتوریو ئەخلاقی ئەو جێگەیە بکە کە وێنەی دەگریت. لە هەندێك وڵاتدا بە تایبەتی بە پێی یاساکانی بریتانیا، چوونەناو موڵکی خەڵکی دی بێ ڕەزامەندیی خاوەنەکەی، بە دەست درێژی کردن لە قەڵەم دەدرێت. وێنەگر تەنها لەو کاتەدا دەتوانێت وێنەی موڵکێکی تایبەت بگرێت کە لە شوێنێکی گشتیدا وەستا بێت.

لە بریتانیا وێنەگرتنی هەندێك بینا قەدەغەیە. لە شوێنی وەك دادگاو بینای حکومیو مۆزەخانەو کۆشکی ئەشرافەکان، وێنە گرتن قەدەغەکراوە. هەندێك جێگەی تر هەن لەوانەیە بە روونی قەدەغەکردنی وێنەگرتن ڕانەگەیەنرابێت، وەك خەستەخانەو فرۆکەخانەو هۆڵی شانۆ. سەربازگەکان حەساسترین جێگەن بۆ وێنەگرتن. لەوانەیە بەخۆت نەزانیو لەناکاو پۆلیس دەورتبگرن. لەکاتی پێویستدا ئەگەر هەر ناچاربیت وێنەی ئەو جێگایانەی باسمان لێوەکردن بگریت، دەبێت لە کەسێکی بەرپرس مۆڵەت وەربگریت. باشتروایە مۆڵەتەکەش بە نووسراو بێت. لە کۆتاییدا دەبێت بزانیت بۆ وێنەگرتنی پارەو پولی وڵاتەکان دەبێت لە وەزارەتی دارایی وڵاتەکە مۆڵەتی فەرمی وەربگریت.

فرۆشتنی وێنەکان:

پاش چاپ بوونی وێنەکانت لەبڵاوکراوەیەکدا ئەو مافەت هەیە هەمان وێنە بفرۆشیتە بڵاوکراوەیەکی دی. بەڵام بەو مەرجەی لەوە ئاگاداریان

بکەیتـەوە وێنەکەت پێـشتر لـە بڵاوکراوەیـەکی دیکـەدا بڵاوکراوەتـەوە. گـەر کوالێتی وێنەکانت باشـن دەتوانیـت بیفرۆشـیت بـەو کۆمپانیانـەی پۆسـکارت درووستدەکەن.

لەجیاتی ئەرشیفکردنی وێنەکان دەتوانیت بیانـدەیت بـە گۆڤارەکـان. بـۆ ئەو مەبەستە لە پێشدا نامەیەك بۆ گۆڤارەکـە ڕەوانـە بکـەو ڕوونکردنـەوەی تەواو لە سەر وێنەکان بنووسە. لە بیرت نـەچێ هەر وێنەیەك کە دەیفرۆشی مـافی خاوەنــدارێتیی خــۆت بپارێزیــت. گــەر وێنــەکانت لــەو گۆڤارانــەی گرێبەسـتت لـە گەڵیانـدا نـەکردووە بڵاوکرانـەوە، یـان زیـاتر لـەجارێك لـەو گۆڤارەی گرێبەستت لە گەڵیدا کردووە بڵاوکرایەوە، داوای مافی خۆت بکە.

# ٩

# فۆتۆژۆرنالیستی ئازاد

ئەم فەسڵە بە شێوەیەکی گشتی بۆ فۆتۆژورنالیستی ئازاد تەرخانکراوە. بەڵام بەشێکی زۆری بابەتەکەش باس لە پەیامنێریی ئازاد دەکات، وێنەگرتنی هەواڵ بە شێوەی سەربەخۆ بێت یان ئازاد تایبەتمەندی زۆری هەیەو ئەو هەلەت بۆ دەڕەخسێنێت بەدوای ئەو بابەتەی خۆت دەتەوێت بگەڕێیت. یان وێنەی ئەو جێگەی خۆت مەبەستتە بگریت. وێنەگرێکی ئازاد دەگرێت بە هەموو دونیادا بگەڕێت و وێنە بۆ بڵاوکراوەکان ئامادەبکات. مەرج نییە ئەو کەسە پسپۆر بێت لە وێنەگرتندا. فۆتۆژورنالیست دەتوانێت لە ڕێگەی خۆشەویستی بۆ کارەکەی و توانای درککردن و راوکردنی بابەتەوە، دەرامەتێکی زۆر بۆ خۆی دابینبکات.

پێشئەوەی خۆت بۆ سەفەری جێگە سەرنجڕاکێش و خۆشەکانی دونیا ئامادەبکەیت، بە باشی لە ڕووداوەکانی دەوروبەرت ورد بەرەوە: ئایا ڕۆژنامەو گۆڤاری لۆکاڵی وا هەن کەڵك لە کارەکانت وەرگرن؟ بێگومان پەیوەندیکردن بە سەرنووسەرەکان و خستنەڕووی کارەکانت شتێکی بە سوود دەبێت. ئەگەر نەتوانی یەکسەر بگەیتە ئەنجام، کارتی خۆ ناسینەکەتیان پێبدەو لە گەڵیاندا پەیوەندی مەبڕە. لەوە خۆشتر چییە فۆتۆژورنالیستێك نەتوانێت لە بۆنەیەکی تایبەتدا ئامادە بێت، ئەوە هەلێکی باشە تاکو تواناکانی خۆت دەربخەیت. بۆیە باشتروایە کامێراکەت لە گەڵ خۆتدا هەڵبگری بۆ ئەوەی گەر پێویستی کرد دەستبەکاربیت. لەوانەشە

فۆتۆژورنالیستەکان ئاگایان لە هەندێك ڕووداو نەبێت، یان نـەتوانن ئامـادەی ئـەو شـوێنە بـن، بۆیـە دەبێـت لـە گـەڵ خـەڵکانێکی زۆری ئـەو جێگەیـەدا پەیوەنـدی درووسـتبکەیت. تیپـەکانی شـانۆو ئـۆپرا سەرچـاوەیەکی باشـی هـەواڵن، ئـەوان نـەك هـەر وێنـەی کارەکانیـان بـۆ پۆسـتەرو ڕیکلام دەوێـت، بـەڵکو حـەز دەکـەن هەنـدێك وێنـەی خۆیـان وەك ئەرشـیفو بـۆ فرۆشـتن هــەبێت. لەراســتییدا لــەکاتی وێنــەگرتنی ئەکتەرەکانــدا، تــۆ وێنــەی ئەستێرەکانی ئاینده دەگریت.

بۆ فرۆشتنی ڕاپۆرتی وێنەیی دەبێت بتوانیت چەند وشەیەك بنووسیت. بۆ نموونە ناوی تەواوی ئەو ئەکتەرانەی ڕۆڵەکانیان بینیوە.

تەماشـکردنی هـەواڵو بەرنامـەکانی ڕادیـۆ شـێوازێکی باشـە بـۆ ئـەوەی ئاگـاداری ڕووداوەکـانی دەوروبـەرت بیـت. لـەوەش گـرنگتر ئەوەیـە سـەیری ڕۆژنامــە لۆکاڵییــەکان بکــەیت تــاکو بزانیــت زیــاتر حــەزیان لــە چ جــۆرە وێنەیەکە. بۆ نموونە وێنـەگرتنی بـەرێز"ئـەلف" لـە نـاو باخـچەکەیدا، بـەو پێیەی پێـشتر لـە ڕادیوێـدا سـەبارەت بـە باخـەوانی چاوپێکەوتنی لـە گەڵـدا کراوە، بابەتێکی باش نییە. وێنەی هـەواڵ دەبێـت لـە سـەر کـارە گـەورەکانی وەك پێـدانی خـەڵات، خـەڵکانی بـەتوانا، ڕووداوی سـەیر، تەمـەنی درێـژو کەسایەتی ناودار بێت. گرتنی وێنەی بەڕێز"ئەلف" لە کاتێکدا خۆی بە سەر بێڵەکەیداداوە وێنەیەکی هەواڵی نییە. ئەگـەر دەتـەوێت وێنەیـەکی بـاش بـۆ هەواڵێك بگریت، باشـتروایە وێنـەی باخەوانەکـە لـە تەنیـشت کوولەکەیـەکی زۆر گەورەدا بگریت. یان ئەو بێڵە نوێو تایبەتـە پیـشانبدە کـە باخەوانەکـە خۆی درووستی کردووە.

## له دەرەوەی کاتی کارکردندا:

با شەوانە کامێراکەت بۆ وێنەگرتن ئامادە بێت. هەواڵو رووداو گوێ بە کاتی دەوام نادەن. بۆیە دەبێت لەسەرپێ بیت بۆ ئەوەی بەکامێراکەت ئەو رووداوانە تۆمار بکەیت کە لە شەودا روودەدەن. بۆ نموونە پرۆسەی رزگارکردنی کەسێك لە کاتی درەنگە شەودا، یان ئەو پاسەی لە ژێر پردێکی بچووکدا گیری کردووە. رووداوەکە هەرچییەك بێت، گرنگ ئەوەیە رۆژنامەکان بەبەردەوامی پێویستییان بە وێنە هەیە.

کامێرای ئۆتۆماتیك بۆ وێنەگرتن لە کەشێکدا رووناکییەکەی کەم بێت، شتێکی چاکە، چونکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی رووناکییەکەی رێکدەخات. باشتروایە فیلمی رەنگاو رەنگو بە حەساسیەتی٢٠٠ بەکار بهێنیت.

## رووداوە نیشتمانیو نێونەتەوەییەکان:

هەندێجار هەواڵی گەرمو گرنگ بەدوای رۆژنامەواندا دەگەرێت. بەلام هەمووجارێك ئەوە روو نادات. گەر دەتەوێت سەر بکەیت بە بازارە گەورەکانداو هەواڵی گەرمی ناوخۆییو دەرەکیت دەستبکەوێت، دەبێت ئەو راستییە بزانیت دوورکەوتنەوە لە ناوچە لۆکاڵییەکانو چوون بۆ شارە گەورەکان، بریارێکی پەلەیە. بۆ نموونە لە شاری لەندەندا ژمارەیەکی زۆر وێنەگر هەن بەبەردەوامی بە دووی خەڵکی دەوڵەمەندو ناودارەوەن بۆ ئەوەی وێنەیەکی تایبەتییان بگرن. لەوانەشە لە تەنیشتتەوە وێنەگرێك تێپەرێتو بۆ وێنەگرتنی بابەتێکی گەرماوگەرم بەرەو شارەکەی تۆ بچێت تۆش پێی نەزانی. ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت " رووداوی گەورە لە شوێنە

گەورەکانـــدا ڕوودەدەن‌و ڕووداوە بـــچووکەکانیش هـــەردەم لـــە شـــوێنە بچووکەکاندا سەر هەڵدەدەن"، بۆچوونێکی تەواو هەڵەیـە. بـۆ نموونـە پـێش چەند ساڵێك لە شارێکی بچکۆلانەدا بە هۆی تەقینەوەی بەلەمێك دوو کەس گیانیـان لـە دەسـتدا. بانکێـك تـالانکراو خـاوەنی پێـشانگایەکی ئۆتۆمبیـل فرۆشتن بە چەند گوللەیـەك تیرۆرکـرا. دوو ڕووداوەکـەی سـەرەتا لـە دووری میلێکی چوارگۆشە لـە یـەکتر ڕوویانـداو پیـاوە کوژراوەکـەی ڕووداوی سـێیەم خاوەنی پێشانگایەکی ئۆتۆمبیل‌و فیتەرخانەیـەك بـوو. ئـەو ڕووداوەش هـەر لەو نزیکانەدا ڕوویدا کە دوو ڕووداوەکەی پێشووی تێدا قـەوما. هـەموو ئـەو ڕووداوانە لـە شـارێکدا بـوو پێـشینەی تـاوان‌و شەڕوشـۆڕی تێـدا نـەبووەو بـە ئارامی‌و هێمنی ناسراوە. وەك ڕۆژنامەنووسێك دەبێـت جـەخت لەسـەر ئـەو خاڵـە بکەیتـەوە ئـەم شـارە بـە دەگمـەن ڕووداوی تـاوانی بـە خـۆوە بینیـوە. چونکە ئەو مەسەلەیە تایبەتمەندییـەکی جیـاواز بـە بابەتەکە دەبەخشێت. وای دابنێ ئەم ڕووداوە لە شارەکەی تۆدا ڕوویداوە. لە ئەنجامدا تەلـەفۆن بـۆ بەڕێوەبـەری بەشـی وێنـەی ڕۆژنامەیـەك دەکـەیت‌و پێـشنازی ئـەوەی بـۆ دەکەیت سەبارەت بەو ڕووداوە ڕاپۆرتێکی وێنەیی تەواوی بۆ ئامادە بکـەیت. بە ڕای تۆ کاردانەوەی ئەو چۆن دەبێت؟

زۆرباشە، تکایە زۆر بەپەلە هەموو وێنەکانمان بۆ ڕەوانەبکە.

هێندە گرنگ نییە، ڕووداوی لەوجۆرە بەبەردەوامی لە شارە گەورەکانـدا ڕوودەدەن.

نیازتوایە لە چ گۆشەیەکەوە لەو ڕووداوە بکۆڵیتـەوە؟

گەر لایەنی بەرامبەر مەبەستی بێت کارەکەت ڕەتبکاتەوە، دوو ڕستەکەی دوایی دەڵێت. ئەگەری ئەوەش هەیە نە لەسەر ئەو ڕووداوەی تـۆ باسی لێوە دەکەیت زانیاری هەبێت‌و نە لەسەر شارەکەی تـۆ هیـچی بیـستبێت. ئەمـەش

لە بەرژەوەنـدی تۆدایـە، تایبەتمەنـدی ئـەم هەواڵـە لەوەدایـە لـە مـاوەی هەفتەیەکداو لە پانتایی یەك میلی چوارگۆشە، لە شارێکی بچووكو ئارام کە پێشتر شتی وای تێدا نەقەوماوە، سێ رووداوی دڵتەزێن روویداوە.جگە لـەوە ئـەم شـارە شـارێکی گەشـتیارییەو لـە سـەدەی رابـردوودا رۆڵێکـی کاریگـەری هـەبووە لـە هێنـانی گەشـتیاران بـۆ وڵاتەکـە. ئـەم مەسـەلەیەش لەوانەیـە بابەتێکی باش بێت بۆ راپۆرتە هەواڵێك لـە ژێـر نـاوی" جیهـان بـەرەو کـوێ دەچێت؟" تەنانەت دەکرێت بۆ هەواڵەکانی رۆژ بابەتێك لەسەر پەیمانەکانی حکومەت بۆ بنبڕکردنی تاوانی لێئامادەبکرێت.

بەڵام ئامادەکردنی راپۆرتێکی وێنەیی لە سەر ئـەم سـێ رووداوە کێشەی تایبەت بـە خـۆی هەیـە. هـیچ وێنەیـەکی وات لا نییـە دۆخەکە بهـەژێنێتو وێنەکان تەنها رووداوەکانی پاش تاوانەکان پیشاندەدەن:

*پۆلیـسەکان سـەرقاڵی پاککردنـەوەی شـوێنی تەقینـەوەی بەلەمەکـەن.*

*فیتەرخانەکەو بانکەکەش خاڵێکی ئەوتۆیان تێدا نییە سەرنج راکێش بێت.*

بـەڵام زنجیرەیـەك رووداوی سـەرنجڕاکێش روویانـداوە ناکرێـت وەك وێنـەگرێکی رۆژنامـەوانی چاوپۆشـی لەسـەر بکـەیت. بەتایبـەت هەرسـێ رووداوەکـە لـە نزیکـایی تـۆدا روویانـداوە. وێنـەگرێکی رۆژنامـەوانی بـاشو سـەرکەوتوو بـۆ ئـەوەی راپۆرتەکـەی خـۆی لـە رێگـەی وێنـەوە ئامادەبکـات پێویستە توانای بیرکردنەوەو خەیاڵی فراوانی هەبێت. هەرچەندە ناتوانیـت ئـەو رووداوانـەی تێپـەڕیون بگێڕیتـەوە بـۆ دواوە. بـەڵام دەتوانیـت داوا لـە فەرمانبەرانی بانکەکە بکەیت لە ناو بانکەکەدا وێنەیان بگریت. یـان وێنـەی بەلـەمێك بگریـت لـەو بەلەمـە بـچێت کـە تەقیوەتـەوە، یـاخود هەوڵبـدەیت وێنەیەکی پێشووی ئەو بەلەمەی تەقیوەتەوە پەیدا بکەیت. پرسو گەڕانێك لە دەوروبەری شوێنی بەلەمەکە لەوانەیە سوودبەخش بێت. بەڵام بنەماڵەی

قوربانیـــانی ڕووداوەکـــە بـــە هـــۆی گاریگـــەریی ڕووداوەکـــەوە لـــە ڕووی دەروونییەوە هیلاکن، بۆیە ناکرێت هەوڵی ئـەوە بـدەیت وتووێـژیان لەگەڵدا بکەیت.

چـەند وێنەیـەکی دەرەوەی پێـشانگای فرۆشـتنی ئۆتومبیلەکـە بگـرە، لەوانەیە بتوانیت لـە ڕێگەی هاوێنەیەکی وایـدەوە وێنەیـەکی "بانـك"ەکەو ئـەو شـوێنەی بەلەمەکـەی تێـدا وەسـتابوو بگریـت. بـەم جـۆرە دەکرێـت وێنەیـەکی ئاوێتـەیی لـە هـەر سـێ شـوێنی ڕووداوەکـان بگریـت. باشـتروایە نەخـشەیەك هاوپێچ بکـەیت نزیکی شـوێنی هـەر سـێ ڕووداوەکە دەربخـات. ڕۆژنامەکە دەتوانێت بە بەرنامەیەکی گرافیکی نەخشەکەی تۆ سەر لـە نـوێ درووستبکاتەوە.

پێویستە بۆ بەستنەوەی وێنەکان بە یەکترەوە تێکستێك بنووسیت. بەڵام پێویست ناکات ڕوونکردنەوەکانت دوورو درێژ بن. تەنها ئەوە ڕوون بکەرەوە چـی ڕوویـداوەو پەیوەنـدیی ڕووداوە یـەك لـە دوای یەکـەکانو لایەنـە سەرسـوڕهێنەرەکانی بخـەرەڕوو. باسـی شـارەکەو مێـژووی ڕووداوەکـانو کاردانەوەی خەڵك بۆ ڕووداوەکە بخـەرەڕوو. نووسـینی مانـشێت لـە ئەسـتۆی تۆدا نییە، ئەوە بۆ ئەو کەسە جێ بهێڵە کە بە بابەتەکەدا دەچێتەوە.

کاری ڕۆژنامەنووسێکی ئازاد بەو ڕادەیە سادە نییـە ڕۆژنامەنووسێك لـە ڕۆژنامەیەکـدا کاردەکـات، بـە تـەنها ئـەوە بـەس نییـە بـە دوای بابـەتو ئامادەکردنی هەواڵدا بگەڕێیت. هەرچەندە ئەو کارەش تا ڕادەیـەك سـەختە. ڕۆژنامەنووسـێکی ئـازاد گـەر دەیـەوێت ڕاپۆرتێـك ئامادەبکـات کڕیـارو خوێنەری هەبێت، دەبێت بە تەواوەتی درکی بە گرنگیی هەواڵەکە کردبێـت. بۆ ئـەوەی بتوانێـت ئاژانـسەکانی دەنگوبـاسو ئـەو سەرنووسـەرانەی درەنـگ باوەڕ دەکەن ڕازی بکات ڕاپۆرتەکەی ئەوە دەهێنێت بڵاو بکرێتـەوە، چونکە

ئەوانیش دەبێت لای خۆیانەوە راپۆرتەکان بە خوێنەران بفرۆشن.

توانای کەسایەتی بۆ دۆزینەوەی بابەتی سەرنجڕاکێش‌و درووستکردنی پەیوەندیی لە نێوان بلاوکراوە هەمەجۆرەکان‌و دۆزینەوەی لایەنە جیاجیاکانی رووداوێك گرنگییەکی زۆری هەیە. گەر ریپۆرتەر بیەوێت سەربەخۆیانەو بە پێی ویستی خۆی کاربکات دەبێت توانای دەستپێشخەریی هەبێت‌و لە دۆزینەوەی ئەو بابەتانەی لایەنی هەواڵییان تێدایە شارەزا بێت. بۆ نموونە چیرۆکی کەروێشکێکی زل‌و ترسناك کە وەك سەگی پاسەوان رەفتار دەکات‌و مولکی خاوەنەکەی دەپارێزێت بابەتێکی لۆکاڵی‌و کەم بایەخە، مەگەر رۆژنامەنووسەکە بتوانێت ماجەرایەکی گەورەی لێدرووست بکات. ئەو رۆژنامانەی بچووکن زیاتر بە دوای ئەو هەواڵانەدا دەگەرێن، بەلام رۆژنامە گەورەو جیدییەکان گرنگی بەو بابەتانە نادەن.

نابێت ئەو هەواڵ‌و رووداوانەی زیاتر لۆکاڵین لە رۆژنامە سەرتاسەرییەکاندا بلاوبکرێنەوە. بەلام دۆزینەوەی ئەوەی کام بابەت بۆ رۆژنامەی لۆکاڵی دەشێت‌و کام بابەت بۆ رۆژنامەی سەرتاسەری، کارێکی ئاسان نییە. چونکە لەوانەیە رۆژنامەکان سیاسەتێکی سەقامگیرییان نەبێت. بۆ نموونە لەوانەیە چیرۆکی کەروێشکە درەکە بۆ رۆژنامەیەکی سەرتاسەری جێگەی گرنگی پێدان بێت، بەلام رووداوی سوتانی تانکەرێکی زۆر گەورەی نەوت هەلگر بە لایەوە ئاسایی بێت.

بۆیە وا باشترە کاتێك لە گەڵ رۆژنامەیەکی نیشتمانییدا کار دەکەیت، بەیانیان زوو بە تەلەفۆن لە رووداوە گرنگەکانی ناوچەکە ئاگادارییان بکەیتەوە. لەوانەیە بەرێوەبەرانی رۆژنامەکە رووداوێکیان پێباش بێت‌و تۆش بە ئاسانی بتوانیت راپۆرتی لە سەر ئامادەبکەیت. فۆتۆژورنالیستێك باش دەتوانێت بۆ فرۆشتنی بابەتەکانی خۆی تەنانەت بازاری

نێونەتەوەییش لە بەرچاو بگرێت. پشتگوێخستنی بازاڕی نێونەتەوەیی‌و پشتبەستن بە بازاڕی ناوخۆیی کارێکی زۆر هەڵەیە. چیرۆکی کەروێشکە دڕەکە لەوانەیە جگە لە بڵاوکراوە ناوخۆییەکان سەرنجی بڵاوکراوە بیانییەکانیش رابکێشێت. هەمووکەسێك حەزی لە گۆشتی کەروێشکە بە تایبەتی گەر خاوەنی هەڵسوکەوتێکی تایبەت بێت. لەوەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە سووتانی تانکەرە نەوت هەڵگرەکە سەرنجی رۆژنامەکانی دەرەوە زیاتر لە رۆژنامە ناوخۆییەکان رابکێشێت، بە تایبەت رۆژنامەکانی ئەو وڵاتەی خاوەنی تانکەرەکەیە.

## ئاژانسەکانی دەنگ وباس و وێنە:

گومان لەوەدا نییە پەیوەندیکردن لە گەڵ هەموو بڵاوکراوە نێونەتەوەیەکاندا جگە لەوەی کاتت لێدەگرێت، خەرجییەکی زۆریشی تێدەچێت، لەوەش زیاتر کێشەی زمانیشت دێتە رێ‌و پەیوەندی کردنەکەت دژوارتر دەبێت. بۆیە دەکرێت ئەو کارە لە رێگەی ئاژانسەکانی دەنگوباس‌و وێنەوە بکەیت. لە هەمانکاتدا بەرژەوەندی ئەو ئاژانسانە لەوەدایە راپۆرتە هەواڵ‌و وێنەی باش بخەنە بەردەست بڵاوکراوە جیاجیاکان. بۆیە پەیوەندییان پێوە بکە. هەوڵبدە سەبارەت بە کارەکانت رونکردنەوەیان پێبدەیت‌و باشترین وێنەیان بۆ رەوانەبکەیت‌و لە گەڵ ئەو کەسانەی بۆ ئەو ئاژانسانە کاردەکەن پەیوەندی دروست بکەیت. چونکە ئەو کەسانە دەتوانن وێنەکانت لە بڵاوکراوەکانی جیهاندا بڵاوبکەنەوە. لەوانەشە ئەوان پەیوەندیت پێوە بکەن‌و داوات لێبکەن کاری بەردەوامیان بۆ بکەیت. ئەوەش هەلێکی باشە بۆ ئەوەی کارێك پەیدا بکەیت‌و دەرامەتێکی باشت دەستبکەوێت.

## گەیاندنی وێنەکان:

ئەگەر وێنەکانت دەگمەن‌و تایبەتمەندبن، هەندێك رۆژنامە بۆ وەرگرتنی فیلمە چاپنەکراوەکەت کەسێك دەنێرنە لات تاکو فیلمەکەت لی وەربگرێت‌و بۆ خۆیان فیلمەکە دەشۆنەوە. بەلام بۆ ئەم کارە دەبێت سەرنووسەرەکەت قەناعەت پێکردبێت کەوا وێنەکەی تۆ بێ وێنەیە. ئەگەر لە مالەوە خۆت فیلمەکانت ناشۆیتەوە، باشتر وایە بیبەیتە نزیکترین تاقیگە. زۆربەی فۆتۆژورنالیستەکان لە مالەوە خۆیان فیلمەکانیان بە قەبارەی ٢٥ X٢٠ دەدەنە رۆژنامەکان، ( ئێستا بەهۆی بوونی کامێرای دیجیتال پێویست بە شتنەوەی فیلم ناکات‌و دەکرێت لە رێگەی ئینتەرنێتەوە بە خێراترین کات‌و ئاسانترین شێوە رەوانەی رۆژنامەکان بکرێت). دەبێت لە گەل هەموو وێنەیەکدا بابەتێك هەبێت و ناوی کەس‌و شوێن‌و کاتی وێنەگرتنەکە تۆمارکرابێت. لێرەدا ئەو وێنەگرەی توانای نووسینی هەیە جیادەکرێتەوە لەو وێنەگرەی ئەو توانایەی نییە. بەلام گەر وێنەکە تایبەت بێت بە رووداوێکی گەرماوگەرم، ئەوکات وێنەکە گرنگی زیاتر دەبێت لە نووسینەکە. دەکرێت روونکردنەوە لە سەر وێنەکە لە رێگەی ئیمەیل یان تەلەفۆن یان فاکسەوە بۆ سەرنووسەر رەوانە بکرێت.

## وێنەیەك نرخەکەی چەندە؟

ئەگەر لە فۆتۆژورنالیستەکان ئەم پرسیارە بکەیت پێتدەلێن رۆژنامەکان بۆ وێنەی بەنرخ پارەی باشت دەدەنێ. ئەو وێنەگرەی بۆ دەستکەوتنی پارەی زیاتر لە گەل رۆژنامەکاندا پێدادەگرێت‌و رۆژنامەیەك لە رۆژنامەیەکی دی

بە پەسەندتر دەزانێت، زیان لە ناوبانگی خۆی دەدات و پەیوەندی خۆی لە گەڵ ڕۆژنامەکاندا تێکدەدات. لە بیرت نەچێت ئەوانەی لە ڕۆژنامەکاندا کاردەکەن پەیوەندییان لە گەڵ یەکتردا هەیە. لە بواری ڕاگەیاندندا تەنها لە ڕێگەی کاری چاك و پاکەوە ناوبانگ دەستدەکەوێت و تەماح و ڕژدی زیانی پێدەگەیەنێت. خاڵێکی دی ئەوەیە هەرگیز کارەکانت بە خۆڕایی نەخەیتە بەردەم هیچ ڕۆژنامەیەك. بۆ ئەنجامدانی کارەکانت ماندوو بوویت و کاتت خەرجکردووە، بۆیە دەبێت نرخی کارەکانت دەستبکەوێت.

## گۆڤارەکان:

لە سەرتاسەری دونیادا چەندین گۆڤاری هەمەرەنگ هەن، دەکرێت فۆتۆژورنالیستێك لە ڕێگەیانەوە پارەیەکی باشی دەستبکەوێت. چونکە زۆربەی لاپەڕەکانیان بە وێنەی ڕەنگاورەنگ ڕازاندووەتەوە. پانتاییەکی بەربلاو لە بەردەستدایە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی وێنەگرتن بشێت و پێویست بە گەڕان ناکات بە دوای ڕووداودا بگەڕێت. ئەوە هەلێکی زۆر باشە تاکو ئەو بابەتانەی بە دڵی خۆتە هەڵی بژێریت. چونکە هەر دەبێت لەملاو ئەولای دونیادا یەك دوو گۆڤارێك هەبن لە گەڵ زەوق و سەلیقەی تۆدا بگونجێن.

هەرچەندە زۆر جار سەرنووسەرەکان تەنها لەو وێنەگرانەی پێشتر دەیانناسن داوای وێنە دەکەن، بەڵام ئەوەت لە بیر نەچێت ئەو وێنەگرانەش ڕۆژگارێك پێویستییان بەوە هەبووە خۆیان بناسێنن. پێویستە تۆش هەمان ڕێگە بگریتەبەر بۆ ئەوەی کڕیار بۆ وێنەکانت بدۆزیتەوە. بەڵام وەك پێشتر وتمان نابێت کارەکانت بە خۆڕایی بدەیت بە خەڵك. هەر وێنەیەکت کە بڵاودەبێتەوە پێویستە نرخەکەی وەربگریت، گەر پێت نەدرا لە دادگا سکالا

بکه.

کاتێك ناچار بوویت سکاڵا بکەیتو ڕێگەی یاسا بگریتەبەر، بیرت نەچێت تۆ یەکەم وێنەگر نیت ئەو ڕێگەیە دەگریتەبەرو بە دڵنیایشەوە دووایین کەس نابیت. درێژەی ئەو باسە لە کۆتایی ئەم بەشەدا لە ژێر ناوی "پاداشت" هاتووە، گۆڤارەکان کەڵك لە دوو جۆرە وێنە وەردەگرن: یەکەمیان ئەو وێنانەن کە تایبەتن بە بابەتێکی تایبەتو تەنها بۆ پڕکردنەوەی لاپەڕەکان بەکاردێن. بۆ نموونە وێنەی دیمەنی سرووشتیی، دووەمیان ئەو وێنانەن ڕووداوێکی تایبەت دەگێڕنەوە. ئاگاداربن لە هەردووحاڵەتەکەدا لە کاتی خویدا وێنەکان بگەیەننە گۆڤارەکە، ئەگەر ویستتان باس لە پایز بکەن، ئاگادار بن با ڕەنگەکان پایزیی بن. بۆ نموونە وێنەی دارێك گەڵاکانی ڕەنگیان نارنجیو مەیلەو سوورو زەوییەك کە وەرد بڕا بێت بگرن. بەلام ناتوانیت ئەو وێنانە لە هەمان پایزدا بلاوبکەیتەوە، چونکە گۆڤارەکان پێش چەند مانگێك نەخشەسازییان بۆ کراوە. پێویستە بابەتی پایزیی پێش چەند مانگێك بگەیەنیتە گۆڤارەکە. لە حاڵەتێکدا گۆڤارەکە هەفتانە یان مانگانە یان وەرزی بێت ئەو مەسەلەیە دەگۆڕێت. باشتروایە سێ چوار مانگ پێشتر پێشنیازەکانتان بخەنە بەردەستی سەرنووسەر.

ڕاپۆرتە وەرزییەکان دەبێت ساڵێك پێشتر بەرنامەیان بۆ دابڕێژیت. وێنەی زستانی ئایندە هەر لە ئێستاوە ئامادەبکە. بەلام ئاگات لەوە بێت ئەو بابەتەی دەیگریت بۆ ساڵی ئایندە بشێتو کۆن نەبێت. بۆ نموونە ریستۆرانتێکی کۆنو جوان کەوتووەتە سەر جادەوە و ساڵی پار وێنەت گرتووە، لەوانەیە ئەم ساڵ ئاگری تێبەر بووبێت یان بە هۆیەك لە هۆکان داخرابێت، سەرنووسەرەکان زۆر لەوە تووڕە دەبن کاتێك خوێنەرێك تەلەفۆنیان بۆ دەکات بە تووڕەییەوە پێیاندەڵێت ئەو ریستۆرانتەی تۆ باست

کــردووە لــە پــشووی هەفتــەدا بــۆی چــووم لــەوێ نــەمابوو. زۆربــەی سەرنووســەرەکان دڵنییــان لــە وێنــەگرو ڕیپۆرتــەرەکان، ئــەوان پێیانوایــە ڕاپۆرتەکـەت بـە تـەواوی لـە جێگـەی خۆیدایـەو بارودۆخەکـە بـە هـەمان شێوەیە کە تۆ وێنەت گرتووە.

داهێنــانو کــاری جــوان گرنگییــەکی زۆری هەیــە. پێویــستە کارەکانــت هێندەش نوێگەراییان تێدا نەبێت لە گەڵ ستایلەکانی گۆڤارەکەدا نەگونجێن. گۆڤارەکە لەبەرچاو بگرنو ئەو بابەتانە هەڵبـژێرن کە لـە گـەڵ گۆڤارەکـەدا دەگونجێن. وێنەگر دەبێت داهێنەر بێتو بابەتی نوێ بدۆزێتەوە.

بـۆ ئـەو گۆڤارانـەی کـە تایبەتمەنـد نـین پەخـشی ڕوونـاکیو سـێبەر لـە وێنەکاندا زۆر مایەی گرنگیپێدان نیین. بەڵام لەم حاڵەتەشدا چەند شـتێکی جیاواز هەن، هەندێك حاڵەت هەن گۆڤاری دەزگایەك یان گۆڤارێکی بازرگانی بابەتێك قەبوڵ دەکات لە گەڵ سیاسەتی خۆیدا یەك ناگرێتـەوە. بـۆ نموونـە دەشـێت گۆڤـاری مامۆسـتایان وێنـەی شـاخەوانەکان بڵاوبکاتـەوە، لەوانەشـە گۆڤارێکی تایبەت بە بیناسازی وێنەی مانگگیران بڵاوکاتەوە.

لە کاتی وێنەگرتنی دیمەنو سرووشتدا هەوڵبدە وێنەی دیمەنێك بگریـت پێشتر کەس نەیگرتبێت. بۆ نموونە وێنـەی یانـەو ریـستۆرانتەکان کڕیاریـان نییە، بەڵام وێنەی بینا مێـژووییو کۆنـەکان خواسـتی زۆریـان لـە سـەرە. لـە چاو نووسەرێکی ئازاددا فۆتۆژورنالیستێك زەمینـەی کارکردنـەکی فـراوانترە. وێنەکان پێویستییان بە وەرگێڕان نییەو ئەو گۆڤارانـەی بـە زمـانی جیاجیـا بڵاو دەبنەوە دەتوانن بیـانکڕن. جگـە لـەوە بابەتـەکانی وێنـەگرتن زۆرتـرن. دەکرێت وێنەی شوێنی تەلەفۆنە گشتییەکان بگریـت، تادەگاتـە گڵۆپـە کۆنو سەرەتاییەکانی سەدەی ڕابردوو. هەموو شـتەکانی سـەر زەوی دەکرێـت ببنـە بابەتێکی وێنەیی.

## پەیوەندی بە سەرنووسەرەوە:

بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەیت بە سەرنووسەری گۆڤارێکەوە باشترین شت ئەوەیە نامەیەکی بۆ بنووسیتو خۆتو کارەکانتی پی بناسێنیت. لەم کاتەدا نوسخەی یەکەمی وێنەکانتی بۆ مەنێرە، دەتوانیت وێنەیەکی رەنگاورەنگی بچووکی وەك نموونە بۆ رەوانەبکەیت. ئەگەر کومپیوتەرەکەت پرنتەری رەنگاورەنگی پێوەیە باشترین وێنەکانت لە سەر کاغەزی A4 پرێنت بکە. دواتر کاتێك ئاشنایەتیت لە گەڵ کارمەندانی گۆڤارەکە پەیدا کرد، دەتوانیت بۆچوونەکانی خۆتیان بۆ باسبکەیت.

## گرێبەست:

پێشئەوەی لە سەر بودجەی شەخسی خۆت برۆیت بۆ راپەڕاندنی کارێك، بە تایبەتی بەرلەوەی وێنەکانت بدەی بە گۆڤارەکە، ئەگەرکرا لە گەڵ بڵاوکراوەکەدا گرێبەستێك بکەیت، ئەو گرێبەستە بریتییە لە وەرگرتنی برێك پارە لە بری چاپکردنی ژمارەیەك وێنە لە گۆڤارەکەدا. ئەگەر وێنەکانت بە بێ بەرنامەو گرێبەستی پێشووتر رەوانەبکەیت بۆ گۆڤارەکە. ناتوانیت دواتر داوای گرێبەست بکەیت. بەڵام داوا بکە گرێبەستەکە بە شێوەی نووسراو بێت، دەکرێت لە رێگەی ئیمەیلەوە گرێبەستەکەت بۆ رەوانەبکەن.

ئەگەر پێتوایە ئەم داوایەی تۆ بۆ کەسێك تازەبە کە تازە دەستی بە کاری وێنەگریی کردووە ، شتێکی بێئەدەبیانەیە، پێیان بڵێ لەم رێگەوە دەمەوێ کارەکانم رێکبخەم. گرێبەست هەردوولا ناچاردەکات ئەرکەکانیان لە

کاتی خۆیدا ئەنجامبدەن. گەر گرێبەستت نەبێت لەوانەیە دواتر لە گەل ئەو سەرنووسەرانەی بڕوبیانوو دەهێننەوە تووشی کێشە ببیت.

پێش ناردنی وێنەکان پشتگیرییەکی نووسراوی ئەوان وەربگرە. لەوانەیە گۆڤارێك بۆ چاپکردنی وێنەکانت لە گەڵتدا بگاتە ڕێکەوتن، بەڵام دواتر بەبێ ئاگادارکردنەوەی تۆ گرێبەستەکە هەڵوەشێنێتەوە. هەندێجار ڕوودەدات پاش لادانی سەرنووسەرێك، هیچ کام لە بابەتو وێنەکانی پێشوو بڵاو ناکرێنەوە.

## بەهای کارەکانت:

لە کاتی گرێبەستەکەدا سەبارەت بە بەهای کارەکانت لە گەڵ سەرنووسەرەکەدا قسە بکە. تەنانەت ئەگەر ئەوە یەکەمین پاداشتی کارەکانت بێت. هەر دەبێت مەسەلەکە باس بکەیت. بە هیچ شێوەیەك خۆت بە وێنەگرێکی سەرەتایی مەناسێنە. ئەوە بەو مانایە نییە درۆ بکەیت. کەس داوای شتی وا لە تۆ ناکات، تەنها ئەوە هەیە کارەکەت بەو شێوەی مەبەستتە بخەرە ڕوو. هیچ سەرنووسەرێك نازانێت ئەوە یەکەمین پاداشتی تۆیە، ئەگەر خۆت باسی نەکەیت.

لەکاتی وتووێژکردندا وا باوە داوات لێدەکەن خۆت بەهای وێنەکانت دیاریبکەیت، لەوانەیە سەرنووسەر پێیخۆش بێت بە خۆڕایی چەند وێنەیەك بخەیتە بەردەستی. نابێت هیچ مەسەلەیەك لە وتووێژەکانتاندا بە نهێنیو شاراوەیی بمێنێتەوە. دەبێت بپرسیت بۆ هەر وێنەیەك چەند دەدەنو چەند ڕۆژ پاش چاپبوونی وێنەکە بەهاکەی دەدەن؟ پێشئەوەی وتووێژ بکەیت پرسیاری ئەوە بکە بەهای ئاسایی وێنە لای ئەوان چەندەو

لەو نرخە کەمتر رازی نەبیت. گەر وا نەکەیت لە بەهای کارەکانی خۆت دادەبەزێنیتو دەبیتە هۆی ئەوەی هاوکارانی ترت بە سەختی بتوانن نرخی کارەکانیان دەستبکەوێت؛ بە تایبەتی لەکاتێکدا سەرنووسەرێك بیەوێت کەمترین پارە بۆ ئەو مەبەستە خەرجبکات.

بەهای وێنەکان بە پێی قەبارەی وێنەکانو ئەو لاپەڕەیەی تێدا بلاو دەکرێتەوە دەگۆڕێت. بۆنموونە ئەو وێنانەی لە نیو لاپەڕەدا بلاودەبنەوە نرخەکانیان جیاوازە لەو وێنانەی دوو لاپەڕە دەگرن، یان لە سەر بەرگ بلاو دەکرێنەوە. گەر نازانی داوای چەند بکەیت، لە گەڵ هاوکارانتدا راوێژ بکە.

لەراستیدا کاتێك وێنەیەك دەفرۆشیت، ئەو پارەیەی وەری دەگریت مافی یەك جار لە چاپدانی وێنەکەیە. گەر جارێکی دی لە چاپدرایەوە دەبێت دیسانەوە بەهاکەی وەربگریت. چونکە بۆ هەتا هەتایە ئەو وێنەیەیان لێنەکرِیوویت. تەنانەت گۆڤارەکەش ناتوانێت بە بێ رەزامەندیی تۆ وێنەکەت بدات یان بفرۆشێتە بلاوکراوەکانی دی. تۆش ئەو مافەت نییە وێنەکە بدەیت بە بلاوکراوەی دی. بەلام فرۆشتنی وێنەی هاوشێوەی ئەو وێنەیە کێشەی تێدا نییە.

## وەرگرتنی پاداشت:

لیستی هەموو ئەو وێنانەی ناردووتن لە گەڵ ناوی ئەو کەسو بلاوکراوەیەی وەریانگرتووە لای خۆت تۆمار بکە. پاش بلاوبوونەوەی وێنەکانت وەسڵی پارەکەی رەوانەبکە بۆ گۆڤارەکە. زۆربەی بلاوکراوەکان پاش وەرگرتنی وەسڵ پارەی پاداشتەکە دەنێرن. هەر بلاوکراوەیەك لە پێدانی پاداشت دواکەوت هاوکاریی مەکە. ئەگەری ئەوە هەیە بە هۆی

قەرزارییەوە هەندێك بڵاوكراوە نەتوانن پارەی پاداشتەکان بدەن. ئەگەر پاداشتەکەیان بۆ نەناردیت، ئاگاداریان بکەرەوەو مۆڵەتێکیان بۆ دیاری بکەو پێیان بڵێ ئەگەر پارەی پاداشتەکەت بۆ نەنێرن ناچاردەبیت لە دادگا سکاڵایان لەسەر تۆمار بکەیت. ئەو شێوە داواکردنە خەرجییەکەی کەمترە، چونکە ئەو کات ناچار نیت پارەی پارێزەرو دادگا بدەیت. بەڵام دەبێت گرێبەستو ئەو پەیمانەت لا بێت کە بڵاوكراوەکە بۆ پێدانی پاداشت لە بری وێنەکانت داوێتی. لێرەدا دەردەکەوێت گرێبەستێك کە ئیمزای خۆتو سەرنووسەری پێوە بێت چەند گرنگە.

بە وردی تەماشای بازاڕی بڵاوكراوەکان بکە، لە بیرت نەچێت هەندێك گۆڤار هەن تەمەنیان کورتەو زوو لە گۆڕەپانی ململانێ دەردەچنو ڕەنجو بەرهەمی کارمەندەکانی خۆیانو ئەوانەی گرێبەستیان لە گەڵدا کردوون بە خەسار دەدەن. دەرکردنی گۆڤارێك زۆر ئاسانترە لەدرێژە پێدانی لە گۆڕەپانی ململانێکاندا. ئەگەر پەلەتەو دەتەوێت وێنە بۆ گۆڤارێك بنێریت تازە دەرچووە، دەبێت چاوەڕێی ئەوەش بکەیت هیچت دەست ناکەوێت. تا دڵنیا نەبیت لەوەی ئەو گۆڤارە درێژەی دەبێتو سەرنووسەرەکەشی نرخی ڕاپۆرتو بابەتەکان دەزانێت، هیچ بابەتێکی خۆتی بۆ مەنێرە.

## دۆزینەوەی بازاڕ:

هەفتانە ئامانجەکانت دیاری بکەو ئەو وێنانەش جیابکەرەوە کە دەتەوێت بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی بنێریت. ئەگەر بڕیار وایە بابەتێکی تایبەت بۆ بڵاوكراوەیەك ئامادەبکەیت دەتوانیت وێنەی لایەنی دیکەی هەمان بابەت بۆ بڵاوكراوەکانی دی ڕەوانەبکەیت. بەڵام بەو مەرجەی بۆ

هەر بلاوكراوەيەك وێنە ئەسڵییەكان بنێریتو سەرنووسەرەكانیش لەو كارە ئاگادار بكەیتەوە. دەبێت هەموو ئەو وێنانەی دەیگریتو دەینێریت، لای خۆت تۆماریان بكەیت بۆ ئەوەی هیچ شتێكت لە بیر نەچێت.

هاوكات لە گەڵ پێشكەوتنەكانتدا بۆت دەردەكەوێت لە بابەتێكی دیاریكراودا شارەزاییت پەیدا كردووەو دەتوانیت وێنەی جیاجیای لە سەر ئامادە بكەیت. لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییانەی لە گەڵ كارمەندانی رۆژنامە لۆكاڵیو سەرتاسەرییەكاندا درووستی دەكەیت بە شێوەیەكی بەردەوام ئەركتان پێدەسپێرنو وردە وردە لە كاركردن لە گەڵ بلاوكراوەكانی دیكەدا دوور دەكەویتەوە، تا وایلێدێت وەك كارمەندێكی فەرمی رۆژنامەكە كار دەكەیت. بەلام سەرەرای ئەوەش مافەكانی كارمەندێكی فەرمی وەك سەرە مووچەو پاداشتو مۆڵەتی رەسمیت پێنادرێت. بۆیە باشتر وایە داوا بكەیت وەك كارمەندێكی فەرمی بە هەموو مافەكانتەوە دابمەزرێیت.

زۆربەی كارەكانت بۆ ئاژانسەكانو پەیوەندییە گشتییەكانە، چونكە ئەو دەزگایانە هەلی كاركردنی زۆر باش بۆ وێنەگران دەرەخسێنن. ئەگەر دەتەوێت لە گەڵ بەرێوەبەرایەتییەكی پەیوەندییە گشتییەكاندا كار بكەیت، پێویستە كامێرایەكی زۆر پێشكەوتوو بەهەموو كەرەستەكانییەوە بكرپیت. چونكە ئەو وێنانەی دەیانگریت، دەبێت زۆر نایاب بن. گەر دامەزرایت، پێویستە كامێرایەكی زۆر پێشكەوتووتر بكرپیت، بە تایبەت گەر بتەوێت وێنەكانت لاپەرەی یەكەمی گۆڤارەكان برازێننەوە.

ئەگەر كامێرایەكی نایاب بكرپیت، دەتوانیت وێنەكانت بۆ پوسكارتو رۆژمێرەكان بخەیتە روو، ئەو جۆرە كارانە پێویستیان بە ماندووبوون هەیە، بۆ سەركەوتن دەبێت خاوەن ئیرادەیەكی بەهێزو پشوویەكی درێژ بیت.

# ١٠

# فۆتۆژورنالیزم

*وێنە یەکەمین شتە کە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێت. خوێنەران بە زۆری لە سەر ئەوە راهاتوون چاو بە بابەت و وێنەکاندا بخشێنن، تا ئەو کاتەی مانای هاوبەشی هەردووکیان بدۆزنەوە.*

**(ویلسون هێکس ١٩٧٣)**

**بۆ یەکەمینجار فرانك لوترمان لە پەیمانگای پەیامنێریی سەربە زانکۆی *"میزۆری"* لە ساڵی ١٩٢٤ دەستەواژەی (photojournalism) ی بۆ ئەو کەسەی لە یەك کاتدا شارەزایی لە وێنەگرتنو کاری پەیامنێریدا هەیە داهێنا، ئێستا زۆرجار دەستەواژەی press photographer لە نێوان رۆژنامەوانانداا بەکاردێت، بەڵام هەمان واتای هەیە. فۆتۆژورنالیست جگە لەوەی ئەرکی وێنەگرتنی لە ئەستۆدایە، پێویستە سەبارەت بە وێنەکە روونکردنەوەی تەواو بداتو ناوی کەسو شوێنەکان بنووسێت.**

**دەڵێن بەهای وێنەیەك لە هەزار وشە زیاترە، چونکە دەکرێت بۆ گێڕانەوەی رووداوێك سوود لە وێنە وەربگیرێت. وێنەو تێکست هەریەکەیان لای خۆیەوە ئەویدیکەیان تەواو دەکەن. وەك دەبینین جۆرێك لە هاوبەشی لە نێوان (وێنە) و (تێکست)دا هەیە، هەریەکەیان بەڵگەن بۆ ئەوی دیکەیان. لە یەکەم نیگادا وێنەکان رەنگدانەوەی رووداوەکانن، بەڵام لەوانەیە یەك وێنە نەتوانێت هەموو راستییەکانی رووداوێك بخاتە روو، لە بەر چەندین هۆ، وێنەکان کەرەستەیەکی ئیدیاڵ نین بۆ تۆمارکردنی رووداوەکان. چونکە**

کامێرا ناتوانێت هەموو گۆشەنیگاکان بخاتەروو. جگە لەوە وێنەکان تەنها دوو ڕەهەنـد دەخەنـە ڕوو و تـەنها لـە گۆشـە نیگـای وێنەگرەکـەوە دیاریدەکرێن. فۆتۆژورنالیستەکان جەخت لە سەر ئەو وێنانە دەکەنەوە کە هەموو پانتایی ڕووداوێك پیشاندەدەن. وێنەی پانارۆمایی گرنگییەکی زۆری هەیەو هاوشێوەی Master shot یان نمای ئەسڵییە لە فیلمی سینەماییدا. ئەو وێنەیەی هەموو دیمەنەکە دەخاتە ڕوو، تەواوکەری ئەو وێنانەیە کە بەشـەکانی دیکـەی دیمەنەکـە پیـشاندەدەن. بـە هـۆی دڵتـەزێنی ڕووداوە ناخۆشەکانو بـوونی کوژراو و بریندارەوە، زۆرجار سەرنووسـەرەکان زیاتر حەزیان لەو وێنانەیە کە بە شێوەی پانۆرامایی گیراون. چونکە دەکرێت لە ڕێگەی وێنەیەکی لەو جۆرەوە وەڵامی زۆر لەو پرسیارانە بدرێتەوە کە لای خوێنەران درووست دەبن. وەك: *ڕووداوەکە لە کوێ ڕوویداوە؟ چەند کەس لەو ڕووداوەدا بەشداربوونو قەبارەی کارەساتەکە چەندە؟* وێنەیەکی پانۆرامایی تا ڕادەیەك لایەنەکانی کارەساتەکە دەخاتەڕوو.

زۆربەی فۆتۆژورنالیستەکان لە هەموو کاتێکدا کامێرایان پێیە، تەنانەت ئەو کاتانەش کە لەسەر کارەکەیاندا نین. ئەوە کارێکی زۆر باشە، چونکە ڕووداوەکان نەبەستراونەتە کاتو شوێنێکی دیاری کراووەو لەوانەیە لە هەر ساتێکدا ڕووبدەن. یەکەمین وێنەکانی تەقینەوەی گازینۆی "بریسکۆن" لە ساڵی ١٩٩٩ وێنەگرێك گرتی کە لەو نزیکانەدا خەریکی شتکڕین بوو، سەرەڕای بوونی ئەگەری تەقینەوەیەکی دی، کەچی ئەو توانی پێش هاتنی پیاوانی فریاکەوتن چەندین وێنەی جوانی دیمەنەکە بگرێت.سەرەڕای ئەوەش وێنەگری پیشەیەکی زۆر ورد نییەو تا وێنەکان دەرنەکەون ناکرێت بەکار بهێنرێن. *(بوونی کامێرای دیجیتاڵی ئەو کێشەیەی چارەسەرکردوە. وەرگێڕ)*، گرتنی وێنەی باش چەند بەندە بە شارەزاییو تواناو لیهاتوویی

وێنەگرەکەوە هێندەش پەیوەندی بە شانس و بەختەوە هەیە. لە کاتی ڕووداوی چاوەڕواننەکراودا وێنەگر ماوەی ئەوەی نییە گۆشەنیگای تایبەت دیاریبکات، پێویستە هەموو توانایەکی بخاتەگەڕ تاکو لە کاتی خویدا کاردانەوە پیشان بدات.

هەمیشە با فیلمێکی نوێ لە کامێراکەتدا هەبێت و ئەو فیلمەی بەشێکت لێگرتوە بەکاری مەهێنە. کامێرای بچووکی ئۆتۆماتیکی گونجاوترە، چونکە لەو کاتانەدا وێنەگر پێویستی بە ڕێکخستنی شەتەر و فلاش نییە.

بۆ ڕاپۆرتی ڕووداوێکی دڵتەزێن، پێویست ناکات وێنەی خوێن و تەرمی کوژراو بگریت، زۆربەی ڕۆژنامەو بلاوکراوەکان ئەو وێنانە بەکارناهێنن. زۆر جار لەو جێگەیەی خەڵکی تێدا دەکوژرێن یان بریندار دەبن، وێنەگرانیش ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوەو هێرشیان دەکرێتە سەر، لەو هەراو هوریاو هەلومەرجەی کە لە پاش کارەساتەکان درووستدەبن، گەر وێنەگرێك دەستبکات بە وێنەگرتنی کوژراو و بریندارەکان، لەوانەیە وا لە کەس و کارەکانیان یان شایەتحاڵەکان بکات هێرش بکەنە سەری، چونکە پێیانوایە لەو قەیرانەدا سوود لە دۆخەکە وردەگرێت و تەنها سەرقاڵی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەتی. بەڵام هەندێك جار ئەو شەڕە قسەو هەرایە دەبێتە هۆی ئەوەی بەهای هەواڵی وێنەکە زیاتر بێت.

***نموونەیەك:***

زۆربەی ڕۆژنامەکانی لەندەن کاتێك هەواڵی تەقینەوەکەی *"گازینۆی بریکستۆن"* یان بلاوکردەوە، وێنەیەکی ڕەش و سپی ئەو دوو پیاوەیان چاپکرد کە لە ناو شەقامە تەڕەکەدا سەرقاڵی یارمەتیدانی هاوڕێکەیان بوون. ئەوەی زیاتر وا دەکات ئەو وێنەیە تایبەتمەندی خۆی هەبێت ئەوەیە یەکێك لەو دوو پیاوە پەنجەی هەڕەشەی بەرەو کامێراکە درێژکردووە،

وێنەکـە بـە تـەواوی ئـەو حاڵـەتی تـوڕەیی‌و غەزەبـەی پـاش تەقینەوەکـە درووست بووە لە پەنجەکانی ئەو کابرایەو روخساریدا دەخاتە ڕوو.

رەش‌و سـپی بـوونی وێنەکـە هێنـدەی دی توندوتیـژی‌و واقعەکـەی دەرخستووە، جگە لەوە رەش‌و سپێتیی وێنەکە نەیهێشتووە رەنگی خوێنەکە بە زەقی دەربکەوێت. گەر وێنەکە رەنگاورەنگ بوایە، بـە هـۆی دڵتـەزێنی رووداوەکەوە بە کەڵکی بڵاوکردنەوە نەدەهات.لـە هەلومـەرجێکی وادا نابێت وێنـەگر داوای مۆڵـەتی وێنـەگرتن لـە کـەس بکـات. یـان پـاش وێنەگرتنەکـە پرسیاری ناو و تایبەتمەندییەکانیان بکات، بەڵکو دەبێت بە نهێنی‌و ئەسپایی پرسـیاری حـاڵی بریندارەکـە بکـات. بـەمجۆرە بـۆ ریپۆرتـەرێك بابـەتێك درووستدەبێت.

***نموونەیەکی دی:***

لە نۆڤەمبەری ١٩٩٩ یەکسەر پاش ئەوەی دوو شەمەندەفەری مـسافربەری لـە بریتانیـا لێکیانـدا، پـۆلیس ناوچـەیەکی قەدەغـەکراوی لـە چـواردەوری رووداوەکە بە بەرزایی ٢٠٠ مەتر درووستکرد بۆ ئـەوەی لـە ئاسمانـەوە کـەس وێنەی رووداوەکە نەگرێت. لەم حاڵەتانەدا نابێت رۆژنامەنووسـانیش بڕۆنـە ناو ناوچە قەدەغەکراوەکەوە، لە بەرئەوەی شوێنی رووداوەکـە لـە جادەکـەوە نابینـرێت، وێنەگرانی بڵاوکراوەکان بۆ بەدەسـتهێنانی وێنـەیەکی رووداوەکـە دەبوایـە لـە ئاسمانـەوە یـان لـە سـەر بینـا بەرزەکانـەوە وێنـە بگـرن. ئـەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە ماڵی وێنـەگرێك بـەناوی *"مـارکۆ دیـدا"* یـەکێك بـو لەو بینا بەرزانەی بە باشی دیمەنەکەی لێوە دەبینرا. بۆیـە تـوانی یەکـەمین وێنـەی ڤاگۆنـە وەرگـەڕاوەکانی شـەمەندەفەرەکەو ئـەو خەڵکـە بریندارانـەی لێیدەهاتنە دەرەوە بگرێت. پاشان تـوانی وێنـەکان لـە گـەڵ ئـەو وێنانـەی لـە ڤاتی تەنیشتی گیراون تێکەڵبکات‌و دیمـەنێکی گشتی رووداوەکـەی پـێ تـەواو

بکات. دوای ئەوە پەیوەندی کرد بە رۆژنامەی *"ئیفینینگ ستاندارد"* و بە پەلە وێنەکان چاپکران. ئەمجارەش ئەو وێنانەی لە پەنجەرەی ڤاتی بیناکەی خۆیەوە گرتبوونی و نمایەکی گشتیی ڕووداوەکەیان دەخستەڕوو، گرنگییەکی زۆری هەبوو. چونکە هەموو لایەکی ڕووداوەکەیان پیشاندەدا. وێنەکانی دی بریتی بوون لەو وێنانەی کارەکانی فریاکەوتن و گواستنەوەی برینداران و ئامبولانسیان پیشاندەدا. دەبێت هاوسەنگییەکی لۆژیکی لە نێوان وێنەکاندا هەبێت. خەڵك دەیانەوێت هەم قوڵایی کارەساتەکەو هەمیش ئەو دڵەڕاوکێ و ترس و تۆقینەی هەیە ببینن. بەڵام نابێت ڕێکخستنی وێنەکان و تێکستەکە ببێتە هۆی بێزارکردنی خەڵك، بۆیە وێنەکانی ئەو فریادرەسە ئازایانەی برینداەکانییان چارەسەر دەکردو ئەوانەی لە ڕووداوەکە بەسەلامەت دەرچوو بوون، دەتوانێت هەندێك لە ئازارەکانی ئاگرکەوتنەوەو دوکەڵ و ڤاگۆنە وەرگەڕاوەکانی ڕووداوەکە کەمبکاتەوە.

هەڵبەت مەبەستمان ئەوە نییە کە نابێت ئەو وێنانەی وردەکارییەکانی ڕووداوێك دەخەنەڕوو لە هیچ رۆژنامەیەکی دونیادا بڵاوبکرێنەوە. بۆ نموونە لە سریلانکا لە کاتی شەڕی ناوخۆدا، چەندین ساڵ رۆژنامەکان وێنەی رەنگاورەنگی لاشەی ئەوگەریلایانەی *"پڵنگەکانی تامیل"* کە لە گردەوەی خۆکوژیدا لە سەر شەقامەکان کەوتبوون، لە لاپەڕەی یەکەمدا بڵاو دەکردەوە. بەڵام چی وا لە رۆژنامەنووسەکان دەکات تا لە کاتی ئامادەکردنی ڕاپۆرت لە سەر جەنگ و ڕووداوەکاندا گوێ بە یاسا نەنووسراوەکان نەدەن؟

# جەنگی ڤێتنام:

زۆر لەو بڕیارە نەنوسراوانەی کە لەکاتی شەڕی ڤێتنامدا هاتنەئاراوە، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کاتانەی هەواڵی دەستێوەردانی سەربازی ئەمریکا لە ساڵانی ١٩٦٢- ١٩٧٥ لە ڕاگەیاندنەکاندا بڵاودەکرایەوە. لە شەڕی ڤێتنامدا بە شێوەیەکی سەیر هەواڵو وێنەی دڵتەزێن بڵاوکرایەوەو کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ سەر ڕایگشتی. یەکێك لەو وێنە کاریگەرانەی لە نێوان ئەو هەزاران وێنەیەی لە ساڵەکانی ١٩٦٢ – ١٩٧٥ بڵاوکرانەوە، وێنەی ئەو ڕاهیبە بودایيە بوو کە بۆ نارەزایی بەرامبەر شەڕەکە لە خۆپیشاندانێکداو لە سەر جادە خۆی سووتاند. هەروەها وێنەی ئیعدامکردنی پیاوێکی ڤیتنامی بە بەرچاوی خەڵکەوە لە ساڵی ١٩٦٩و کۆمەڵ کوژییەکەی *"مای لای"* هەروەها لە ساڵی ١٩٧٢ لە کۆتای جەنگەکەدا وێنەی ئەو کچەی دەموچاوی سووتابوو لە بەر بۆمبارانی ناپاڵمەوە بە ڕوتی لە سەرجادە ڕایدەکرد، کۆمەڵێك وێنەی دیکەی لە یاد نەچووی ئەو شەڕەن.

هەرچەندە لە تەلەفزیۆنەکانەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو وێنەو هەواڵی شەڕەکە بڵاودەکرایەوە، بەڵام ئەو وێنانەی لە ڕۆژنامەکانی سەرتاسەری دونیادا بڵاوکرانەوە زۆرترین کاریگەرییان هەبوو. فۆتۆژورنالیستەکان لە کاتی شەڕەکاندا سەختترینو بە دڵنیاییەوە ترسناکترین ئەرکیان لە سەرشانە. بەقسەی پەیامنێرە پرۆفیشناڵەکان ئامانجی پەیامنێرانی پسپۆڕ ئەوەیە ئازارو ڕەنجەکانی ئەوانەی بە شێوەیەك لە شێوەکان دەرگیری شەڕەکانن، بەڵام ڕاستەوخۆ ناجەنگن، تۆمار بکەن. ئەرکی فۆتۆژورنالیست ئەوەیە کۆمەڵێك وێنە بخاتەڕوو، کە نەهامەتییەکانی شەڕ پیشانبدات.

تەنانـەت پێـشئەوەی ئـەمریکا بـە تـەواوی گـیرۆدەی شـەڕەکە بێـت، ئاژانـسە جیاجیاکـانی هـەواڵ لـە ڤێتنامـەوە وێنـەی دڵتـەزێنیان لـە سـەر کاریگـەری شـەڕەکە لـە سـەر مەدەنییـەکان دەنـاردەوە بـۆ ئـەمریکاو لـە رۆژنامەکانـدا بڵاودەبوونـەوە. وێنەیـەك کـە بـۆ هەتاهەتایـە لـە یادەوەرییـدا دەمێنێتـەوە، وێنەی ئەو خۆسوتاندنی ئـەو راهیبـە بووکـە *"مالکوم بـراون"* گرتبـووی. کۆمـەڵێك وێنـەی ترسـناکی لـەو جـۆرە لـەماوەی سـاڵەکانی ١٩٦٢ و١٩٦٥ لـە رۆژنامـەکانی رۆژئـاوا بڵاوکرانـەوە. ئـەوەش بـووە هـۆی ئـەوەی لـە وڵاتـانی رۆژئاوادا کۆمەڵێك پەیامنێریی جەنگیی وەك *"جیمزکامیرۆن"* و *"هریسۆن سالیسبۆری"* ئـەمریکایی بـە خیانـەتکار لـە قەڵەمبـدرێن. بـەڵام سـەرەڕای هەموو ئەوانەش ئەو رۆژنامەنووسانەی لە باشووری ڤێتنامـدا کاریانـدەکرد، هـەموو توانایـەکیان خـستبووەگەڕ تـاکو سـەرنجی خـەڵك بـۆ لای ئـەو شـەڕە رابکێشن، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا کـە ئـەمریکا دەسـتی کردبـوو بـە نـاردنی راوێژکارانی سـەربازیی بـۆ ڤێتنـام. تەنانـەت وێنەیـەی ئـەو راهیبـە بودایيـە *"بـراون"* گرتبـووی، لـە سـەر مێـزی سـەرەك کۆمـاری ئـەمریکا *"جـۆن کەنەدی"* بینرا. کەچی کەنەدی هێزی زیاتری رەوانەی ڤێتنام کرد.

زۆر لە وێنەگرانی جەنگ کاتێك وێنەی دیمەنی شەڕو کوشـتو کوشـتارو ئازارەکـانی خـەڵك دەگـرن، بێـزارو نـاڕەحـەت دەبـن. هەرچـییەك بێـت دروسـتکردنی نـاڕەحـەتی بـۆ ئەوکەسانەی خۆیـان نـوقمی خـەمو پـەژارەن کـارێکی هێنـدە سـەرنجڕاکێش نییـە. سـاڵی ١٩٧٠ فۆتۆژورنالیـستێك بـە نـاوی *"لاری برزو"* لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لە گەڵ کەناڵی BBC وتی:

*"زۆرجار لە گەڵ خۆمدا بیر دەکەمەوە ئاخۆ من ئەو مافەم هەیـە سـوود لـە ئـێش و ئازارەکـانی خـەڵکی دیکـە وەربگـرم؟ زۆر جـار ئـەو هەسـتەم لا دروست دەبێت، بەڵام پاشان ئەو بۆچوونە نێگەتیڤانـەی خـۆم بـەوە پاساو*

*دەدەمەوە کەوا ئەگەر من پێمبکرێت ڕۆڵێکی بچووك بگێڕم لە گەیاندنی هەلومەرجی ژیانی سەختی ئەو کەسانە، کەواتە بەڵگەیەکی باشم لە دەستدایە بۆ ئەنجامدانی کارەکەم"*

ساڵی ١٩٧١ *"برزو"* لە گەڵ چەند ڕۆژنامەنووسێکی دیکەدا لە لاوس لە کاتی تەقەکردنو کەوتنەخوارەوەی هەلیکۆپتەرێکدا گیانی لە دەستدا.

هەرچەندە لە سەرەتادا چاپەمەنییەکانی ئەمریکا هێرشکردنە سەر ڤێتنامیان لە لایەن سوپای ئەمریکاوە بە کارێکی ڕەوا لە قەڵەمدابوو (بەخەباتێکی ئەخلاقییان دەزانی)، بەڵام دووبارە بوونەوەی پیشاندانی تەرمی کوژراوو بریندارەکانی ئەمریکا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە سەر ڕایگشتی. بەڵام بڵاوبوونەوەی وێنەی ئەو پیاوەی لە سەرجادەکانی سایگۆن ئیعدام دەکرا، لە هەموو شتێك زیاتر خەڵکی ئەمریکای گەیاندە ئەو باوەڕەی شەڕی ڤێتنام هیچ شێوەیەك لە خەباتی ئەخلاقی ناچێت.

"ئیعدام" ناوی ئەو وێنەیەبوو کە لە لایەن فۆتۆژورنالیستێك بە ناوی *"ئیدی ئادمس"* ەوە گیرابوو. ئەو وێنەگرە قەت لەو باوەڕەدا نەبوو دیلێکی شەڕ بەو شێوەیە لە بەرکامێراکەیدا تیرباران بکرێت. وێنەی تەلەفزیۆنی ئەو ئیعدامکردنە لە تەلەفزیۆنەکانی دونیادا بڵاوکرابووەوە، بەڵام کاریگەرییەکانی ئەو وێنە ڕەشو سپیە لە سەر ڕایگشتی زۆر زۆر قوڵتربوو.

بەڕای خەڵکی ئەمریکاوە ئەو وێنە هەژێنەرەی کە ئەو ژەنەراڵە ئەمریکاییەی پیشاندەدا پیاوێکی مەدەنی بەبێ دادگایکردن ئیعدامدەکات، کارێك بوو هەرگیز قەبووڵ نەدەکرا. لەوانەیە ئەو وێنەیە لە هەموو وێنەکانی دیکە زیاتر کاریگەری هەبوو لە سەر گۆڕینی ڕای خەڵكو چاپەمنیەکان سەبارەت بە شەڕەکە. پاش ماوەیەکی کەم لە بڵاوبوونەوەی ئەو وێنەیە ئەمریکا ناچار بوو بەشێکی زۆری هێزەکانی لە ڤێتنام

بکشێنێتەوە. ئەمەش لە ئەنجامی ناڕەزایی زۆری خەڵك لە ئەمریکاو جیهان، ئەمریکاییەکان بە ناچاری کۆتاییان بە شەڕی ڤێتنام هێنا.

سەرەڕای ناڕەزایەتی زۆری فۆتۆژورنالیستەکانو ئاژانسەکانی هەواڵ لە ڤێتنام، زۆر لەو وێنانەی لە سەر شەڕەکە گیرابوون بە تایبەتی ئەو وێنانەی کە قوربانییەکانی ڤێتنامی پیشاندەدا، ڕێگەی بڵاوبکردنەویان نەدرا. وێنەی ئەو مەدەنییانەی گوندی *"مای لای"* کە زۆربەیان ژنو منداڵ بوونو لە جۆگەیەکی ئاودا پێش کوشتنیان لە لایەن ئەمریکاییەکانەوە باوەشیان بە یەکدا کردبوو، ساڵێك دوای شەڕەکە بڵاوکرایەوە.

بە درێژیی شەڕی ڤێتنام ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژئاوایی دەیانتوانی هەموو بەرەکانی شەڕەکە ببینن. ئەو ڕۆژنامەنووسانە لە نەتەوەی جیاجیاو جێگەی باوەڕی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بوونو پلەی شەرەفیان دەدرایە. ئەوان دەیانتوانی لە هێزی ئاسمانی ئەمریکا، وەك چۆن تاکسی بە کرێدەگرن، ئاوا هەر هەلیکۆپتەرێکیان بوێت بۆیان ئامادە بکرێت. ئەو ڕۆژنامەنووسانە لە گەڵ ئەو تیپانەی بۆ شەڕەکان دەچوون دەڕۆیشتنە بەرەکانی جەنگەوە. فۆتۆژورنالیستەکان بێ چەك بوونو زۆرجار هەستیان بە ئاسایش دەکرد، بە یارمەتی کامێراکانیان لە گوللەو ترسو تۆقین دووربوون. ئەو ڕۆژنامەنووسانە بۆ وێنەگرتنو ئامادەکردنی ڕاپۆرت هیچ کێشەیەکیان نەبوو. لە کاتی گەڕانەوەشیان بۆ بارەگاکان لە ژووری ئەفسەرەکاندا دەخەوتن. بەڵام ئەو نرخەی ڕۆژنامەنووسان بۆ ئازادی داویانە زۆر گەورە بوو، نزیکەی ٢٠٠ ڕۆژنامەنووس لە هەردوو بەرەکەی شەڕو لە هەموو نەتەوەکان کوژرانو زۆریشیان بریندار بوون یان بە دیل گیران. ئەو کەسانەش کە لە شەڕەکە بە سەلامەتی دەرباز بوون، بە هۆی تێکچوونی باری دەروونییانەوە کارکردن زۆر دژوار بوو بۆیان. ئێستا لە

سـایگۆنی ڤێتنــام مــۆنیمێنتێکی بــچکۆلانه لــه لایــەن رۆژنامەنووســێکی ڤێتنامییــەوه بــۆ یــادی ئــەو رۆژنامەنووســانەی لــەو وڵاتــەدا کــوژراون درووستکراوه. پاش ئەو شەڕە ئیتر هیچ کاتێك رۆژنامەنووسانی رۆژئـاوایی نـەیانتوانیوه بـەو ئازادییـە، هەواڵـەکانی شـەڕ تۆماربکـەن‌و چـیتر کـەڵکیان لەوجۆره وێنه ترسناکانەی شەڕو توندوتیژی وەرنەگرت.

## ئەو وێنانەی ناگیرێن:

یـەکێك لـەو وێنانـەی زۆرجـار لـە کـاتی هەواڵەکانـدا دووبـاره دەبێتـەوه، وێنــەی ئــەو فۆتۆژورنالیــستانەیە بــەدوای ئــەو ئۆتۆمبیلــە جــام تاریکانــەدا رادەکەن کە تاوانباران لە دادگاوه دەگوازنەوه بۆ زیندان. زۆرجار ئەو وێنانـە بەکەڵکی بڵاوکردنەوه نایەن، چونکە تەنها پەڵەیەکی رەش دەردەکەوێت. بە شێوەیەکی گشتی ناو ئەو ئۆتۆمبیلانە کراونەتە چەند بەشێکی جیاجیـاوەو وێنەگر ناتوانێت بزانێت زیندانییەکە لـە کـام بەشـی نـاو ئۆتۆمبیلەکەدایـە. جگە لـەوەش ئـەو تێپـە رەشـەی لـە پەنجـەرەی ئۆتۆمبیلەکـە دراوه روونـاکی فلاشەکە پێچەوانە دەکاتەوه. ئەو تێپە بۆ ئەوەکراوه تاکو وێنەگران نەتوانن وێنــەی تاوانبــاران بگــرن. هەوڵــدان بــۆ گــرتنی ئــەو جــۆره وێنانــە کــارێکی بێهودەیە، بەڵام هەندێك جار بەرهەمی هەیە.

*نموونەیەك:*

وێنەیەك لە ئۆتۆمبیلی زیندانێك گیرا، پاش ئەوەی لـە کۆمپیوتـەر کـاری لەسەرکرا، توانرا لە رۆژنامەدا سوودی لێوەربگیرێت، "مایکل ولتر" وێنەگری ئەنجومەنی چاپەمەنییەکانی بریتانیا توانی وێنەی سیاسەتمەدارێك بە ناوی "جوناتـان ئـایتکن" بگرێـت کاتێـك لـە دادگـاوه دەگواسـترایەوه بـۆ زینـدان.

هەرچـەندە تـاریکی پەنجەرەکـە زۆر بـوو بـەڵام دواتـر تـوانرا لـە ڕێگـەی کۆمپیوتـەرەوە کـاری لـە سـەر بکرێـتو بـە شـێوەیەکی سـەیر وێنـەی ئـەو تاوانبارە دەربخرێت کە بۆ بەسەربردنی ماوەی زیندانییەکەی دەگوازرایەوە.

## وێنەی خەڵکانی ناسراو:

بـێ هـیچ دوودڵییـەك هـەموو وێنـەکان تایبـەت نـین بـە کارەسـاتو ڕووداوەکـان. بـۆ نموونـە لـە ئاهـەنگی زەماوەنـد لـە وڵاتـە ڕۆژئاواییـەکان دەتوانێـت کەسـایەتییە ناودارەکـان بـۆ لای میـدیاکان ڕابکێـشێت. زۆر لـە چاپەمەنییەکان پێشەکی بۆ ئامادەبوون لەو ئاهەنگانـەدا پارەیـەکی خـەیاڵی دەدەن. ئـەو خەڵکـە ناودارانـەی دەیانـەوێت ئاهـەنگی زەماوەندەکـەیان بـە شێوەیەکی تایبەتو دوور لە هەواڵی ڕۆژنامەکان بڵاوبێتەوە کێشەیان نابێـت تـا ئـەو کاتـەی یـەکێك لـە ناسیاوەکانیان هەواڵەکـە بـە ڕۆژنامـەکان دەدات. هەندێك گۆڤاری بریتانی هـەن تایبەتمەندییەکـەیان لەوەدایـە تـەنها وێنـەی ئاهەنگـەکانی خـەڵکانی نـاودار بڵاودەکەنـەوە. ئـەو گۆڤارانـە نـەك پێـشەکی پارەیـەکی زۆر دەدەن، بـەڵکو زۆرجـار خـەرجی پاراسـتنی لایـەنی ئاسایـشی ئاهەنگەکـەش دەگرنـە ئەسـتۆی خۆیـان، نـەوەکو ڕۆژنامەنووسـی دی بێـتو وێنـەی ئاهەنگەکـە بگرێـت. بـەڵام زۆر جـار ئـەو ڕێوشـوێنە سـەختەی دەگیرێتەبــــەر دەرئەنجامەکــــەی پێــــچەوانە دەکەوێتــــەوە. چــــونکە ڕۆژنامەنووسـانی دی لـە بـری وێنـەی ئاهەنگەکە وێنـەی ئـەو بەرپرسـانەی ئاسـایش دەگـرن کـە هەڵـسوکەوتی تونـد دەنـوێنن، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ڕوشاندنی ڕوخساری کەسە ناودارەکان لای ڕایگشتی.

## وێنەی وەرزشیی:

ساڵی ١٩٩٩ لە کاتی یاریکردنی نێوان هەردوو یاریزانی مشتەکۆڵەی بریتانی "لنکۆس لویس" و ئەمریکایی "ئیڤاندۆ هولی فێلد" کە بۆ بەدەستهێنانی جامی جیهانیی بەڕیوەچوو. پەیامنێرانی وەرزشیی لە هەردوو وڵات کەوتنە خۆیان بۆ بلاوکردنەوەی هەواڵو وردەکارییەکانی ئەو پاڵەوانێتییە. لە بەرئەوەی یارییەکە لە ئەمریکادا دەکرا، ژمارەی رۆژی شەممەی رۆژنامەکانی بریتانیا پێشتر رەوانەی چاپخانە کرابوون.

لەم جۆرە یارییانەدا هەلێکی باش بۆ رۆژنامەنووسانو وێنەگران دەرەخسێت. رێکخەرانی ئەو جۆرە یارییانەش شوێنی تایبەت لە نزیك سەکۆی مشتەکۆڵەکەو سەرەوەی سەکۆکە بۆ وێنەگرانو پەیامنێران دیاریدەکەن. هەروەها ژوورێکی تایبەت کە کۆمپیوتەری تێدایە بۆ ئەو مەبەستە لە نزیك یاریگاکە دادەنرێت. ئامانج لەم کارە ئەوەیە شوێنێکی گونجاو بۆ وێنەگران دابینبکەن. بۆ ئەوەی بە روونی یارییەکە ببینن‌و وێنەی بگرن. بەڵام ئەو کارە دەبێتە رێگر لە بەردەم وێنەگرەکانو ناتوانن لە گۆشەکانی دیکەوەوە وێنەی یارییەکە بگرن. وەك بلیتی شانۆ وایە کاتێك شوێنەکەت باش نییە بۆ بینین، دەبێت تەحەمول بکەیت، چونکە هیچ چارەیەکی دیکەت نییە. بۆ گرتنی وێنە دەبێت پشت بە بەختی خۆت ببەستیت. کاتێك یارییەکە دەستپێدەکات، وێنەگرەکان چاوەڕوان دەبن بزانن یارییەکان بەرەو کوێ دەچێت، لەم کاتەدا گرتنی وێنەیەکی گشتیی یارییەکە زۆر گرنگ نییە، بەڵام گرتنی وێنەی جوڵەی یاریکەرانو ئەوکاتەی دەستی یەکێکیان وەك نیشانەی بردنەوە بەرزدەکرێتەوە، بابەتێکی زۆر بەنرخن بۆ وێنەگران. ئەوە رێسایەکی گشتی وێنەگرتنی یارییەکانە. ئەو وێنانەی

یاریزانەکانیان تێدا دەردەکەوێت زۆر گرنگن. بۆ نموونە ئەو کاتەی مشتێك بەر سەری یاریزانێك دەکەوێت و لە روخساریدا ئازار دیارە، یان کاتێك یەکێك لە یاریزانەکان بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ دەبێت، کامێراکان هەموویان روو لەوێ دەکەن. هەلی گرتنی وێنەیەکی بەنرخ لە چرکەیەك کەمترەو لە چاوتروکانێکدا لە دەستدەچێت. یاریزانەکان جوڵەیان هێندە بە پەلەو خێرایە، زۆر سەختە بزانیت کام سات بۆ گرتنی وێنە باشترە. لێرەشدا بەخت رۆڵێکی باش دەبینێت. هەستیاری کارەکە هێندە زۆرە ئەم وتەیە بووەتە شتێکی باو *" کاتێك وێنەکە لە چاوی کامێراکەوە دەبینی، ئەوە بزانە بابەتی وێنەکەت لە دەستدەرچووە"*. سەرکەوتنی وێنەی وەرزشکاران تا رادەیەك بە بەختەوە بەستراوە، بەڵام دەکرێت لە رێگەی شارەزایی و راهاتن و هەبوونی کامێرای پێشکەوتووەوە رادەی ئەو بەختە بەرزبکرێتەوە. بەخت وەك هۆکارێکی سەرکەوتن نابێتە هۆی کەمکردنەوەی رادەی شارەزایی وێنەگرتن، بۆیە بۆ ئەوەی وێنەیەکی باشت دەستبکەوێت پێویستت بە هەردووکیانە. کاتێك یارییەکە کۆتایی دێت تۆمارکردنی ئەو ساتەی براوەکە خۆشحاڵەو دۆڕاوەکەش داماو، دەبێتە مایەی خۆشحاڵی بەرێوەبەری وێنەی گۆڤارەکە. بەڵام لە راستیدا بۆ ریپۆرتەرێکی سەرکەوتوو وێنەگرتنی ساتەوەختێکی نایاب و دووبارە نەبووی یارییەك بەهایەکی گەورەی هەیە. وێنەگرانی وەرزشیی بە دوای وێنەیەکی وەهادا وێڵن تەقلیدی نەبێت. بۆ نموونە وێنەی ئەو ساتەی دەستکێشی یاریزانێك دەکێشێت بە روومەتی یاریزانێکی دیکەدا، یان ئەو تۆپەی راستەوخۆ دەچێتە ناو گۆڵەکەوە. شکارکردنی ئەو ساتە نیشانەی کۆڵنەدانی یاریزانێکە لە پانتاییەکی تایبەتداو گرنگییەکی تایبەتی هەیە. لەو هەزاران وێنەیەی لە یارییەك دەگیرێت تەنها یەکێکیان راستی رووداوەکە دەگێرێتەوە.

# ١١

# وێنەگری چاپەمەنییەکان
# (press photographer)

ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی وێنەگری چاپەمەنییەکاندایە، ئەرکێکی زۆر گرانە. نووسەر دەتوانێت لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوێك پێشەکی بۆ بنووسێت‌و پرسیاری جیاجیابکات، بەلام وێنەگر بۆ خستنەڕووی ڕاستییەکانی ڕووداوێك ئەرکێکی ئالۆزو سەختی لە پێشدایە. وێنە ڕستەیەکە بە دەست وێنەگرێکەوە تاکو لە ڕێگەیەوە بابەتێك بخاتەڕوو. گەر بە هەر هۆیەکەوە وێنەکە باش دەرنەچوو، یان دەرەنگ چاپکرا، ئەوا کارلەکار دەترازێت‌و چیتر هەلی گرتنەوەی ئەو وێنەیە دووبارە نابێتەوە.

لە هەندێك حاڵەتی وەك پشێویی‌و نائارامیی‌و شەڕوشۆڕدا، وێنەگران تا ڕادەیەکی زۆر ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە. بەلام سەرەڕای ئەوانەش دەبێت لە کاتی بینینی دیمەنێکی پێویست، خۆیان لە پشت کامێراکانیان مەلاسبدەن‌و دیمەنەکەیان لە دەستنەچێت. لە ڕاستیشدا خۆحەشاردانەکە لە پشتی کامێرا ئەو هەستە لای وێنەگر درووستدەکات کەوا مەترسی کەمتری لەسەرە، وەك بڵێیت کامێراکە قەڵغانێکەو لە هەڕەشەی بەرامبەرەکەی دەیپارێزێت.

هەڵبەت دەبێت بزانین هەموو وێنەکان تایبەت نین بە شەڕوشۆڕەوە، هەموو وێنەگرێکی چاپەمەنییەکان ڕووبەڕووی ڕووداوی وا مەترسیدار

نابێتەوە. بەشێکی زۆری کاری وێنەگران پەیوەندی بە ساتەکانی ژیانی ئەو خەڵکە ناودارو سادانەوە هەیە کە دەبنە هەواڵ. سەبارەت بە بابەتی یەکەمیان دەکرێت بڵێین بە بێ بوونی وێنەگران، بوونی خەڵکانی ناودار مانای کەمتری هەیە. چونکە زۆرجار وێنەیەکی جوان دەتوانێت ئەو کەسانەی تایبەتمەندیو ناوبانگێکی ئەوتۆیان نییە، زیاتر بناسێنێت.

زۆرجار ڕوودەدات هێشتا کارێکت تەواو نەکردووە کارێکی دی دێتە پێشەوە. بەرنامەی ڕۆژانەی وێنەگرێکی چاپەمەنییەکان بریتییە لە تەواوکردنی کۆمەڵێك کاری بێکۆتاییو نابەدڵ. لە کاتی ئەنجامدانی کۆڵێك کاری پڕ لە زەحمەتو کەڵەکەبووی ڕۆژانەدا، زۆر جار ڕووداوێکی سەرنجڕاکێشو چاوەڕوان نەکراویش سەرهەڵدەداتو وێنەگرەکانیش وەك ڕۆژنامەنووسەکانی دی ڕووبەڕووی مەترسیی دەکاتەوە.

لەم بەشەدا دەستەواژەی " وێنەگری چاپەمەنییەکان press photographer لە بەرامبەر "فۆتۆژورنالیست photogournalis" بەکارهاتووە هەردوو دەستەواژەکەش بۆ یەك پیشە بەکاردێن، بەڵام لێرەدا بۆ وەسفکردنی کاری ئەو وێنەگرانەی ڕاستەوخۆ وەك کارمەندی فەرمی ڕۆژنامەکان کاردەکەن، وشەی "وێنەگری چاپەمەنییەکان press photographer بەکارهاتووە، تاکو لە گەڵ ئەو بابەتانەی لە باسی "وێنەگری ئازاد" قسەمان لە سەرکردن تێکەڵ نەبێت..

**پێویستیی فێربوون:**

جیاوازییەکی گەورەی وێنەگرێك لە گەڵ پەیامنێرێکی ڕۆژنامە بریتییە لەوەی وێنەگر دەبێت جگە لە شارەزایی خودیی کە یەکێکە لە مەرجەکانی ڕۆژنامەنووسیی، پاش گرتنی هەر وێنەیەكو دوای شۆشتنەوەی وێنەکە هێندە شارەزایی هەبێت هەواڵی باش لە یەکێکی خراپ جیا بکاتەوە. لەم

سالأنەی دواییدا ژمارەی ئەو وێنەگرانەی وەك كارمەند لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا دادەمەزرێن ڕووی لە كەمبوونەوەیەو هەلی كاركردن لە چاو نووسەران بۆ وێنەگران زۆركەمترە. دوو هۆكاری گەورە بۆ ئەو مەسەلەیە هەن: یەكەمیان كەمكردنەوەی خەرجییەكانو دووهەمیش سەرهەڵدانی تایبەتمەندییەكی نوێ بەناوی چەند پیشەیی هێزی كار. هەندێك ڕۆژنامە كامێرایەك دەدەن بە پەیامنێرەكانیان بۆ ئەوەی لە پاڵ ئامادەكردنی ڕاپۆرتەكانیاندا وێنەش بگرن. جگە لەوە ئاژانسەكانی وێنەو وێنەگرە ئازادەكان توانیویانە بۆشایی نەبوونی وێنەگر پڕبكەنەوە. بۆیە ئەوانەی دەیانەوێت ببنە وێنەگری چاپەمەنییەكان پێویستە پێشئەوەی بەشداریی لە خولی ڕاهێنانو فێربووندا بكەن یان پێشئەوەی داوای دامەزراندن بكەن، پرۆگرامێك بۆخۆیان دابنێن.

سەیر لەوەدایە خواست لەسەر ئەو وێنە ڕەنگاورەنگیانەی كوالێتییەكانیان بەرزە زۆر لە جاران زیاتر بووە. لە هەمانكاتدا داخوازیی بۆ دامەزراندن لە ڕۆژنامەكاندا لە هەموو كاتێك زیاتر بووەو ململانێكانیش زۆرتر بوون. باشتروایە پێشتر بەرنامە بۆ ئایندەی كاركردنت دابنێیتو شێوەی پێشكەوتن لەو پیشەیەدا لە بەرچاوبگریت. بیر بكەرەوە دەتەوێت بۆ كام ڕۆژنامە كاربكەیت؟ لە گەڵ كێدا ببیتە هاوكارو كام جێگا ببینیت؟

بە شێوەیەكی گشتیی سەرنووسەرەكان لە نێو ئەوانەی داخوازیی بۆ دامەزراندن پێشكەشدەكەن، زیاتر ئەوانە هەڵدەبژێرن كە خولی فێربوونیان تەواوكردووە، یان پەیمانگایەكی تایبەتمەندییان تەواوكردووە. ئەوانەی لە پاڵ كاركردن لە ڕۆژنامەكاندا دەچنە خولی فێربوونەوە، جگە لە بابەتە تیۆرییەكانی پەیمانگای وێنەگرتن، یاساو ڕۆژنامەوانیو شێوازی نووسینی بابەتی ژێر وێنەكان بە پراكتیكی فێر دەبن. فێرخوازان دەبێت كۆمەڵێك

کاری پراکتیکی وەك نیشانەیەك بۆ شارەزایی‌و توانای ئەوان لە کاری وێنەگریدا بخەنەڕوو.

نموونەی کار:

پێشئەوەی پەیوەندی بە سەرنووسەری بلاوکراوەیەکەوە بکەیت، کۆمەڵێك لەو وێنانەی تواناو لێهاتوویی تۆ دەردەخەن هەڵبژێرە. باشتروایە ئەو وێنانە لە رووی ناوەڕۆکەوە بۆ رۆژنامەوانیی دەستبدەن. بۆ نموونە تیمێکی فریاکەوتن سەرقاڵی رزگارکردنی ئەو پشیلەیەن کە لە سەردارێك گیری کردووە. یان چەند وێنەیەکی وروژێنەری یارییەك. دەرچووانی دواناوەندی‌و پەیمانگاکان دەتوانن راپۆرتی وێنەیی لە سەر بەخشینی خەلاتو یاری نێوان دوو تیم‌و خەڵکی ناودار ئامادە بکەن. ئەوانەی دەیانەوێت فێربن پێویستە هەریەکەیان لای خۆیانەوە کۆمەڵێك وێنەی رەش‌و سپی‌و رەنگاوڕەنگ لە سەر خەڵکانی بەناوبانگ ئامادە بکەن. گەر وێنەی دیمەنەکان یان روخساری خەڵك بە شێوەیەکی زیرەکانە گیرا بێت، نیشانەیە بۆ لیهاتوویی وێنەگرەکە. بەلام بە دڵنیایەوە نیشانە نییە بۆ لیهاتوویی وێنەگرەکە وەك وێنەگرێکی رۆژنامەوانیی. کۆکردنەوەی ئەو کۆمەڵە وێنەیە پێویستی بە کات‌و خەرجی‌و ماندووبوون هەیە. کۆمەڵە وێنەیەك بریتییە لە چەند وێنەیەکی چاپکراوو چەند سلایدێك کە لە شێوەی ئەلبوومدا رێکخرا بێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی پەڕەکانی هەڵبدرێتەوە. وێنە چاپکراوەکان دەبێت لە سەر فایلێکی سپی دابنرێن‌و بخرێنە ناو مەحفەزەیەکی پلاستیکییەوە. دەفتەرەکەش دەبێت بۆ هەمان مەبەست دروستکرابێت، لە دوکانەکانی وێنەگرتن‌و پەڕاوگە فرۆشەکاندا ئەو دەفتەرانە دەفرۆشێن.

ئەگەر پێشتر وێنەکانت لە بلاوکراوەکاندا چاپکرابن، هەوڵبدە

نوسخەیەکی ئەو وێنە بڵاوکراوانەش لە گەڵ دەفتەرەکەدا هاوپێچ بکەیت. ئەگەر زانیت رۆژنامەکان زۆرن هەوڵبدە لە دەفتەرێکی دیکەی تایبەتدا ئامادەیان بکەیت. لەوانەیە پارەیەکی زۆری تێچێت، بەڵام ئەو خەرجییە بە فیرۆ ناچێت بۆ ئەوەی بسیەلمێنیت شارەزایی‌و لیهاتوویت لە کارەکەتدا هەیە.

سلایدەکانیش دەکرێت بخرێنە ناو زەرفی تایبەت بە هەلگرتنی سلایدەوە. دەتوانیت بە کۆمپیوتەر روونکردنەوەی پێویست لە سەر وێنەکان بنووسیت. گەر بە شێوەیەکی جوان وێنەکان بخەیتە بەردەستی سەرنووسەر، نەك نیشانەیە بۆ ئەوەی وێنەگرێکی لیهاتوویت، بەڵکو نیشانەیە بۆ ئەوەش کە لە خستنەڕووی وێنەکاندا کەسێکی زیرەکی‌و شێوازی تایبەت بەخۆت هەیە. لە کاری رۆژنامەوانییدا ئەو خاڵە گرنگییەکی تایبەتی هەیە. چونکە شێوەی خستنەڕووی وێنەکان کاریگەرییەکی زۆری لە چۆنێتی گەیاندنی پەیامی ئەو وێنانەدا هەیە.

بۆ کارناسانیی کۆپی وێنەکانت مەنێرە. جگە لەو وێنانەی لە بڵاوکراوەکاندا بڵاوبوونەتەوە، هەوڵبدە نزیکەی ٢٠ تا ٣٠ وێنەی دیکە بنێریت. کارە نوێیەکانیشت بنێرەو هەوڵبدە بە شێوەیەك ئەو وێنانە لە گەڵ رۆژنامەوانییدا پەیوەندییان هەبێت. باش بیربکەرەوە لەوەی بۆ ئەو کۆمەڵە وێنەیەت وەك باشترین نموونەی کارەکانت هەڵبژاردووە، بۆئەوەی کاتێك پرسیارت لە سەر وێنەیەك لەو وێنانە رووبەڕوو دەکرێتەوە، بتوانیت سەبارەت بە رووناکی‌و بابەت‌و پیکهاتەی وێنەکە قسەی خۆت بکەیت.

چاوپێکەوتن بۆ دۆزینەوەی کار:

ئەوکاتەی بۆ چاوپێکەوتن بانگ دەکرێیت بۆ رۆژنامەکە، دەبێت لە کاتی

خۆیداو بێدواکەوتن بڕۆیت. پێشئەوەی چاوپێکەوتنەکە ئەنجامبدرێت لە ڕۆژنامەکە پرسیاری ناوو پلەو پایەی ئەو کەسە، یان کەسانەی چاوپێکەوتنت لە گەڵدا دەکەن بکە. بۆ نموونە خاتو "ئەلف" بەرپرسی بەشی وێنەیە، جلی رێكو پێكو فەرمی لەبەربکە، پێویستناکات ئەو پانتۆڵەی لە پێیدەکەیت چەندین گیرفانی بۆ هەلگرتنی کەرەستەکانی وێنەگرتنو فیلم هەبێت. گەر سەرکەوتیتو کاریان پێدایت، هێمنییو ئارامیی خۆت بپارێزە، چونکە تۆ لە هەموو جێگەیەك نوێنەری ئەو بلاوکراوەیەیت. مەرج نییە کامێراکەت لەملبکەیتو بڕۆیت بۆ چاوپێکەوتن. تەنها ئەوکاتەی کەداوات لێدەکرێت وا بکە، بەلام بۆ ئەوەی بیسەلێنیت هەردەم ئامادەی وێنەی بابەتەکان بگریت کامێرایەکی بچکۆلەی ئۆتۆماتیك لە گیرفانی چاکەتەکەتدا هەڵبگرە. با کەسەکە رەفتارێکی دۆستانەت لە گەڵدا بکات، بەلام ئاگاداربە بەهیچ شێوەیەك بە ناوی بچووکی خۆیەوە بانگی مەکە، ئاگاداربەو رەفتارو هەڵسوکەوتت وەك ڕۆژنامەنووسەکان بێت.

گۆڤارەکان:

گۆڤارەکان هەلی باش بۆ ئەو وێنەگرانەی دەیانەوێت وەك وێنەگرێکی پرۆفیشناڵ کاربکەن دەرەخسێنن. گۆڤارە بەناوبانگەکان کاری هەمیشەیی بەو وێنەگرانە دەدەن، ئەگەر بەلاتەوە باش بێت وێنە بۆ بابەتو راپۆرتەکان بگریت، هەلی کارکردنت بۆ دەرەخسێنن.

بەشی وێنەی بلاوکراوەکان:

وێنەگرانی ڕۆژنامەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ، یان لە ژێر دەستی بەرپرسی بەشی وێنە، یان کۆنترین وێنەگری بەشەکە کاردەکەنو ئەوانیش لە ژێر چاودێری سەرنووسەردان. بەشی وێنەگری لە کۆمەڵە کەسێك

پێكدێت، ژمارەی وێنەگرەكان بە گەورەو بچووكی بڵاوكراوەكەوە بەندە، جێگرو سكرتێری سەرنووسەر كۆمەڵە كارێكیان لە ئەستۆدایە وەك ئامادەكردنی كەرەستەكانی وێنەگریی، شتنەوەو هەڵبژاردنی وێنەكانو پەیوەندیكردن بە وێنەگرانی ئازادو ئاژانسەكانی وێنەو رێكخراوەكانی دی. تا لە رووی ئیدارەوە رۆژنامەكە بچووك بێت، بەشی وێنەگریش بچووك دەبێت. بەڵام ناوەڕۆكی كارەكان یەك شتن. ئەركەكانی بەشی وێنەگریی جیا نیین لە بەشی دەستەی نووسەران، پێویستە بەرپرسی بەشی وێنەو هەواڵ پەیوەندییان زۆر پتەو بێتو پێكەوە بۆ دۆزینەوەی راپۆرتەهەواڵ كاربكەن. زۆرجار بە هەردوو بەشەكەوە یەك ژووری هاوبەشیان هەیە.

ئەركەكانی سەرشان:

كاری وێنەگریی بە پێی ئەو رووداوانەی روودەدەنو بە پێی نەخشەیەكی لە پێشداداڕێژراو دەسپێردرێتە وێنەگر. ئەو شوێنو مەراسیمانەی پێویستدەكات وێنەگر تێیاندا ئامادەبێت لە ناو دەفتەری ئەركەكانی رۆژانەدا تۆماردەكرێن. بەڵام تەنها لە ساتەوەختە ئاساییەكانو لەو كاتانەی ئەركو فەرمانت لە سەر نییە، دەبێت ئامادەی راوكردنی رووداوەكان بیت. سەرۆك بەشێكی سەركەوتوو دەبێت بە پێی لێهاتوویی و توانای وێنەگرەكان ئەركیان پێبسپێرێت. كاتێك وێنەگرێك كە هیچ حەزی لە یاری تۆپی پێ نییە دەنێرێت بۆ وێنەگرتنی یاری نێوان دوو تیپ، ئەوە كارێكی نا لۆژیكییە. ئەمرۆ مۆبایل بووەتە كەرەستەیەكی باش بۆ دروستكردنی پەیوەندی نێوان وێنەگرو دەستەی نووسەرانو هەردوولایان لە رێگەیەوە دەتوانن ئاگاداری رووداوەكان بن. كاتێك رووداوێكی گرنگ روودەدات، پێویستە سەرۆكی بەشی وێنەگرتن بڕیار بدات دەبێ كێ دەست لە كارەكەی هەڵبگرێتو بچێت بۆ وێنەگرتنی رووداوەكە. بە زۆری ئەو

کەسە لە نێوان ئەوانەی لەوێ ئامادەن دەستنیشاندەکرێت، زۆرجاریش سەرنووسەر بۆ ئەو مەبەستە وێنەگرێکی ئازاد هەڵدەبژێرێت.

لە کاتی ڕووداوی ئۆتۆمبیلو بوونی خەڵکانی بریندارو کوژراودا، پێویستە وێنەگر پشت بەتوانای هەست پێکردنو پێشبینیکردنەکانی خۆی ببەستێت. لە هەلومەرجێکی وادا خەڵك تووشی پشێویو هەرج ومەرج دێنو کەسێك نییە ڕێنمایی وێنەگرەکان بکات. بە پێچەوانەوە لەو کاتەی کە خەڵك یارمەتی بریندارو لێقەوماوەکان دەدات، ئەو خەڵکە حەزیان لە وێنەگرێك نییە سەرقاڵی کارەکەی خۆی بێت. باشترین کار ئەوەیە ڕاوێژ لە گەڵ بەشی وێنەگرتن بکرێت، پێویستە وێنەگر شوێنێکی گونجاوی وا بۆ کارەکەی خۆی بدۆزێتەوە نەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوانەی سەرقاڵی فریاکەوتنو گواستنەوەی بریندارەکانن. گەر وێنەگران ببنەهۆی ڕێگرتن لە ئەنجامدانی کاری فریادڕەسەکان لەوانەیە بە ڕێگری لە فریاکەوتنی لێقەوماوان تۆمەتبار بکرێن. هەندێجار ڕووبەڕووی ڕووداوی زۆر دڵتەزێن دەبیتەوە، با وێنەگرێکی زۆر شارەزاو کارامەش بیت، بەلام هیچ کاتێك توانای ئەوەت نییە ڕووبەڕووی کارەساتی دڵتەزێنو کوشتو کوشتارو خوێنڕشتن ببیتەوە. تەنانەت بە ئەزموونترین وێنەگرانیش کاتێك ڕووداوی وا بە چاوی خۆیان دەبینن تووشی شۆکی دەروونی دێن. لەوانەیە لە کاتی وێنەگرتنی ڕووداوی دژوارو نائارامیو پشێوی سەر شەقامەکاندا وێنەگران ڕووبەڕووی توندوتیژی ببنەوەو ئەگەری ئەوەی هێرشیان بکرێتە سەر زۆر لە ئارادایە. لەوانەیە وابزانن تۆ پیاوی حکومەتی یان پۆلیسی. هەرچۆنێك بێت لەوانەیە وێنەکانت ببنەهۆی ناسینەوەو گرتنی ئەوانەی بەشدارییان لە پشێویەکە کردووە. لەم حاڵەتانەدا هەوڵبدە لە جێگەیەکەوە وێنە بگریت دووربێت لە گوللەو ئەو شتانەی فڕێدەدرێن.

ئاژانسەکان:

ئاژانسەکان جگە لە وێنەگری ئازاد، وێنەگری خۆشیان هەیە کە دامەزراون. بۆ کارکردن لە ئاژانسەکاندا پێویستت بەوە هەیە کەسێکی پرۆفیشناڵو خاوەن بڕوانامەی باوەڕپێکراو بیت، (بۆ نموونە لە بریتانیا بوونی بڕوانامەی ئەنجوومەنی بالآی فێرکردنی پەیامنێریی مەرجێکی پێویستە)، ململانێ بۆ بەدەستهێنانی کار لەو جێگایانەدا زۆر توندوتیژە. بەو پێیەی دەبێت لە گەڵ وێنەگرانی ئازاددا ململانێ بکەیت پێویستە لەکاری وێنەگرییدا شارەزاو بە توانا بیت. کاتێك لە ئەنجامدانی کارەکەتدا دوادەکەویت یان بە نیوەناچڵ جێبەجێیدەکەیت، ئاژانسەکان زۆر زووتر لە سەرنووسەری رۆژنامەکان داوای عوزرت لێدەکەن. رێژەی حەقدەستو مووچەکەشت بە رادەی کارکردن لە رۆژنامەکاندا نییە. هەڵبەت گەر ئاستی کارەکانت بەرزبن، لە رووی مادییەوە مووچەکەت زیاتر دەبێت. ئاژانسەکانی "رۆیتەرزو ئاسۆشیتد پریس" لە هەموو کونجو کەلەبەرێکی دونیا کاردەکەنو وێنەگرەکان بۆ هەموو شوێنێك دەنێرن. لەوانەیە لە یەکەم تێڕوانیندا ئەم مەسەلەیە زۆر سەرنجڕاکێش بێت، بەلآم مەترسییەکانی رێگەو دووبارەبوونەوەی ئەو کارە، لەزەتی یەکەم جارت لە بیر دەبەنەوە. دوورکەوتنەوە لە خێزانەکەت بۆ ماوەیەکی زۆر، لەوانەیە ژیانی تایبەتیت تێکبدات. ژیان لە وڵاتێکی دیکەدا گەر برسێتیو تینوێتیو هیلاکیو بێخەویو سەرماو گەرماشی لە گەڵدا بێت، شتێکی زۆر خۆش نییە. بەلآم گەر وێنەگرەکە ماڵو منداڵی نەبێتو حەزی لە سەرکێشی هەبێت، سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات شتێکی خۆشەو هەلێکی باشە بۆ پەیداکردنی ئەزموون. لەوانەشە مەبەستی سەرەکی تۆ لە وێنەگرتن ئەو سەفەرانە بێت بۆ دەرەوی وڵات.

گەر حەزت لەوەیە پیشەیەکت هەبێت سەفەری دەرەوەی وڵاتی زۆر تێدا بێت پێویستە زیاد لە زمانێك بزانیت‌و شارەزایی تەواوت لەسەر کولتووره جیاجیاکان هەبێت. ئەو ئاژانسانەی بچووکن‌و لە شارە جیاجیاکاندا ئۆفیسیان هەیە، بۆ وێنەگرتنی ئەو ڕووداوانەی ڕۆژنامەکان ناتوانن بە خێرایی وێنەگریان بۆ بنێرن، سوود لەوێنەگرەکانی ئەو شارە وەردەگرن. ئاژانسەکان لە گەڵ ڕۆژنامەکاندا گرێبەستدەکەن تاکو بە خێراترین ماوە وێنەی ڕووداوەکانیان بۆ بنێرن. بەگشتی ئاژانسەکان لەوانی دیکە زووتر ئاگاداری ڕووداوەکان دەبنەوەو بە شێوەیەکی ئۆتوماتیکی ڕووداوەکان تۆماردەکەن‌و وێنەیان دەگرن، بۆ ئەوەی دواتر ڕاپۆرت‌و وێنەکان بە ڕۆژنامەکان بفرۆشن. ئەم ئاژانسانە لە گەڵ وێنەگرانی ئازادو ڕۆژنامە لۆکاڵییەکاندا لە ململانێیەکی بەردەوامدان. کاتێك مەسەلەی مامەڵەی وێنە چاکەکان دێتە گۆڕێ، شتێك بە ناوی پابەندبوونی ئەخلاقیی ڕۆڵی نامێنێت‌و ڕۆژنامەکان ئەو حەقە بە خۆیان دەدەن مامەڵە لە گەڵ ئەو کەسەدا بکەن وێنەی باشترو چاکتری لایە.

# ١٢

# هەواڵەکانی تەلەفزیۆن (١)

لە ساڵی ١٩٥٤ واتە کاتێك کەناڵی تەلەفزیۆنی BBC بۆ یەکەمجار لە هەواڵەکاندا لە پاڵ دەنگی بێژەرەکەدا وێنەو نەخشەی پەخشکرد، تاکو ئەمرۆ، پێشکەشکردنی هەواڵەکان گۆڕانکارییەکی یەکجار زۆری بەسەردا هاتووە. ئەم گۆڕانکارییانە لە هەمانکاتدا لە بەرنامەکانی رادیۆشدا روویانداوەو هۆکارەکەشی بۆ بەکارهێنانی شێوازی نوێی کارکردنو بوونی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو و خواستی خەڵك لە سەر هەواڵو زانیاریی دەگەڕێتەوە. ئەمرۆ ٨٠٪ خەڵك لە تەلەفزیۆنەکانەوە هەواڵەکان وەردەگرن، لە بەر ئەوەی مرۆڤ زیاتر باوەڕ بەوە دەکات کە بە چاوە دەیبینێت، بۆیە ژمارەی ئەوانەی سەرچاوەی سەرەکی هەواڵەکانیان تەلەفزیۆنە زیاترن لە رادیۆ.

زۆربەی کەناڵەکانی وەك CNN, ITN, BBC و SkyNews بۆ ئامادەکردنی هەواڵ لە ژێر گوشارێکی زۆردانو پەیاموەرگران بەتەواوی لێی بێئاگان، ئامانج لە پەخشکردنی هەواڵەکان تەنها بۆ ئەوە نییە راپۆرت لە سەر رووداوەکان ئامادە بکرێت، بەڵکو ئامانجێکی دیکەشی لە پشتەوەیەو بریتییە لە راکێشانی سەرنجی پەیام وەرگران، وەك چۆن رۆژنامەکان هەوڵدەدەن تیراژیان زۆر بێت بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو کۆمپانیانەی ریکلام بڵاو دەکەنەوە رابکێشن، کەناڵەکانی تەلەفزیۆنیش تەقەلای ئەوەیانە بینەرانیان لێیان رازی بێت. ئاماری زۆربوونی بینەران واتە زۆربوونی هەلی

بڵاوکردنــەوەی ریکلامــی زیـاتر. بێگومـان تـا بینــەری ریکلامــەکان زیـاتربن بەهاکەشیان زیاتر دەبێت.

رەخنە لەو گۆڕانکارییانەی لە پەخشکردنی هەواڵەکاندا درووست بووە:

ساڵی ۱۹۹۵ ریپۆرتەرێك بە ناوی "Alison Pearson" بەرنامەیەکی هەبوو بە ناوی *"رەخنە لە هەواڵەکان"* وتیایدا رەخنەی لـەو گۆڕانکارییانـە کـە لـە بریتانیـا لەسـەر چۆنێتی پێـشکەشکردن وپەخـشکردنی هەواڵەکانـدا درووسـت دەبـوون دەگـرت. ئـەم بەرنامەیـە پێیوابـوو ئـەو شـێوازە بـاوەی هەواڵـەکانی تێـدا پێـشکەش دەکرێـت، بـە پێـی پێویـست پـەیامەرگران ناچـارناکات تەلەفزیۆنـەکانیان بکەنــەوە، بۆیـە کۆمەڵـە شـێوازێکی جیـاواز گیرایە بەر کە زۆرترینیان لە ئەمریکا داهێنرابوون، بۆ ئەوەی هەواڵەکان بـە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ترو سەیرتر پێشکەش بکرێن. بە قسەPearson هەواڵـەکانی تەلـەفزیۆن کۆمەڵـە بەرهـەمێکی جیـاوازە، دەکرێـت لـە رێگـەی دروســتکردنی ســەرنج راکێــشانی تایبــەتو ناوبــانگی کــەناڵی هەواڵــەوە بفرۆشێتە بینەران.

ژمارەیەکی زۆر لەو ریپۆرتەرانـەی لـەو بەرنامەیـەدا بەشدارییانکردبوو، نیگەرانیی خۆیان بۆ شێوازی پەخشی هەواڵەکان لە سـاڵەکانی ۱۹۹۰ دەربـڕی. ئــەوان پێیــانوابوو جەختکردنەســەر راکێــشانی ســەرنجی زۆرتــرین بینــەرو رازیکردنــی دڵــی سیاســەتمەدارەکان، بوونەتــە رێگــر لــە بــەردەم خــستەڕووی هەواڵــەکانی تەلــەفزیۆن بــە شــێوەیەکی راســتو دروســت. جگــە لــەوەش ئامــادەکردنو پێــشکەشکردنی هەواڵــەکان لــە ژێــر کاریگــەری نەژادیدایــەو تەنانــەت هەواڵــە وەرزشــیو ئابوورییــەکانیش بــە شــێوەیەکی لایەنگرانــە دەخرێنـــــەڕوو. بـــــە بۆچـــــوونی Pearson زۆر بـــــەکارهێنانی وێنـــــەی ســـەرنجڕاکێشو دڵتـــەزێن لـــە هەواڵەکانـــدا خـــۆی لـــە خۆیـــدا پـــەیڕەوکردنی

سیاسەتی رۆژنامە بازاڕییەکانە. لەم سۆنگەیەشەوە ئامادەکارانی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان، لە رێگەی دانانی بودجەیەکی زۆر بۆ ناردنی پەیامنێر بۆ هەموولایەکی دونیا، پارەیەکی زۆر خەرجدەکەن بۆ ئەو راپۆرتانەی بە رووکەش سەرنجراکێشن و خەڵك دەخەڵەتێنن. یەکێکی دی لەو رەخنانەی ئاراستەی کرا ئەوەبوو کەناڵەکانی BBC,ITN و کۆمپانیاکانی سەتەلایت بۆ درێژکردنەوەی مۆڵەتی کارکردن پەیوەستدەبن بە حکومەتەوە. هەرچەندە ناڕاستەوخۆ حکومەت ناتوانێت دەست لە کارەکانیان وەربدات. لە راستیدا لە کەناڵەکانی پەخشی هەواڵی تەلەفزیۆنیدا شتێك نییە بە ناوی سەربەخۆیی تەواو، لەوانەیە هۆکارێکی ئەوەی هەواڵە خێراکان لە یەککاتدا لەو کەناڵانە بڵاودەبنەوە لەبەر ئەوەی سەرەوە بێت یا ریپۆرتەرەکە بەو پەڕی بێلایەنی و بەبێ مەبەست هەواڵەکان ئامادەبکات، بەڵام هەمو ئەو راپۆرتانەی پەخشدەکرێن، نوسخەیەکی ئامادەکراوی راستیەکانن.

## دیزاینی گرافیکی:

بینەرانی سەدەی بیست و یەك ئامادەنین وەك جاران تەماشای بێژەری هەواڵەکان بکەن کاتێك وێنەیەکی نەگۆڕ لە پشتی سەرییەوە دیارە. هونەری گرافیك بووەتە هۆی گۆڕانکارییەکی زۆر لەشێوازی پێشکەشکردنی هەواڵەکاندا. دەکرێت لە رێگەی ئەم هونەرەوە ئەو شتەی تەلەفزیۆن زۆر پێویستی پێیەتی واتە "وێنە" ئامادە بکرێت. لەو مێژووە کورتەی پەخشی هەواڵ لەکەناڵەکانی تەلەفزیۆندا هەیەتی، هیچ کاتێك هێندەی ئێستا پشتی بە وێنەو فیلم نەبەستووە، ئێستا یەك کەس دەتوانێت وێنەی رووداوێك بگرێت هەر لەو جێگەیەی تێدایە لە گەڵ راپۆرتەکەیدا لە رێگەی مانگی

دەستکردەوە ڕەوانەی هەموو جێگەیەکی دونیای بکات. بۆ ئەوەی بابەتی هەواڵەکە وردتر بێت، دەکرێت سوود لە هونەری گرافیك وەربگیرێت. ئەرکی گرافەرێك ئەوەیە لە ڕێگەی وێنە جووڵاوەکانی فیلمێکەوە بە کۆمپیوتەر سیناریۆیەك درووستبکات یان پێشینەی هەواڵەکەو ئەو ئامارو ژمارانەی پێویستن بکاتە وێنەو لە گەڵ ڕاپۆرتەکەدا پیشانیبدات. لێرەدا ئەرکی بێژەر تەنها ئەوە نییە ڕاپۆرتەکە بخوێنێتەوە، بەڵکو ئەویش هەندێجار دەبێتە بینەرو گوێ لەو کەسە دەگرێت کە وێنەکان شیدەکاتەوە. کەرەستەکانی گرافیك بۆ پێشکەشکردنی هەواڵەکان جێگەی دڵنیاییەو لە کاتی پەیوەندیکردندا کەمترین کێشەی هونەری درووستدەبێت. زۆر کەس لەوانەی کۆمپیوتەریان هەیەو ئینتەرنێت بەکاردەهێنن بۆ درووستکردنی ماڵپەڕی تایبەت بە خۆیان سوود لە هونەری گرافیك وەردەگرنو تا دێت ژمارەی ئەو کەسانەش روو لە زیاد بوونن. بۆیە دەکرێت بڵێین بینەرانی ئەمڕۆ ئەو پلانی گرافیکانەی لە هەواڵەکانی تەلەفزیۆندا دەیبینین دەرك پێدەکەن.

## فیلمی هەواڵەکان:

بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی لە تەکنەلۆژیای ڤیدیۆدا سەریهەڵداوەو لەبەر زۆربوونی ژمارەی ئەوکەسانەی کامێرای بچوکی ڤیدیۆیی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئگەری ئەو ئیحتماڵە زیادی کردوە کەوا زۆرجار لە لایەن کەسانی ئاساییەوە وەك وێنەگرە پسپۆرەکان وێنەی ڕووداوەکان بگیرێت. هەربۆیە جۆرو ژمارەی ئەو فیلمانەی لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە پێشکەشدەکرێن لە کاتی هەواڵەکاندا ڕوو لە زیادبوونن. تەنانەت هەندێك کەس کە لە ماڵ

دەردەچن بە نیازن بە کامێرا بچکۆلانەکانیان وێنەی رووداوەکان بگرن ئەو وێنەگرە ناپرۆفیشناڵانەی بە دوای راوکردنی ساتە تایبەتەکاندا دەگەڕێن، تاکو وێنەیان بگرن، زۆرجار لە لایەن هەندێك کەناڵی وەك CNN پارەیەکی خەیاڵیان پێدەدرێت، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو جۆرە ساتانە بۆ ئەو جۆرە راوچیانە کەمتر بووە. چونکە سەرنووسەرەکان دەیانەوێت وێنەکان بچوکبن و بە کامێرای دیجیتاڵ گیرابێتن و زۆر بە خێرایی بگەیەنرێنە ستۆدیۆی هەواڵەکان. هۆکارەکەشی ئەوەیە خێرایی پەخشکردنی هەواڵەکان لە تەلەفزیۆنەکاندا زیاتر بووە.

پیشاندانی خەڵکانی برسیو ئەوانەی لە سەرەمەرگدان، دەبێتە هۆی ئەوەی بینەران هەڵوێستێکی تایبەت پیشانبدەن. زۆر جەختکردنە سەر وێنەی دڵتەزێن دەبێتە هۆی سەرلێشێواندنی بینەرانو لە رەوتی گشتی هەواڵەکان دووریاندەخاتەوە. جگە لەوەش پیشاندانی تەنها وێنەی رووداوەکان بە بێئەوەی هیچ روونکردنەوەیەکیان لە سەر بێت، بینەر تووشی سەرسوڕمانو سەرلێشێوان دەکەن. کاتێك گەرمو گوڕی هەواڵەکان دادەمرکێنەوە، پێویستە راپۆرتی درێژترو تەواوکەر لە سەر چۆنێتی رووداوەکە پیشا بدرێت. ئەو جۆرە زانیارییانە بە زۆری لە بەرنامە دۆکومینتارییەکاندا دەخرێنەڕوو. ئەوە لەو نووسینو راپۆرتە درێژانە دەچێت کە لە رۆژنامەکاندا چاپدەبن.

## دیدگا کولتوورییەکان:

هەر گەلو نەتەوەیەك لە ڕوانگەی دیدگای کولتووریو بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆیەوە ڕووداوەکان هەڵدەسەنگێنێت. هەرچەندە ئەوە شتێکی سرووشتییە، بەڵام لە هەمانکاتدا مایەی نیگەرانییە. ئێمە دەبێت تا پێماندەکرێت خۆمان دووربخەینەوە لە بەرژەوەندیو خواستە شەخسییەکانمانو ڕووداوەکە بە شێوەیەکی بێلایەنانە هەڵبسەنگێنن. یەکەمین کاردانەوەی پەیامنێر ئەوەیە زۆرترین چاوپێکەوتن لە گەڵ ئەو کەسانەی ڕووداوەکە بە شێوەیەکی کورتو ڕوون دەگێڕنەوە بکات. بۆیە پەیامنێر یەکسەر دەچێت بۆ لای ئەو کەسەی پسپۆرە لەو بابەتەدا.

هەر لەبەر ئەوەشە بینەران لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا لە دیدگای ڕۆژئاواوە هەواڵو ڕووداوەکانی دونیایان پێشکەشدەکرێت. شەڕی ڤێتنام نمونەیەکی دیاری ئەوە مەسەلەیەیە. ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا خەڵکی ڤێتنامی باکووریان لە شێوەی دوژمنانی دیموکراسی پیشانی پەیامەرگرەکان دەدا. چونکە ئەوانە لە لایەن کۆمەنیستەکانی چینو یەکێتی سۆڤیات کە لەو کاتەدا لە گەڵ ڕۆژئاوا ناکۆك بوون، پشتگیری دەکران. کەچی ڤێتنامی باشوور لە لایەن چەندین وڵاتی ڕۆژئاواییەوە دەپارێزراو بە پارێزەری دیموکراسیو سیستەمی سەرمایەداری دەدرایە قەڵەم. پەخشکردنی هەواڵ لەو دیدگایەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕاستی ڕووداوەکان لە هەردوو لاکەیەوە بشێوێنرێت.

لەوانەیە گرنگیدانی میدیاکان بە بابەتی تایبەت زۆر بە خێرایی کەمرەنگبێتەوە. ئاژانسەکانی دەنگوباس بە بەردەوامی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی زۆرترین پەیامەرگر، بە سیاسەتەکانی خۆیاندا دەچنەوە. ساڵی ١٩٧٠

کەناڵـەکانی راگەیانـدنی ئـەمریکا هێنــدە گرنگییــان بــە هــەواڵی نــاردنی سێیەمین کەشتیی ئاسمانیی بۆ بۆشایی ئاسمان نـەدەدا، بـەڵام کاتێـك ئۆپۆڵۆ ١٣ تووشی کێشەی تەکنیکی هـاتو ناردنەکـەی کەوتـە مەترسییەوە، بـوو بـە مانشێتی سەرەکی هەواڵی میدیاکان. ئێـستا نـاردنی کەشـتیی ئاسمـانیی هـیچ گرنگیەکی ئەوتۆی پێنادرێت تەنها لـەو حاڵەتـەدا نـەبێت کـە تووشـی کێـشە دەبێت.

کومەڵـە هۆکـارێکی دیکـەی وەك مەسـەلەی دارایـی وکەسـایەتییەکانو سیاسەتو کولتورو مێژوو و تەکنەلۆژیا کاریگەریان هەیە بۆ سەر نـاوەڕۆکی هەواڵـەکان. وەك لـە پێـشدا وتمـان ئـەو مەسـەلانەی کاریگـەریان هەیـە لـە کۆکردنەوەی هەواڵەکاندا زۆر زۆرترن لەوەی ئێمە تەسەوری دەکەین.

# ١٣

# هەواڵەکانی تەلەفزیۆن (٢)

بـە دەگمـەن دەتوانیـت کەسـێك بدۆزیتـەوە تەمـەنی لـە ٥٠ سـاڵ زیـاتر نەبێتو بەشێکی زۆری تەمـەنی لـە تەماشـاکردنی هەواڵەکانی تەلـەفزیۆنو ئەو فیلمە دیکۆمینتارییانەی سەبارەت بە گۆڕانکارییەکان درووسـت دەکـرێن نەبردبێتە سەر. زۆربەی ئەوانەی دەیانەوێت لە بەشی هـەواڵی تەلەفزیۆنـدا ئیشبکەن ئامانجیان ئەوەیە یان ببنە ریپۆرتەر یاخود وەك بێژەر کار بکەن. سەرەڕای ئەوەش زۆربەی ئەوانەی ئێستا ناوبانگیان هەیە لـە بەشـی هـەواڵی تەلەفزیۆنـــەکانی بریتانیـــا لـــە کـــاتی چـــاوپێکەوتنو خوێندنـــەوەی ژیاننامەکانیان باس لەوە دەکەن بەو مەبەستانە نەهاتوونەتە بوارەکەوە. لـە ڕاستیدا تاکو ساڵانی ١٩٥٠ بـۆ ١٩٦٠ و سـەرەتای ١٩٧٠ بێـژەری ریپۆرتـەرەکانی تەلـەفزیۆن وەك ئەوانـەی ئـەمڕۆ ناوبانگیـان نـەبوو. هەواڵـەکان کـاتی کـەمتریان پێـدەدراو مـاوەی نێـوان پەخـشی هەواڵـەکان زۆر درێـژبوو. کەناڵەکانی دیکەش کەمتر لەو بـوارەدا قووڵدەبوونـەوە. ئـەوەش پێـچەوانەی ئەمڕۆیـە کـە کـاتێکی زۆرتریـان بـە بەشـی هەواڵـەکان داوە. هەفتـە نییـە ڕۆژنامەکان سـەبارەت بـە کەناڵەکانی ITN،BBC و بەرنامـەکانیان بابـەت نەنووسن، تەنانەت هەندێجار کەناڵەکانی تەلەفزیۆن پەخشی ئاسایی خۆیان کـە بریتییـە لـە پێـشکەشکردنی هەواڵـەکان، ڕادەگـرنو دەسـتدەکەن بـە ناساندنو هاندانی ریپۆرتەرو بێژەرەکان، بەڵام لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەکاندا شتی

وا پەیڕەو ناکرێت.

ئەمڕۆکە ریپۆرتەری تەلەفزیۆنەکان بە هۆی ئەو پەیوەندییە رۆژانەو بەردەوامەی لە گەڵ خەڵکدا هەیانەو ئەو گرنگیدانەی کە میدیاکانی دیکە پێیان دەدەن، بوونەتە خەڵکانی ناسراو و بەناوبانگ. لە گەڵ کۆمپانیاکانی هەواڵدا گرێبەست دەکەن‌و زۆرجار لە بۆنەو مەراسیمەکاندا خەڵات دەبەخشن‌و تاریش دەخوێننەوە. تەنانەت هەندێجار خۆیان دەبنە بابەت بۆ هەواڵەکان، "مارتن بڵ" و "گوس ماکدوناڵد" دوو نموونەی ئەو بێژەرانەن لە ئاستێکی باڵادان‌و لەم ساڵانەی دواییدا چوونە بواری سیاسەتەوە. نموونەیەکی دیکەی خەمهێنەر، تاوانی کوشتنی دڕندانەی بێژەری هەواڵەکانی کەناڵی BBC "جیل داندۆ"یە کە لە ساڵی ۱۹۹۹دا بوو بە مانشێتی سەرەکی زۆربەی کەناڵەکانی راگەیاندن.

ماوەیەکی زۆری بردووە تا بێژەرو ریپۆرتەرەکان بوونەتە کەسانی ناودار. هەردەبوو ئەوە رووبدات، چونکە ئەو کاتەی بۆ بەشی هەواڵەکان تەرخانکرابوو زۆرتر بوو لە جاران، تەلەفزیۆنی رەنگاورەنگ جێگەی رەش‌و سپی گرتبۆوە، هەواڵەکان بە شێوەی ئەلکترۆنی کۆدەکرانەوە نەك بە فیلم. لە هەمانکاتدا رایگشتی حەزی لە دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی نوێ هەبوو.

لە ساڵەکانی ۱۹۵۰ دا "رابین دی" پەرەیەکی نوێی لە مێژووی هەواڵەکانی تەلەفزیۆندا کردەوە. ئەو رۆژنامەنووسە کاتێك چاوپێکەوتنێکی لە گەڵ عەبدولناسری سەرۆکی میسردا ئەنجامدا، کۆمەڵێك پرسیاری راشکاوانەی وای لە ناسر کرد، تاکو ئێستا هیچ ریپۆرتەرێکی ئینگلیزی ئەو شێوە چاوپێکەوتنەی لەگەڵ هیچ سیاسەتمەدارێکدا نەکردووە. تێکستی نووسراوی ئەو چاوپێکەوتنە لەوانەیە بۆ ستایلی ستانداردی ئەمڕۆ نەگونجێت‌و زۆر سادە بێتەپێشچاو، بەڵام ئەوکاتە بریتانیاو میسر بە هۆی ئەو شەڕەی لە

سەر کەنداوی سویس هەیانبوو پەیوەندی دیپلۆماتیان نەبوو، ئەوە یەکەمجار بوو ریپۆرتەرێکی تەلەفزیۆنی ببێتە مانشێتی سەرەکی زۆربەی رۆژنامەکان. لەم قۆناغەدا ریپۆرتەرەکان وردە وردە لەو حاڵەتی نەناسراوییە دەرچوون‌و بوون بە خاوەنی ناوناوبانگی تایبەت بە خۆیان.

هەواڵەکانی شەڕی ڤێتنام لە هەموو رووداوەکانی دی زیاتر کاریگەری لە دەرکەوتنی ئەستێرەی رۆژنامەنووسان لای گەلی بریتانیا هەبوو. شەڕی ڤێتنام دواتر بە شەڕی تەلەفزیۆن ناوی دەرکرد، خاڵی وەرچەرخان بوو لەوەی تەلەفزیۆن ببێتە سەرچاوەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی گۆڕانکارییەکانی جیهان، چونکە رۆژانە رۆژنامەنووسان‌و پەیامنێران لە سەرتاسەری دونیاوە دەهاتن‌و راپۆرتی وێنەییان لە سەر شەڕو شۆڕی ڤێتنام دەناردەوە. زۆربەی راپۆرتەکان بریتی بوون لەو راپۆرتە مەترسیدارانەی لە ناوجەرگەی دارستانەکانی "ڤێتنام"ەوە ئامادە دەکران‌و لەو جەنگەڵانەوە تەقە لە دوژمنی نەبینراو دەکرا. ئەم رەوتە ساڵی ١٩٦٨ پاش ئۆپراسیۆنی " Tet Offensive" گۆڕانکاری گەورەی بەسەرداهات، لەم ئۆپراسیۆنە سەرشێتانەدا "ڤیت کونگ"یەکان لە ناو جەرگەی سایگۆنی پایتەختی ڤێتنامی باشووردا تووشی شەڕێکی قورس هاتن، "جولیان پیتفێر"ی پەیامنێری کەناڵی BBC لە ژێر ئاگرو گوللەبارانی شەڕەکەدا هەواڵی دەناردەوەو ملیۆنەها بینەریش لە سەرتاپای بریتانیا دەیانبینی.

ئۆپراسۆنی Tet هاوکات بوو لە گەڵ ساڵی نوێی چین‌و ئەمریکاو رۆژنامەنووسە بیانییەکانی بە تەواوەتی غافڵگیرکرد، سەرەتا وادەزانرا ئەو تەق‌و تۆقە هی ئەو تەرەقانەیە کە بۆ خۆشی هاتنی سەری ساڵی نوێ دەکرێن بە ئاسماندا و وادەزانرا یارییە ئاگرینەیە، بەڵام دواتر دەرکەوت کە شۆڕشگێڕان خەریکی داگیرکردنی شارەکەن. پیتفێر لە راپۆرتەکەیدا شان بە

شانی سەربازانی ڤێتنامی باشور وێنەی شەڕی کۆلآن بە کۆلآنی دەگرت‌و لە گەڵیاندا بە سکەخشکێ‌و پسکەپسك لە وێنەکاندا دەردەکەوت. بە هۆی ئەو راپۆرتەوە سەرکەوتنێکی وای بە دەستهێنا تا ئەو کاتە هیچ وێنەو راپۆرتێکی دی بە دەستی نەهێنابوو. ئەو لە رێگەی راپۆرتەکانییەوە گۆڕەپانی شەڕەکەو هات‌و هاوارەکانی دەهێنایە ناو ماڵەکانەوە. مارتن بلّ و کیت بارۆن دوو پەیامنێریی دیکەی بریتانی بوون لە کاتی شەڕی ڤێتنامدا ناوبانگیان دەرکرد.

ئیتر پەیامنێرەکان بە چاوی قارەمانەوە تەماشا دەکران‌و وادەهاتنە پێشچاو جلی خاکییان لە بەردایەو خۆیان مەلآسدەدەن بۆ ئەوەی گوللەیان بەر نەکەوێت. ئەم سیناریۆیە وردەوردە تەشەنەی سەند، بە جۆرێك لە ماوەی سی ساڵی دوایی سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە سەر مۆنیتەری تەلەفزیۆنەکاندا دەبینرا.

ئەرکەکانی پەیامنێر و ریپۆرتەر:

ئەو ریۆرتەرو پەیامنێرانەی بۆ کەناڵە بینراو و بیستراوەکان کاردەکەن بە هۆی جۆری کارەکەو ئەو رێکخراوەی کاری بۆ دەکەن، لەوانەیە رەوانەی ئەم لاو ئەولای دونیا بکرێن. پێشینەی ئەو کەسانە جیاوازو جۆراوجۆرن، هەندێکیان پاش تەواوکردنی خوێندن‌و خولی راهێنان هاتوون‌و هەندێکی دیکەیان لە رۆژنامەو رادیۆوە هاتونەتە تەلەفزیۆن، زۆریشیان پێشتر لە بواری دیکەدا کاریانکردووەو دووربوون لە پەیامنێریی. هەڵەبەت دەبێت بزانین دوور نییە خەڵکانی دیکەی وەك پسپۆرانی بواری زانیاری‌و پەیوەندییەکان‌و هونەرمەندانیش بێنە ئەم بوارەوە. پەیامنێران دەکرێن بە دوو دەستەوە: دەستەیەك بە شێوەیەکی گشتی‌و لە سەر هەموو شتەکان راپۆرت ئامادە دەکەن، بەلآم دەستەی دووەم تایبەتمەندن بە بابەت یان

وڵاتێکی دیاریکراوەوە. لە زمانی ئینگلیزی بە دەستەی یەکەم دەوترێت (Reporter)و بە دەستەی دووەمیش دەوترێت (Correspondent).

سیاسەتی BBC وایە ئەوانە دادەمەزرێنێت کە خولی باوەڕپێکراوی پەیامنێرییان لە وڵاتەکە تەواوکردبێتو لە لایەن "ئەنجومەنی فێرکردنی پەیامنێریی کەناڵە بیستراو و بینراوەکان "ەوە تەزکییە کرابن، یان دەبێت ئەو کەسانە پێشینەی کارکردنیان لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا هەبێت. ئەوانەی دێنەدامەزراندن لە کەناڵە نیشتمانییەکاندا پێویستە پاش وەرگرتنی ئەزموونی کارکردن لە کەناڵە لۆکاڵییەکاندا خولێکی ڕاهێنان لە سەر ئامادەکردنی ڕیپۆرتاژ لە سەرتاسەری وڵاتەکەدا تەواو بکەن. ئەنجا دەنێردرێن بۆ سەرتاسەری دونیا تاکو کاربکەن.

BBC یش وەك ئاژانسەکانی دی دەنگوباس لە نێوان ئەوانەی داخوازی دامەزراندن پێشکەشدەکەن، تەنها ئەوانە هەڵدەبژێرێت زۆریان حەز لەو پیشەیە هەیەو توانای نووسینو درککردنیان بە ڕووداوەکانی دونیا لە ئاستێکی باڵادایە. بە قسەی " ریچارد سامبروك" سەرۆکی بەشی هەواڵەکانی BBC جگە لە هەموو ئەو توانایانە پێویستە فاکتەرێکی زۆر گرنگی دی تێدا بێت بە ناوی" x_ factor "، ئەو فاکتەرە تایبەتە بە تایبەتمەندییە شەخسییەکانو بۆ ڕاپۆرتی تەلەفزیۆنی زۆر پێویستە. وەك چۆن دەبێت ڕیپۆرتەری ڕادیۆ توانای دەربڕینی زۆر بەهێز بێت، پێویستە ڕیپۆرتەری تەلەفزیۆنیش جەزابییەتێکی زۆری هەبێت. مەبەست لە جەزابییەت شێوەو ڕوخساری نییە، بەڵکو ئەو توانایەیە کە لە ڕێگەیەوە پەیوەندی توندو تۆڵ لە نێوان خۆیو بینەراندا درووستدەکات. لە ڕاستیدا دیمەنی سەرنجڕاکێشی ڕیپۆرتەر لەوانەیە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی بەهای هەواڵەکە، "factor x_" ئەو جەزابییەتەیە هونەرمەندانی سینەماو شانۆ لە کاتی نمایشکردندا

هەیانە.

ریپۆرتەری تەلەفزیۆنیو ئەکتەر خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە، زۆر لەو ریپۆرتەرانەی بەسەر کارەکەیاندا زاڵن لە سەرەتادا ئەکتەر بوون. خاڵی هاوبەشی هەردوو پیشەکە ئەوەیە دەتوانن بە ئاسانی پەیوەندی ببەستن.

ریپۆرتەر تەنانەت ئەگەر لە ژیانی رۆژانەیدا کەسێکی دورەپەرێز بێت، دەبێت وەك ئەکتەر بتوانێت مێشکی خۆی بە جۆرێك چالاك بکات تا رۆڵەکە بە تەواوی ببینێت. هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نییە وەك ئەکتەر رۆڵی کاراکتەرێکی دی ببینێت. ئەو کاتە کاری ریپۆرتەری لە ئەکتەر نزیك دەبێتەوە کەوا هەوڵدەدات بەسەر تووڕەییو ناڕەحەتی و خۆشحاڵییە دەروونییەکانی خۆیدا زاڵبێت. چاوپێکەوتن لە گەڵ کەسێك بۆچوونە سیاسییەکانی لە گەڵ بۆچوونەکانی تۆدا ناکۆکن کارێکی ئاسان نییە. کاتێك ئەوەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدا دەکەی شتێك دەرببڕێت کە پێچەوانەی بیروڕای تۆ بێت، لەوانەیە زۆر بە ئاسانی ئارامیی خۆت لە دەستبدەیت. لە بیرت نەچێت پەیامنێر نابێت لە گەڵ ئەو کەسەی چاوپێکەوتن دەکات هەڵسوکەوتی توند بێت، چاوپێکەوتن لە گەڵ دیکتاتۆرێك کە بەرپرسی زیندانیکردنو کوشتنو ئەشکەنجەدانی هەزاران مرۆڤە، یەکێکە لە قەیراناویترین ئەرکەکانی ریپۆرتەرێکی تەلەفزیۆنیی، هەر لە بەر ئەوەیە ئەو کارانە زۆر بە دەگمەن دەدرێنە ریپۆرتەرە تازەکارەکان.

توانای قسەکردن:

زۆر لە ریپۆرتەرەکان ئەوە بە کابوسێکی گەورە دەزانن کە پەیوەندی لە گەڵ هەزاران بگرە ملیونەها مرۆڤ دەبەستن. ئالێرەدایە پێویستە سویچپلاکی رۆڵبینین لە مێشکی مرۆڤدا بکەوێتەکار. لە کاتێکدا گەر لە بیرتکرد پلاکەکە بکەیتەوە لەوانەیە کارەساتێك روو بدات. پێش قسەکردن

لە بەرامبەر کامێراکە تەنها ئەوە بەس نییە قومێك ئاو بخۆیتەوە، یان قورگت پاکبکەیتەوە یان تەنانەت قژەکەت هەڵبدەیتەوەو نەهێڵیت بێتە ناو چاوتەوە. زمانی تۆ کەرەستەیەکی نادڵنیایە بۆ وتنی بابەتێك ئامادەییت تێدا نییە بۆ وتنی و لەوانەیە نەتوانیت بە شێوەیەکی تەواو وشەکان دەرببڕیت. لە کۆتایی زماندا پارچە ماسولکەیەك هەیە وەك دارێکی ریشەدار بۆ ئەوەی بتوانیت بە شێوەیەکی باش بیجولێنیت پێویستە وەك هەموو ماسولکەکانی دیکەی لەشت راهێنانی پێبکەیت. هەموو کەسێك پێویستی بەوە نییە راهێنان بە زمانی خۆی بکات، بەلام ئەوکارە بۆ بێژەران و ئەکتەرەکان زۆر پێویستە.

ئەکتەرەکان پێشئەوەی رۆڵەکانیان بگێڕن هەندێك راهێنانی نەرم دەکەن و خەیاڵیان ئارامدەکەنەوە. ئەو کارە بۆ بێژەران و ریپۆرتەرەکانیش زۆر بە سوودە. ئەگەر بۆ خوێندنەوەی راپۆرتەهەواڵێك خۆت ئامادەبکەیت یان بتەوێت چاوپێکەوتنێك بکەیت، دەتوانیت ئەم راهێنانەی خوارەوە بکەیت:

زمانت بێنە دەرەوەو بیبەرە سەرەوە.

بێئەوەی زمانت ببەیتە ناوەوە هەوڵبدە بە زمانت لێوی سەرەوەت تەربکەیت و پاشان بە هەمان شێوە لێوی خوارەوەت تەڕبکەیت و پاشان تا پێتدەکرێت زمانت لە سەری لوتت نزیکبکەرەوە.

ئەو کارانە دووبارەبکەرەوەو پاشان ئاراستەکانیان بگۆڕە. ئەو راهێنە واتلێدەکات هەندێك هەست بە ئازار بکەیت، بۆ راهێنانی زمان هەندێك راهێنانی ئاسانترو کەمئازارتر هەیە، بەلام دەبێت لەگەڵ ئەو راهێنانەی سەرەوەدا ئەنجامبدرێن.

زمانت بخەرە نێوان لێوەکانتەوەو بە توندی پاڵی پێوەبنێ بۆ دەرەوە.

هەرچەندە ئەو كارە شتێكی ناشيرینە بەڵام كاریگەرییەكەی زۆرە.

تا پێتدەكرێت زمانت بهێنە دەرەوەو پاشان بە ئارامیی بۆسەرو خواری ببە.

وتنەوەی رستەو وشەی سەختو هاوشێوەی یەكدی لەوانەیە هاوكاریت بكات تاكو بەسەر زماندا زاڵ بیتو چۆنت بوێت بەكاری بهێنیت، ئەكتەرەكان پێشئەوەی بچنە سەر تەختەی شانۆ ئەو وشەو رستانە دووبارە دەكەنەوە. وشەكان بەو پەڕی وریاییەوە بەكار بهێنە. تایبەتمەندی ئەو راهێنانە لەوەدایە زمانت نەرمو دەربڕینت رەوانتر دەكاتو هەستی پشتبەستن بە خۆت لا بەهێزتر دەبێت. دەتوانیت راهێنانی دەنگیش بكەیت. دەكرێت وەك گۆرانی بێژانو ئەكتەرەكان خاوەنی دەنگێكی بەهێزو روون بیت. ئەو راهێنانەی لە خوارەوە باسیان لێوەكراوە زۆر ئاسانن، گەر بە پشتدا پاڵبكەویت باشترین ئەنجامت دەستدەكەوێت. هەروەك دەكرێت بە وەستان یان دانیشتنیش ئەوكارە بكەیتو سوودی لێوەربگریت بەو مەرجەی وەستانەكەت باشبێت. وەك راهێنانەكانی زمان هەوڵبدە ئەم راهێنانەش بە رێكو پێكی بكەیت. جێگەیەكی چۆڵو بێدەنگ بۆخۆت بدۆزەرەوە، دەبێت هێمنو لەسەرخۆ بیت، ئەركی تۆ ئەوەیە بەو توانایەی هەتە پەیوەندیەكی باش دروستبكەیت، ئەم راهێنانانە یارمەتیت دەدەن تاكو لە كاتی دەربڕینی وشەكاندا خێرا بیتو بەرزكردنەوەو ریتمی دەنگت لە كاتی خوێندنەوەی راپۆرتەكەدا گونجاو بێت:

هەناسەیەك بدەو لە كاتی هەناسەدانەوەتدا وشەیەكی وەك مااا و موووو بڵێرەوە، ئەو كارە بە شێوەیەكی تەواو بكەو هەوڵبدە بەرزكردنەوەی دەنگت لە ئاستێكی یەكساندا رابگریت.

لە خەیاڵی خۆتدا وای دابنێ ئەو زاراوە لە بەرامبەر تۆدا دەوترێت.

مەرج نییە دەنگت بەرز بێت، بە هێمنی بیڵێرەوە، تەنها ئەوە لە بیرمەکە دەبێت بەرزکردنەوەو نزمکرنەوەی دەنگت لە کۆنترۆڵی خۆتدا بێت.

هەوڵبدە زاراوەکان بە شێوەیەکی ڕاستو درووست بڵێیتەوەو تا هەناسەت تێدایە بەردەوام بە.

هەناسەیەکی دی هەڵبکێشەو ئەمجارەش وشەیەکی " ئەلوووو "بڵێرەوە.

فێری ئەوە بە چۆن ڕەخنە لە خۆت دەگریتو بە بابەتەکانی خۆتدا دەچیتەوە. وەك ئەوەی خۆت چاودێری خۆت بکەیت. لە دوورەوە چۆنێتی دەربڕینەکانت لە بەرچاو بگرە، پێویست ناکات لەو جوڵەو عادەتانەی هەتە نارەحەت بیت. ئەو جوڵانە نابنە هۆی کەمکرنەوەی ڕێزو حورمەتی تۆ، بگرە زیاتری دەکەن. بەڵام بەو مەرجەی ئەو جوڵانە دەستکرد نەبنو بۆ خۆدەرخستن نەبن، هەمیشە وەك خۆتبەو جوڵەی خەڵکانی دی دووبارە مەکەرەوە.

## پلاندانان ❖

دروشمی پێشەنگەکان *"هەردەم ئامادەبە"* بۆ پەیامنێرانیش دەشێت. هیچ پەندێك هێندەی ئەو پەندە بۆ پەیامنێر بەکەڵك نییە. ئەو کاتەی پاش هەوڵو تەقەلایەکی زۆر وەك ڕیپۆرتەر لە بەشی هەواڵی تەلەفزیۆن دادەمەزرێیتو دەستبەکار دەبیت، بوویتە پەیامنێرێکی خاوەن ئەزموونو لە کۆکردنەوەی راپۆرتو هەواڵدا زانیاری زۆرت هەیە، سەرنووسەری بەشی هەواڵ سەرەتای هەواڵەکەت پێدەداتو تۆش لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر دەکەیتو راپۆرتە هەواڵی بۆ ئامادە دەکەیت، هەڵبەت خۆت دەزانیت

ئەوكارەی پێشتر کردووتە بەم شێوەی ئێستا نەبووە.

بەشی هەواڵی تەلەفزیۆنەکان سیاسەتی جیاوازیان سەبارەت بە هەڵسوکەوتی پەیامنێران و ریپۆرتەرەکانیان هەیە، پارمەتی هەندێك لە پەیامنێران زیاتر دەدەن و هەندێکیان کەمتر، بەڵام پێویستە پەیامنێران لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا پشت بە ئەزموون و وزەو تواناو شارەزایی خۆیان ببەستن. خۆت لە سەر ئەوە رابهێنە بەبەردەوامی دوو جانتا لە گەڵ خۆتدا هەڵبگری و ئەم شتانەی خوارەوەیان تێدا بێت:

جل و بەرگی گونجاو بۆ هەوای ساردو گەرم.

نەخشەی رێنمایی و تەقویمی ساڵ و سەعاتی شوێنەکان.

سەعاتی زەنگدار.

پێداویستی تەندروستی.

کەرەستەی فریاکەوتن.

تەقسیمی کارەبا بە قەبارەی جیاوازەوە.

قیبلە نما.

ئووتوو و بۆیاخی پیلاوی سەفەری.

رادیۆی شەپۆلی کورت.

ریکۆردەری بچووك یان مینی دیسك.

کامێرای ئۆتۆماتیکی.

ئەو چەقۆیەی بۆ چەند مەبەستێك بەکار دێت.

لایتی بچووك.

پارەی کاش.

باشتروایە دژی نەخۆشییەکانی تیفۆئیدو ئاوڵەو تای ماڵتاو کزاز خۆت بکوتی. بۆ ئەوەی تووشی مەلاریا نەبیت، پێویستە پێش و پاش سەفەرەکەت

حەپی تایبەت بخۆیت. هەوڵبدە لەو وڵاتانەی مێشوولەی مەلاریایان هەیە خۆت داپۆشی.

ئەگەر لە جانتاکەتدا سرنج یان دەرزیت پێیە لەکاتێکدا دەچیتە وڵاتێکەوە پیشانی بەرپرسانی گومرکی بدە با گومانی ئەوەت لێنەکەن بۆ موخەدەرات بەکاری دەهێنیت.

بۆ لێخوڕینی سەیارە لە وڵاتانی دیکەدا دەبێت مۆڵەتی شۆفێری نێونەتەوەییت هەبێت. پێشئەوەی سەفەرەکەت بکەیت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە زانیاری لەسەر ئەو وڵاتەی بۆی دەچیت کۆبکەرەوە. پێویست ناکات زۆر خۆت سەرقاڵ بکەیت لە ژوورەکانی گەڕاندا. یەکسەر سایتێکی جێگەی باوەڕ کە پێشتر تاقیت کردووەتەوە بەکار بهێنە. جگە لە ئینتەرنێت لەوانەیە لە دەفتەری یادەوەرییەکانتدا هەندێك زانیاریت لە سەر ئەو وڵاتەی بۆی دەچیت هەبێت. هەموو ئەو پرسیارانەی لات درووست بوون بخەرەڕوو، چونکە دواتر هیچ پرسیارێك وەڵام نادرێتەوە. کاتێك دەچیتە وڵاتێکەوە پێویستە ئاگات لە داب و نەریتی خەڵکی ئەو وڵاتە بێت. چونکە ئەو زانیارییانە یارمەتیت دەدەن زیاتر بەسەر کارەکەتدا زاڵبیت. جگە لەوە لەوانەیە بتوانیت هاوڕێ بۆ خۆت بدۆزیتەوە. گەر دەتەوێت وەك پەیامنێر کارەکانت بە باشی ئەنجامبدەیت ئەو خاڵانە گرنگییەکی زۆریان هەیە.

کاری پراکتیکی:

شێوازی هاوکاری و هەماهەنگی تۆ لە گەڵ دەستەکەدا مەسەلەیەکی گرنگەو پێویستە لەبەرچاو بگیرێت. ڕاپۆرتەکەت لە حەوشەی دادگایەکەوە ئامادەبکەیت، یان لە ناوجەرگەی شەڕێك بێت لەو پەڕی دونیا، دەبێت ئاگات لە چۆنێتی ئەو هەماهەنگییە بێت. دەستەکەی تۆ لە دوو کەس پێکدێت.

خۆت وەك پەیامنێرو ئەوی دیکەش وێنەگرەکەتە.

بە شێوەیەکی گشتیی لە زووری کار وێنەگران هەمیشە لە حاڵەتی ئامادەدان‌و کامێراو کەرەستە پێویستەکانی دیکەیان پێیە. لە دەرەوەی وڵات لەوانەیە پەیامنێران ناچاربن لە گەڵ وێنەگرانی ناوخۆیی‌و بیگانەش داوای هاوکاری بکەن. ئەوە بەندە بە هەلومەرجەکان‌و مەرجیش نییە ئەو دوو جێگەیە لە یەکبچن.

ساڵ لە دوای ساڵ دۆستایەتی‌و هاورێتی لە نێوان کەسەکاندا درووستدەبێت، بۆیە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر لە کاتی ئامادەکردنی هەواڵێکدا یەکێك لەو دۆستە کۆنانەت رووبەڕوو بێتەوە. هەرچەندە وێنەگران‌و ریپۆرتەرەکانی دی وەك رەقیب دێنە ژماردن، بەڵام پێشینەی کارو ئامانجی هاوبەشی هەردوولا دەبێتە هۆی ئەوەی دۆستایەتییەکی قوڵ لە نێوانیاندا درووستببێت.

وێنەگرو پەیامنێرانی بە ئەزموون هەردەم ئامادەیی ئەوەیان تێدایە هاوکاری ئەوانەی تازە دەستبەکاربوون بکەن. زانیاری‌و ئەزموونی ئەو جۆرە کەسانە زۆر زۆر بەکەڵکە. دەستە جیاجیاکان بە شێوازی جیاواز کاردەکەن. هەرکاتێك وێنەگرێکی نوێت لە گەڵدا دێت پێویستە لە سەرەتاوە هەوڵی خۆگونجاندن بدەیت، ئەو خۆگونجاندنەش زۆر بە کەڵکە. تا زیاتر لەکاری یەکدی رازی بن، ئەنجامی کارەکەتان باشتر دەبێت.

ئەگەر تازەکاریت دەبێت ئەوە بزانیت وێنەگرەکە لە تۆ زیاتر ئەزموونی هەیە. وا نەزانیت لە رووی پلەوپایەوە لەو بەرزتریت، چونکە ئەوە راستە کاری هەردووکتان جیاوازە، بەڵام لە رووی گرنگییەوە وەك یەك وایەو پێویستە بەپشتبەستن بە تواناکانی یەکدی ئەنجامی بدەن. ئەوکەسەی توانای پەیوەندی کۆمەڵایەتی باشی تێدایە، دەتوانێت بە پێشکەشکردنی

چکلێتێك یان شەربەتێك پەیوەندی لە گەڵ بەرامبەرەکەیدا درووستبکات. پێشنیازی ئەوە بکە هەندێك شتی قورسی وەك ستاندی کامێراکەی بۆ هەلگریت. هەموو کاتێك ئەو کارەی لە گەڵدا دووبارەبکەرەوە. بەلام کامێراکەی بۆ هەڵمەگرە تا خۆی داوات لێدەکات، چونکە زۆربەی کامێرامانەکان وەك چاوی خۆیان کامێراکانیان دەپارێزن.

کاتێك وێنەی دیمەنێکی تایبەت دەگریت پێویستە لە گەڵ وێنەگرەکەدا راوێژ بکەی‌و رێز لە ئەزموونەکانی ئەو بگریت‌و بۆچوونەکەی پەسەندبکەیت. وێنەگرێکی باش دەبێت ئەوە شیبکاتەوە بۆ هەندێك دیمەن کاریگەرییان زۆرەو هەندێکی دی کەم؟ هەرگیز خۆت مەخەرە جێگەی دەرهێنەرو تەماشای یەك بەیەکی وێنەکان مەکە. لە کاتی مۆنتاژدا دەتوانیت ئەوە بکەیت. بەلام لە سەر کارەکەت باشتر وایە تەرکیز بکەیتە سەر کارەکەی خۆت. بەو حاڵەشەوە شتێکی چاکە گەر پرستان پێبکرێت سەبارەت بەو دیمەنەی وێنەی دەگرن.

رێکخستنی دیمەنی وێنەگرتن هەموو کاتێك بەو سادەییە نییە کە چاوەڕێ دەکرێت. هەندێك دیمەن هەن بە درێژایی مێژووی تەلەفزیۆن دووبارە دەبنەوە. بۆ نموونە وێنەی ریپۆرتەرێکی سیاسیی کە لە بەردەم "Downing street" یان Capitol building یان Scotland Yard وەستاوە دیمەنێکی دووبارەیە. دانانی دیمەنی ناسراو و دیار لە پشتەوە نموونەیەکی کلێشەییە. ئەگەر راپۆرتەکە سەبارەت بە شانۆگەرییەکە لە برودوای بۆ بینەری بریتانی، نابێت ریپۆرتەرەکە لە بەردەم پەیکەری ئازادیدا وەستا بێت. چونکە ئەو پەیکەرە رەمزی نیۆیۆرك‌و هەموو ئەمریکایە. ئەگەر ریپۆرتاژەکە تایبەتە بە شانۆگەرییەك پێویستە لەبەردەم هۆڵی شانۆکەوە بووەستیت. وێنەکان دەبێت بۆ ئەوانەی

لەو شوێنەدا ئامادەبوون یان لە ریپۆرتاژەکانی پێشتردا بینیویانە ئاشنا بێت. راستە ئەویش دیمەنێکی کلێشەییە. بەڵام دەکرێت لە رێگەیەوە شوێنەکە بۆ بینەران بگوێزرێتەوە.

پێشنەوەی دەستبکەیت بە وێنەگرتن، لەوانەی لە نزیکتەوە وەستاون پرسیاری سەرو سیمای خۆت بکە، لەوانەیە لە کاتێکدا سەیری ئاوێنەکەشت کردبێت بە کەم‌و کوڕیەکانی خۆتت نەزانیبێت. بۆ ئەوانەی پێشتر لە ریزی سوپا یان تیمی ژێردەریایی کاریان کردووە، داوای هاوکاریکردن بۆ رێکخستنی جل‌و بەرگ‌و کەرەستەکان شتێکی ئاساییە. ئەوە پێیدەوترێت "پێداچوونەوەی هاورێیانە" و پێویستە تۆش لە کارەکانتدا هەمان شت بکەیت. سوود لەو شێوازە وەربگرەو چاودێری هاورێکانت بکە، لەوانەیە رۆژێك نەك هەر رێزو حورمەتی تۆ بەڵکو هەموو ژیانت بکەوێتە گرەوی هەڵسوکەوتێکی لەو شێوەیەوە.

دیمەنی وا هەیە کێشەی لێدەبێتەوە، بۆ نموونە باشتر وایە لە کاتی وێنەگرتنی یاری فوتبۆڵێندا لەو جێگەیە نەوەستی کە هاندەرانی هەردوو تیپەکەی لێوە دێنە ژورەوە یان دەچنە دەرەوە. ئەو هاندەرانەی دێنە ژورەوە خۆشحاڵ‌و پێیانخۆشە لەبەردەم کامێراکاندا خۆیان بنوێنن. سەربنێنە سەری پەیامنێرەکان‌و تەعلیقیان لێبدەن. لەوانەشە لەکاتی چوونەدەرەوە بە پێچەوانەوە بگەرێنەوە. تا ئەو رادەیەی دەکرێت لە زەمینەی وێنەگرتنەکەوە هاندەران ببینی خۆت لە بینەران دووربگرە. دەتوانی لە بەرزاییەکەوە وێنەی هاندەران بگریت.

ئاگاداری جامی دوکانەکان بە وێنەکان عەکس دەکەنەوەو لە ئاوێنە دەچن. زۆرجار تاقمی وێنەگرو ئەوانەی بۆ سەیرکردن وەستاون لەو جامانەوە دەردەکەون. بوونی ئەو وێنانە لە فیلمەکەتدا دەبێتە هۆی نەمانی

سەرنجی بینەران لە سەر بابەتەکە.

ئــەو پەیامنێرانــەی ئاشــنای کــاری ڕیپۆرتــەرین بــۆ ڕادیــۆ. لــە کــاتی تۆمارکردنی بابەتەکانیان، لە گرنگی نەبوونی دەنگە دەنگ و ژاوەژاو دەگەن. ڕاستە مایکرۆفۆنەکانی ئێستا زۆر پێشکەوتوون، بەڵام ئاگات لەوە بێت لە کاتی تۆمارکردنی ڕاپۆرتەکەتدا لەو جێگەیە مەوەستە کەوا دەنگی خۆشت نابیــستی. بــە گــشتی دەتوانیــت لــە شــارێگەو فرۆکەخانــەو شــەقامە قەرەباڵغــەکان ڕاپــۆرت ئامادەبکــەیت. ئــەوەی هەنــدێجار دەبێتــە هــۆی غافلگیرکردنی پەیامنێران ئەو دەنگە چاوەڕوان نەکراوانەیە کە هەندێک جاریش بە ئەنقەست دێنە ناو دیمەنەکانەوە.

ئەو دەنگانە لەوانەیە دەنگی زەنگی کڵێسە یان ئاژیری ئامبولانس یان هەردەنگێکی دی بێت. یاسای گشتی ئەم حاڵەتانە ئەوەیە ئاگات لەو شتانە بێت کە دەکەونە ئیش یان دەجوڵێن یان تەقەتەق دەکەن.

یەکێک لە دژوارترین کاری پەیامنێریی ئەوەیە لە بەرامبەر ڕووداوەکاندا بە سۆزەوە مامەڵە بکات. لەوانەیە ناچار بیت ڕاپۆرت لە ناوچەیەکدا ئامادەبکەیت کە جەنگی تێدایە یان تازە بەتازە لە جەنگ دەرچووەو هەتیوخانەکانی پڕن لە هەتیوو منداڵی بێسەرپەرشت. دەستبگرە بەو خۆراک و کەرەستانەی کە هەتەو مەیدە بە کەس. کاتێک منداڵی برسی بەرەو لات دێن حەز دەکەیت هەموو ساندەویجەکانتیان بدەیتێ و چکلێتیان پێببەخشی، ڕاستە ئەوە کارێکی مرۆڤانەیە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک و لە هیچ هەلومەرجێکدا شتی وانەکەیت، چونکە ناتوانیت بە پاروە نانێک یان چکلێتێک ئەو هەموو خەڵکە برسییە تێربکەیت و لەوانەیە کێشەیەک بۆ خۆت درووستبکەیت. لەو حاڵەتەدا خەڵکی وا هەیە بە هۆی تەقەلاکردنەوە بۆ پارووە نانەکەی تۆ بریندار دەبێت و لەوەش تێناگات لەوە زیاترت

پێنییه. ئەرکی تۆ تەنها ئەوەیە ئەو بارە نالەبارە بگەیەنیت بە خەڵکی دونیا. یارمەتیدانی خەڵك كاری رێکخراوەکانی فریاکەوتنە نەك تۆ.

راپۆرتی یەك نەفەری:

لە سەرەتای دەستبەکاربووندا خوێندنەوەی راپۆرت بە تەنیایی لە بەرامبەرکامێرا بۆ پەیامنێر کارێکی زۆر سەختە. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات ئەوکارە زۆر ئاسان دەبێتەوە. هەڵبەت هەموو جارێك کات فریای پەیامنێر ناکەوێت. بە شێوەیەکی ئاسایی پەیامنێر روو لە کامێرا دەکات بێ کاغەز تێکستی راپۆرتەکە دەخوێنێتەوە، بەڵام لە کاتی خوێندنەوەی وردەکارییەکاندا وەك حوکمی دادوەر پەیامنێر بۆی هەیە تەماشای کاغەز بکات و ئەوەی نووسراوە بیخوێنێتەوە. وەك لە باسی راهێنانەکاندا وتمان ئەکتەرەکان هەندێك شێوازی تایبەت بە خۆیان هەیە دەبێت تۆش پەیرەویان بکەیت. بۆ ئەوەی ئەو راهێنانانە کاریگەرییان لە سەر تۆ هەبێت. هەوڵبدە لە جیاتی جەختکردنە سەر زاراوەکان بیر لە ماناکانیان بکەیتەوە. راپۆرتەکە بە دەستەواژەی جیاواز نەك رستەی یەکسان دووبارەبکەرەوە. سەرنج بدەرە تێکستی ئەم راپۆرتەی خوارەوە:

*کڵیسەی* st. duns tans *لە سەدەی پازدەیەمی زایینی درووستکراوە لە کاتی بۆمبارانەکەی ساڵی ١٩٤١ بێ زیان بوو. پاش وێرانبوونی شارەوانی خەڵك بەبەردەوامی بۆ کۆبوونەوەکانیان سوودیان لەم کڵیسایە دەبینی. جگە لەوە ئەو خەڵکەی بە هۆی هێرشی فڕۆکەکانەوە خانووەکانیان لە دەست دابوو پەنایان بردبوو بۆ ئەم کڵیسایە. لەوکاتەدا ژمارەی ئەوانەی بۆ خواپەرستی و دوعاو پاڕانەوە دەهاتن بۆ کڵیساکە رووی لە کەمبوونەوە کردووە.*

*بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو هەوڵەی بەرپرسانی کڵێساکە دەیدەن بۆ*

*فرۆشتنی زەوییەکانی دەوروبەری و لەوانەش گۆڕستانەکە، لە لایەن خەڵکەوە ڕووبەڕووی نارەزایەتی بوونەتەوە. چونکە پێیانوایە ئەو کڵیسایە بەشێکە لە مێژووی ئەو ناوچەیە. وا دەگێڕنەوە پادشای ئینگلیز "چارلسی یەکەم" لە کاتی شەڕی ناوخۆیی لەم کڵیسایەدا خواپەرستی کردووە و "دیك پرون" شەوێك لەسەر قەنەفەکانی ئەو کڵیسایەدا رۆژی کردووتەوە.*

*ئەگەر بەرپرسان بڕیارەکەیان جێبەجێبکەن ئەوە پێنجەمین کڵیسایە لەماوەی پێنج ساڵی رابردوودا بۆ دروستکردنی خانووی نوێ دەفرۆشرێتە کەرتی تایبەت. بۆ نارەزایەتی بەرامبەر فرۆشتنی کڵێساکە ئەندامێکی پێشووی ئەنجوومەن بە ناوی "روز متیوارد زلر" سەرۆکایەتی گروپێکی پارێزەری کڵیساکە دەکات. ئەندامانی ئەم گرووپە پێیانوایە ئەو کڵیسایە بەهای ئەوەی تێدایە پارێزگاری لێبکرێت، چونکە ئەو کاتەی بەشێکی زۆری شارەکە لە ژێر بۆمبارانندا وێران بوو ئەم کڵیسایە وەکو خۆی مایەوە.*

*ئەگەرچی قەشەی کڵیساکە "میدگیت" خۆی بەرپرسێتی ، بەڵام .ئەمرۆ هیچ لێدوانێك لەسەر ئەو مەسەلەیە نادات. کەچی بەرپرسانی دیکەی کڵیساکەو ئەنجوومەنی شار پێیانوایە بڕیاردان لە سەر پاراستنی کڵیساکە دەبێتە هۆی وێران نەبوونی بیناکە. بەڵام تەنانەت ئەم پێشنیازەش نەیتوانی رەزامەندی خەڵکی ناوچەکە بەدەستبهێنێت و راشکاوانە داوای بەردەوام بوونی چالاکییەکانی کڵیساکە دەکەن.*

هەوڵدان بۆ لەبەرکردنی ئەو هەموو وشانە کارێکی ئاسان نییە، هەم کاتت دەگرێتو هەمیش بێزارت دەکات، تا بیرت لای لەبەرکردنی زاراوەکان بێت وتنەوەی لە بەردەم کامێرا سەختتر دەبێت. نووسینەوەی تێکستەکە بە دەستی خۆت دەبێتە هۆی چەسپینی زانیارییەکان لە مێشکتداو یارمەتیت دەدات تاکو هەموو ئەو خاڵانەی مەبەستتە دەریببڕیت و راپۆرتەکەت بە

پێی کاتەکە رێکبخەیت. بەڵام ئەوە بەو مانایە نایەت هەموو ئەو وشانەی نووسیوتن وەکو خۆیان لە کاتی پێشکەشکردندا بخوێنیتەوە.

بە رەچاوکردنی ریزبەندی ناوەڕۆکی راپۆرتەکە. جەخت لە سەرخاڵە سەرەکییەکانی بکە: ئەو کڵێسایەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست بۆ فرۆشتن خراوەنەتە مەزادەوە. خەڵك دەیانەوێت کڵێساکەیان بپارێزن. بیر لە ئامانجەکانی خەڵك بکەرەوە. بەرپرسانی کڵێساکە دەیانەوێت بیفرۆشن. کەچی خەڵکی ناوچەکە دەیانەوێت بیهێڵنەوە.

بیر لە بەڵگەکانی هەردوو گروپەکە بکەرەوە: بەرپرسانی کڵێساکە پێیانوایە بەهۆی نەبوونی نوێژکەران هێشتنەوەی بێسوودە، بەڵام خەڵکەکە بۆ شوێنی کۆبوونەوەکانیان پێیانباشە بمێنێتەوە. دەبێت چی لە ژمارەو ئامارەکان بکەیت؟ لە بەرکردنی ژمارەکان کارێکی ئاسان نییە، دەکرێت لە جیاتی سەدەی پازدەیەم بڵێیت کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستو لە جیاتی ١٩٤١ بڵێیت شەڕی جیهانی دووەم. گەر پێویستیشی کرد دەکرێت لە سەر پارچەکاغەزێك بە خەتی گەورە بنووسیت: پێنجەمین کڵێسا، چارلسی یەکەم، دیك توورپین، هێرشی رۆکێتو کاغەزەکە بلکێنیتە ستاندی کامێراکەوە.

ئێستا هەوڵبدە رووداوەکە بە کورتیو بە لەبەرکردن بڵێیتەوە. گریمان بۆ هاوڕێیەکی خۆتی باس دەکەیت. راپۆرتەکەتان شتێکی لەم شێوەی لێدەردەچێت:

*ئایا تاکو ئێستا هیچ شتێکت بیستوە لە سەر کڵێسای "سان دانستان" کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاستو لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمەدا بەر بۆمباران نەکەوتووەو لەو کاتەوە تاکو ئێستا بووەتە شوێنی کۆبوونەوە؟ خەڵکی ناوچەکە ئەم شوێنە بۆ کۆڕو کۆبوونەوەکانیانو*

*هەروەها بۆ شوێنی ئەو کەسانەی بە هۆی شەڕەوە ماڵەکانیان وێران بووە بەکار دەهێنن. بەڵام لەوکاتەوە بەولاوە ژمارەی ئەوانەی بۆ نوێژکردن روو لەو کڵێسایە دەکەن کەم بووەتەوە. بە هەرحاڵ بەرپرسان بڕیاریانداوە کڵێساکەو گۆڕستانەکەی تەنیشتیشی بفرۆشن، ئەو مەسەلەیەش بووەتە هۆی نارەزایی لای خەڵکی ناوچەکە، چونکە پێیانوایە کڵێساکە بووەتە بەشێك لە مێژووی ئەوان. پێدەچێت لە کاتی شەڕی ناوخۆدا چارلسی یەکەم لەم کڵێسایەدا دوعای کردبێت و دیك توربین شەوێك لە سەر قەنەفەکانی ئەو کڵێسایەدا رۆژی کردووەتەوە. ئەگەر بەرپرسان بڕیارەکەیان جێبەجێکەن ئەوە پێنجەمین کڵێسایە لەماوەی پێنج ساڵی رابردوودا بۆ دروستکردنی خانووی نوێ دەفرۆشرێت. خەڵکی ناوچەکەدەیانەوێ بە هاوکاری تیمێکی چالاك رێگە لەم کارە بگرن. ئەوان دەڵێن کڵێساکە بە هۆی مێژووەکەیەوە شوێنێکی پیرۆزە، چونکە بۆمباران و تۆپباران کاری تێنەکردووە.*

*قەشەی کڵێساکە "میدگیت" هێشتا هیچ لێدوانێکی لەو بارەوە نەداوە. بەڵام ئەندامانی ئەنجوومەنی شار پێیانوایە دەرچوونی فەرمانی پاراستنی کڵێساکە مانای وایە رێگە لە رووخاندنی بگیرێت. کەچی خەڵك سەرەڕای ئەوەش نارەزان و پێیانوایە دەبێت کڵێساکە درێژە بە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی بدات.*

ئەو دەمەی دڵنیا بوویت دەتوانیت هیچکام خاڵە سەرەکییەکانی تێکستەکە لە بیرنەکەیت کارەکانی دی ئاسان دەبن. چونکە بڕوا بەخۆکردنت زیاد دەبێت. ئێمە لە ژیانی رۆژانەماندا چیرۆکی لەو جۆرە بۆ هاوڕێ و خێزانەکانمان دەگێڕینەوە بۆ ئەو کارەش بۆ لە بەرکردنی ژمارەو ئامارەکانیش بە بێئەوەی ئاگایانە بیری لێبکەینەوە، کەڵك لە توانا

تایبەتەکانمان وەردەگرین. ئەوەی دەربڕین لە بەردەم کامێرادا سەختدەکات خستنە رووی ئامارو زانیارییەکانە بەزمانێکی فەرمی. ریپۆرتەر دەبێت بە شێوەیەکی باوو فەرمیو کورتو پوخت قسە بکات. ریپۆرتەریش وەك نووسەر دەبێت خۆی لە بەرکارهێنانی وشەی سواو و بێهودەو کلێشەیی دووربخاتەوە. لێرەدا سنووردرابوونی فەزا شوێنی خۆی دەدات بە سنوردرابوونی کات.

هەرچەندە لەوانەیە راپۆرتی یەك کەسی لە سەرەتادا سەخت بێت، بەلام بە هۆی فراوانبوونی توانای لەبەرکردنو لە بیرنەکردن لای ریپۆرتەر ئەو کارە ئاسانتر دەبێت. گەلێك شیواز بۆ ئاسانکردنی راپۆرتی تاکە کەسی هەن. بەلام هەرگیز پەنا بۆ تۆمارکردنی تێکستی راپۆرتەکە لە سەر کاسێت یانCD مەبەو پاش تەواوبوون لەکاتی پێشکەشکردنی راپۆرتەکەدا گوێی لێبگرە. ئەو سیستەمە لەوانەیە لە هەستیارترین کاتدا تووشی هەڵەی تەکنیکی بێت. جگە لەوە ئەو شێوازە یارمەتی بەهێزکردنی توانای لەبەرکردن لای تۆ نادات. جگە لەوەش خۆت گرێدەدەیت بە کومەڵە کەرەستەیەکەوە کە لەوانەیە لە ساتێك لە ساتەکاندا ون بێت یان پاتری نەمێنێت.

چاوپێکەوتن:

دەکرێت بۆ ئەو چاوپێکەوتنانەی لە دەرەوەی ستۆدیۆ ئەنجامدەدرێن، ئەوەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدا دەکرێت بە بێ ئەوەی ریپۆرتەرەکە لە وێنەکەدا دەرکەوێت وەلامی پرسیارەکان بداتەوە. لە کاتی پەخشکردنی راپۆرتەکەدا دەنگ لە سەر پرسیارەکانی ریپۆرتەرەکە دادەنرێت. بۆ نموونە دەنگی ریپۆرتەرەکە کاتێك دەڵێت: "لە وەزیرم پرسی ئاخۆ بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو خۆی کاندید دەکاتەوە؟" دەبیسترێت. دواتر وێنەی

وەزیر بڵاودەکرێتەوە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە. لەوانەیە بۆ کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووس قسە بکات. لەوانەیە وەڵامەکەی وەزیر لە کەناڵە جیاجیاکانی دیکەدا پەخشبکرێت.

جۆرێکی دیکەی چاوپێکەوتن بە شێوەی ڕاستەوخۆو زیندوو دەگوازرێتەوە بۆ ستۆدیۆی هەواڵەکان. لەم کاتەدا پاش یەکەم پرسیار کامێراکە دەکەوێتە سەر ئەوەی پرسیارەکانی ئاراستە دەکرێت و لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەشدا ڕیپۆرتەرەکە خۆی دەردەکەوێت. پاشئەوەی ڕیپۆرتەرەکە سوپاسی بەرامبەرەکەی دەکات. ڕوودەکاتە کامێراکەو پاشماوەی بەرنامەکان دەسپێرێتە ستۆدیۆی پەخش.

ئەو کەسانەی ئەزموونی کارکردنیان لە ڕادیۆدا هەیە، شارەزایی پێویستیان بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن وەرگرتووە. ئەو شارەزایانەش بریتین لە پێشبینیکردنی بابەتی دواتری چاوپێکەوتنەکە. پێداچوونەوە بە بابەتەکاندا لە هزردا. گوێ گرتن لە قسەکانی بەرامبەرو سەرلەقاندن وەك نیشانەیەك بۆ گوێگرتن لە قسەکانیو دوورکەوتنەوە لە تەماشاکردنی شوێنی دی وەك بڵێیت بابەتێکی گرنگتر هەیە لەم چاوپێکەوتنە.

گرنگترین شت کە ڕیپۆرتەر دەبێت پێشئەوەی داوای چاوپێکەوتن لە گەڵ یەکێك بکات، ئەوەیە ئاخۆ ئەو چاوپێکەوتنە هیچ بۆ ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە زیاد دەکات؟ ئایا ئەو کەسە هیچ ڕۆڵێکی لەو ڕووداوەدا هەیە یان تەنها شایەتحاڵێکەو بەس؟ پێش دەسپێکردن بیر لە ناوەڕۆكو ئامانجی پرسیارەکان بکەرەوە. لەو کەسەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدا دەکەیت مەپرسە حەزدەکیت وەڵامی کام پرسیار بدەیتەوە. چونکە نابێت لایەنگری ئەو بیت. ئایا دەتەوێت لە ڕێگەی ئەو چاوپێکەوتنەوە هەندێك بابەتی نوێ ئاشکرابکەیت یان دەتەوێت بۆ پڕکردنەوەی ڕاپۆرتەکەت وێنە یان دەنگ

کۆبکەیتەوە؟

باشتروایە ناو و پلەو پایەی ئەوکەسەی چاوپێکەوتنەکەی لە گەڵدا دەکەیت تۆماربکەیت، بۆ نموونە مولازمی دوو "ئەلف" لە تیپی پێنجی پیادە. هەروەها لێی بپرسە حەزدەکات بە چ ناوێك بانگی بکەیت. لەکاتی ناوهێنانی ئەفسەرەکانی سوپادا بە شێوەیەکی راست پلەکانیان باسبکە، بۆ نموونە نابێت بە عەقید بڵێیت عەمید.

ناخۆشترین چاوپێکەوتنەکان ئەوکاتەن لە ناو ژمارەیەکی زۆر پەیامنێریی رۆژنامەو رادیۆکان پرسیار بکەیت. کاتێك یەکێك دەستدەخاتە سەرشانت یان پاڵت پێوە دەنێت یان لە پێشتەوە هەڵدەستێت سەرت سوڕ نەمێنێت. ئەگەر ئەزموونی لەوچەشنەت نییە دۆش دامەمێنە. گرنگ ئەوە نییە قەدوباڵات چۆنە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە لە شوێنەکەی خۆت نەجوڵێیتو تەنها بیر لە کارەکەت بکەیتەوە.

کۆنفرانسەکانی هەواڵ بە شێوەیەکی رێکوکوپێکتر رێکدەخرێنو پێشتر بەرنامەیان بۆ دارێژراوە. لە بەر بوونی ژمارەیەکی زۆر رۆژنامەنووس بۆ ئەوانەی تازە دەستبەکاردەبن، پرسیارکردن کارێکی سەختەو تووشی دڵەڕاوکێیان دەکات. بەڵام تۆ هەوڵبدە هەڵسوکەوتت وەك ئەوانی دی بێتو بێ ئومێد مەبە. لە یادت نەچێت تۆش وەك ئەوان رۆژنامەنووسیت. ئەو پرسیارانە تۆمار بکە کە هاوکارەکانت دەیکەن، بۆ ئەوەی دووبارەیان نەکەیتەوە. هەندێك جارکەسانی دی ئەو پرسیارانە دەکەن کە تۆ ئامادەتکردوون. بەڵام گەر پرسیارێکی سەرەکیو گرنگت هەبوو کەسی تر بیری لێنەکردبۆوە دوو دڵ مەبەو یەکسەر پرسیارەکەت ئاراستەبکە.

یەکێکی دی لەو دژواریانەی دێنە رێگەی چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی شێوازی ئامادەکردنو خستنە رووی پرسیارەکانە. ئەوکاتەی پرسیارەکەت

درێــــژە یـــان مەبەســـتەکەت ناگەیـــەنێت، لەوانەیـــە ئـــەو کەســـەی چـاوپێکەوتنەکەی لــە گەڵــدا دەکــەیت بــە پێــی ئــەو ئەزموونــەی لــە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیدا هەیەتی، بە هەڵە یان بـە ئەنقەست وەڵامێکی هەڵەت پێبڵێت. ئەگەر زۆر بە ئەدەب بیت وادەردەکەویت لـە ئاراستەکردنی ئـەو پرسـیارەدا زۆر شـەرمەزاریت‌و زۆر مـەمنوونی هـەر وڵامێکیـت کـە دەدرێتەوە. خۆت لـە قسەی ئـاڵوزو شاراوە دووربخـەرەوە. چونکە لەوانەیـە خراپ تووش بیت. کاتێك پەیامنێر بـاس لـە سەرچاوەیەکی نادیـاری هـەواڵ دەکات‌و دەڵێت: "*دەنگۆی ئەوە هەیە تۆ*" یان "*بـە گـوێرەی قسەی هەنـدێك سەرچـاوەی هــەواڵ*" .... پرســیاری ئــەوەت ئاراســتە دەکرێــت "چ جــۆرە دەنگۆیەك؟ کام سەرچاوەی هەواڵ؟ ناوەکەی بڵێ: " لە کاتێکدا بەڵگەیـەکی وەك ئاگاداریی یان ڕۆژنامەیەکت لە بەردەستدا بوو کە باس لـەو مەسـەلەیە دەکـات، ئەگـەر یاسـا ڕێگـر نـەبوو ئـەوا پشتی پێببەستە. بـۆ نموونـە بڵـێ: ڕۆژنامـەی "ئـەلف" لـە ڕاپۆرتێکـدا بـڵاوی کردووەتـەوە کـە تۆیـان لـە کـاتی چاوپێکەوتن لەگـەڵ "ب" بینیـوە. ئایا ئـەو مەسـەلەیە ڕاسـتە؟ بـەم جـۆرە پـشتت بــە ڕاپــۆرتی ڕۆژنامەیــەك بەســتووە نــەك بــە دەنگۆیــەك کــە بــۆ سەلماندنی هیچ بەڵگەیەکت پێنییە. ئەوە شارەزاییەکە فێـر دەبیـت‌و دەبێتـە هـۆی دڵنیـایی لای بینـەر سەرنووسـەرو ئـەوەی چـاوپێکەوتنەکەی لەگەڵـدا دەکـەیت. لـە بـیرت نەچـێت وەك کەسـێك چـاوپێکەوتنەکە دەکـەیت. ئـەو مافەت نییـە ئـەو کەسـەی چـاوپێکەوتنەکەی لەگەڵدا دەکـەیت بخەیتـە ژێـر لێکۆڵینـەوەی سـایکۆلۆژییەوە، یـان لـە گەڵیـدا چـەلەحانێ بکـەیت‌و هـانی بدەیت‌و بیپارێزیت.

شـارەزاییەکی دی کـە بـە تێپـەڕبوونی کـات فێـری دەبیـت بریتییـە لـە گـوێگرتن بـە شـێوەیەکی ورد لـە بەرامبەرەکـەت‌و ڕێگـەی پێبـدە هـەموو

بۆچوونەكانی خۆی بە تەواوەتی بخاتەڕوو. هەندێك ریپۆرتەر پێیانوایە تا پرسیاری زیاتر بكەن كارەكەیان سەركەوتوو ترەو دەرەئەنجامی باشیان دەستكەوتووە. جگە لەوە هەندێجار بۆ ناردنی راپۆرتەكان بە شێوەیەكی خێرا گوشارێكی زۆر دەخرێتە سەر ستۆدیۆی پەخش. ئەو دوو حاڵەتە دەبنە هۆی ئەنجامدانی چاوپێكەوتنێكی كاڵوكرچ و مەسەلە سەرەكییەكان ناخرێنەڕوو.

تا پێتدەكرێت كاتی زیاتر بدەرە چاوپێكەوتنەكە. سیاسەتمەدارەكان بە تایبەت ئەوانەی كە لە دەسەڵاتدان بەوە بەناوبانگن لە كاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەكاندا خۆیان لە مەسەلەكان دەدزنەوەو بۆ ئەو جێگەیەی رادەكێشن كەخۆیان دەیانەوێت. ئەركی تۆ ئەوەیە چاوپێكەوتنەكە بخەیتەوە سەر شارێی خۆی. لە هەمانكاتدا بە وردی گوێ لە وتەی سیاسەتمەدارەكان بگرە. لەوانەیە لە قسەكانیاندا شتێك هەبێت بۆ پرسیاركردن بشێت. گەر حەزت لەوەیە ئەوانەی چاوپێكەوتنیان لەگەڵدا دەكەیت بە بێ پەردەو راشكاوانە قسەت بۆ بكەن، رێگەیان بدەرێ بە ئارەزووی خۆیان بۆچوونەكانیان بخەنەڕوو. بەرامبەرێك كاتێك دەبینێت رۆژنامەنووسەكە سنوور لە بەردەم گێڕانەوەی ئەزموونەكانیدا دانانێت، بێگومان قسەی زۆرتری بۆ وتن دەبێت. برینی قسەكانی ئەو كەسەی چاوپێكەوتنی لە گەڵدا دەكرێت دەبێتە هۆی ئاشكرا نەبوونی زانیارییەكی زۆرتر.

راپۆرتە ئاوێتەییەكان:

ئامادەكردنی راپۆرتێكی ئاوێتەیی، كارێكی سەختترە لە ئامادەكردنی راپۆرتێك یەك كەس پێوەی خەریكبێت. لەم جۆرە راپۆرتانەدا بە شێوەیەكی تەقلیدی دەنگ لەسەر فیلمەكە دادەنرێتو پەیامنێر راپۆرتەكە لە بەردەم كامێرادا دەخوێنێتەوە. راپۆرتێكی وێنەیی بە شێوەیەكی دوورو

درێــژ بــاس لــە ڕووداوێکــی گرنگــی ڕۆژ دەکــات. بــۆ نموونــە دەکرێــت ئــەو ڕاپۆرتــەی لــە ســەر *کڵێــسای ســان دانــستان* ئامــادەکرا، تێکــەڵبکرێت لــە گــەڵ ڕاپۆرتێك کە باس لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی کڵێساکان دەکات سەبارەت بە پشووی کڵێساکان لە ڕووی ئەخلاقییەوە.

بۆ درووســتکردنی ڕاپــۆرتێکی ئاوێتــە، پێویــستە ڕۆژنامــەنووس خــاوەنی خەیاڵێکی باش بێت. نابێت چەند دەقەیەك وێنەی بینای کڵێساکە بگریــتو پێتوابێــت بــە دانــانی دەنــگ بــۆ ســەر وێنــەی بــەردە گرانێتــەکانی دیــواری کڵێــساکەو کێلــی گۆڕەکــان کارەکــەت بــەبێ کــەم وکــوڕی کۆتــایی هــاتووە. پەیامنێر دەبێت لە گەڵ ئەوانەی کڵێساکە دەپارێزن چاوپێکەوتن سازبکات. جگــە لــەوە دەبێــت چــاوپێکەوتنەکان بگــونجێن لــە گــەڵ کــاتو شــوێنی ڕاپۆرتەکــەدا. گــەر چــاوپێکەوتنەکە بــاس لــە کڵێــسایەك بکــات، بــەڵام لــە شوێنێکدا وێنەی گیرابێت کە هیچ پەیوەندی بە بابەتەکەوە نەبێت، شتێکی سەیرو بێمانای لێدەردەچێت. بۆیــە باشــتر وایــە چاوپێکەوتنەکە لــە خــودی کڵێساکەدا بکرێت.

پــــاش لێکۆڵینــــەوەو شــــیکردنەوەو دانــــانی پلانــــی تــــەواو. ئــــەنجا چــاوپێکەوتنەکەت بخــەرە ســەر کاغــەز. لــەم حاڵەتــەدا هــەلی ئــەوەت بــۆ دەڕەخسێت بۆچوونەکانت لە سەر وێنــەو جــۆری دەنــگ بخەیتــەڕوو. خــەیاڵ فراوانی ڕۆژنامەنووس لێرەدا دەردەکەوێت. لیــستی ئــەو دیمەنانــەی پێتوایــە لە هەموویان گرنگترنو تێبینییەکانت لە سەر دەنگو ڕاپۆرتە زارەکییــەکان، لە سەر کاغەزێك بنووسە. باشتر وایە قەڵەمی ڕەساس بــەکار بهێنیــت، تــاکو ئەگــەر شــتی نــوێترت بــۆ هــات بــە ئاســانی لــە جێگــەی ئەوانــەی پێــشوو بینووسیتەوە. بۆ مەزەندەکردنی کاتی ڕاپۆرتەکە دەتوانیت یــەکێك لــەم دوو شێوازەی خوارەوە بگریتەبەر:

ئەو گریمانەیە زۆر راستە کە دەڵێت ( بۆ دەربڕینی سێ وشە، نزیکەی چرکەیەك کاتمان دەوێت). بەڵام بەکارهێنانی ئەم شێوازە کاتێکی زۆری دەوێت بۆ ژماردنی وشەکان.(کۆمپیوتەر ئەوەشی ئاسانکردوە- وەرگێڕی کوردی)

شێوازێکی دی ئەوەیە (بۆ هەر مەسەلەیەکی نوێ کە باس دەکرێت ۱۵ چرکە دابنێ). ( مەزەندەکەت زۆر لە راستی دوور نییە). کەواتە بۆ هەر دوو مەسەلە ۳۰ چرکە دابنێو بەم شێوەیە کاتی راپۆرتەکەت بژمێرە. "*کڵێسەی* st. duns tans *لە سەدەی پازدەیەمی زاینی درووستکراوە لە کاتی بۆمبارانکردنیدا بێ زیان بوو، لەو کاتە بەولاوە ژمارەی ئەوانەی بۆ نوێژکردن دێن بۆ ئەو کڵێسایە رووی لە کەم بوونە". (۱۵ چرکە)*

دەتوانیت لە گەڵ وێنەگرەکەدا سەبارەت بە پلانەکەت راوێژ بکەیت. گەر لە کاتی وێنەگرتنەکەدا ئاوو هەوا باشبوو، چاکتروایە وێنەی نماکانی دەرەوە بگریتو دیمەنەکانی ناوەوە بۆ دواتر بەجێبێڵیت. بەڵام ئەگەر ئاوو هەوا خراپ بوو پێچەوانەی ئەوە بکە. لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە رێگەتان پێنەدرێت بچنە کڵێساکەوە. بۆیە دەبێت پلانێکی دیکەی ناچارییت هەبێت. لە بیرت نەچێت پلانەکان با هەمیشە نەرمو نیانو قابلی گۆڕان بن .

ئەوکاتەی وێنەگرەکە سەرقاڵی وێنەگرتنە، دەتوانیت چاوپێکەوتنەکەت لە سەر ریکۆردەر تۆماربکەیت. کاتی داڕشتن دەبێت بە گوێرەی پێویست رێکبخرێت. ماوەی راپۆرتی ناوێتە بە زۆری سێ بۆ چوار خولەکە. بۆیە پێویستە ماوەی چاوپێکەوتنەکان لەو چوارچێوەیە دەرنەچێتو کاتی پێویستیش بۆ دەنگی سەر وێنەکان بمێنێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە ئەوبەشانەی چاوپێکەوتنەکە کە پێویستنین دیار بکرێنو لە کاتی لابردنیاندا زیان بە ناوەرۆکەکە نەگەیەنن.

چاوپێکەوتنەکە لەبەرامبەر ئەو نمایەی پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە دابنێ. (*لێرەدا* دەکرێت وێنەکە نمای دەرەوەی کڵێساکە بێت). باشتروایە چەند دیمەنێکی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنەکەی لە گەڵداکراوە لەو کاتەی سەرقاڵی کارێکی دیکەیە، پیشانبدرێت. بۆ نموونە هەندێك کاری وەك سپیکردنەوەی قاپو قاچاخی زیوین لە کڵێسەکاندا بۆ ڕاپۆرتەکە زیادبکرێت. دیمەنێکی لەو جۆرە ئەوە پیشانی بینەر دەدات کەوا ئەوکەسە چەند دڵسۆزانە کار بۆ پاراستنی کڵێساکە دەکات. باشتروایە ئەو دیمەنە لە شوێنێکی جیا لەو شوێنەی چاوپێکەوتنەکەی تێداکراوە بگیرێت. بە مەبەستی درێژەدان بە چاوپێکەوتنەکە هەندێك پرسیاری ڕاستەوخۆ لە کەسەکە بکەیت بۆ ئەوەی وەڵامی سەربەخۆت دەستبکەوێت‌و بە بەڵێ‌و نەخێر کۆتایی نەیەت. بۆ ئەو مەبەستە باشتروایە پرسیارەکان بە کێ؟ چ کارێك؟ کەی؟ لەکوێ؟ بۆ و چۆن دەستپێبکەیت. شێوازێکی دی ئەوەیە داوای لێبکەیت سەبارەت بە بابەتەکە ڕوونکردنەوە بدات. بۆ نموونە بڵێیت *"تکایە پێمان بڵێ بۆ ڕێگرتن لە داخستنی کڵێساکە بەرنامەتان چییە؟"*

پاش تەواوکردنی چاوپێکەوتنەکە، دەتوانیت ڕاپۆرتەکە بنووسیت‌و دەکرێت بەشێك لەو ڕاپۆرتە لە بەرامبەر کامێراکەدا بخوێنیتەوەو ئەوکارەش زیاتر لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا دەکرێت. پێویستە ئاگاداری هەموو ئەو وێنانە بیت کە گیراون‌و لیستێکیان لێئامادەبکەیت. پشت بە پێشبینی‌و هیوا مەبەستە، نەبادا ڕاپۆرتەکەت کارێکی خراپی لێدەربچێت.

خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە، لە کاتی ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەدا پێویستە دوایین پێشهاتەکانی ڕۆژ سەبارەت بە بابەتەکە بخەیتە ژێرچاودێرییەوە. هەرچەندە *ئوسقوف مدگیت* تا ئەو ساتە هیچ لێدوانێکی فەرمی نەداوە، بەڵام لەوانەیە ڕێك لەو کاتەی تۆ سەرقاڵی ئامادەکردنی

راپۆرتەکەتی ئەو لە ئەنجومەنی کڵێساکەدا لەو بارەوە لێدوان بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بدات. بۆیە ئەگەر لە ڕاپۆرتەکەی تۆدا باس لەوە بکرێت کەوا ئوسقف هێشتا هیچ لێدوانێکی فەرمی نەداوە، شتێکی کومیدی دەردەچێت. چونکە خەڵك دەزانن لە هەمان ڕۆژدا سەبارەت بەو مەسەلەیە بۆچوونەکانی خستووەتەڕوو.!!

ماوەی هەموو دیمەنەکان بە وردی دیاریبکەو بۆ ئاگادارکردنەوەی بەڕێوەبەری ستۆدیۆی پەخش لەسەر کاسێتەکە پێشنیازو ڕوونکردنەوەی پێویست بنووسە. بۆ نموونە: ***چاوپێکەوتن لە گەڵ بەرپرسی دەستەکە سێ چرکەی دی دەستپێدەکات.(وەستان)***. لە کاتی ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی تەلەفزیۆنیدا تۆ ڕۆڵی دەرهێنەر دەبینیت. ئەوەی چاوپێکەوتنەکە دەکات نووسەرە، ئەوەی پێدادەچێتەوە ڕۆڵی ئامادەکار دەبینیت. ئەنجا دەتوانیت ڕاپۆرتێکی پوخت بنێریتەوە بۆ کەناڵەکەت. لە ڕاستیدا هەموو ڕاپۆرتە ئاوێتەییەکان لە لایەن ڕیپۆرتەرەوە ئامادە دەکرێن. ئەگەر وێنەگرێکی شارەزاو زیرەکت لە گەڵدا بێتو دیمەنەکانت لە چەند گۆشەنیگایەکەوە بۆ بگرێت، دەتوانیت لەماوەی چەند سەعاتێکدا ڕاپۆرتێك ئامادەبکەیتو تۆماری بکەیت. پاش تەواوکردنی کارەکان بە تەلەفۆن پەیوەندی بکە بە بەڕێوەبەری بەرنامەکانو نووسەری ستۆدیۆی پەخش بۆ ئەوەی دڵنیابیت هەموو شتەکان بە ڕێکوپێکی دەچنە پێشەوەو ڕوونکردنەوەی پێویستشیان پێبدە. دەبێت لە کاتی ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی تەلەفزیۆنیدا ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەرچاو بگریت:

نابێت بەرنامەکە لەو ماوەیەی بۆی دیاریکراوە درێژتربێت.

ڕاپۆرتەکە بە شێوەیەك ڕێکبخە کە لەگەڵ ماوەی وێنەکەدا بگونجێت.

ئەو دیمەنانەی وێنەیان گیراوە یەك لە دوای یەك لە لیستێکدا تۆمار بکە.

لەوانەیە خودی بێژەرەکە نووسەرو بەڕێوەبەری بەرنامەکە بێت، بۆیە ڕوونکردنەوەی پێویست لە سەر کاسێتەکە بنووسە.

دەبێت زانیارییەکانی ڕاپۆرتەکەت لە گەڵ دوایین هەواڵەکانی ڕۆژدا یەك بن. چەند ڕستەیەك بۆ بێژەری هەواڵەکان بنووسە. تاکو وەك پێشەکی ڕاپۆرتەکە بیخوێنێتەوە.

بێژەری هەواڵەکان:

*ئەنجومەنی ساڵانەی کڵێسا لە دانیشتنی ئەمڕۆی خۆیدا سەبارەت بە فرۆشتنی ئەو کڵێسایەی ژمارەی نوێژکەرانی تێدا کەمبووەتەوە وتووێژو ڕاگۆڕینەوەی کرد. کێشەکە تەنها لەو سنوورەدا نەماوەتەوە. دانیشتوانی گەڕەکێکی باشووری لەندەن بەم دواییانە بۆ پاراستنی کڵێسایەکی مێژوویی تیمێکی تایبەتیان پێکهێناوە. پەیامنێریی کاروباری ئاینی تیمەکە "ساندی بیچ" لە کاتی سەردانی ناوچەی "چادنی" ڕاپۆرتێکی لەوبارەیەوە ئامادە کردووە.*

ڕاپۆرتەکە:

*کڵێسای سن دانستان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پازدەیەمی زایینیو لە ساڵی ١٩٤١ لە کاتی شەڕی جیهانی دووەمدا.*

کاتێك پێشەکیەکی پێویستت خستە بەردەستی بێژەر، ڕێگە لە دووبارە بوونەوەی بابەتە هاوشێوەکان دەگریت.

ئامادەکردنی ڕاپۆرتی ئاوێتە بووەتە کارێکی ڕۆژانەی ڕیپۆرتەرەکانو تا دێت ئەنجامدانی خێراترو ئاسانتر دەبێت. بوونی شارەزاییو زانیاری سەبارەت بە چونێتی نووسینو پێداچوونەوەی هەواڵو وێنەگرتنو یاساکانی نووسینی هەواڵی تەلەفزیۆنی یارمەتی ڕیپۆرتەر دەدات کارەکەی بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنێت.

# ١٤

# راپۆرتی رادیۆیی

ئـەرك‌و بەرپرسـیارێتی ئەوانـەی لـە رادیـۆدا کاردەکـەن پێناسـەیەکی تایبەتی هەیـە. چونکە ئـەو کەناڵە وێنەیـەك دەداتـە پـەیاموەرگرەکانی کـە هـیچ کـەس لـە توانایـدا نییـە ببینێـت. لـە رووکەشـدا ئـەوە مەسـەلەیەکی رۆتینییە، بەڵام زۆر لەوانەی لە رادیۆدا بەرنامە بەرهەمدەهێنن ئەوەیان لـە بیردەچێت لەوانەیە ئامادەکردنی راپـۆرتی رادیـۆیی بـە کـارێکی ئاسـان بێتـە پێشچاو، هۆکارەکەشـی دەگەرێتـەوە بـۆ ئـەوەی چـۆنێتی کارەکـە لـە وێنـەدا نابینرێـت. بـە پێـچەوانەی چاپەمەنییەکان لـە رادیـۆدا هـیچ بابـەتێك بـە شـێوەیەکی هەمیـشەیی تۆمـار ناکرێـت‌و نـاتوانی بـۆ سەرزەنـشت کردنـی نووسـەرەکەی جـارێکی دی بگەرێیتـەوە سـەری. کاتێـك وشـەیەك بـە هەڵـە دەخوێنیتەوە زۆر بە ئاسانی تێپەڕ دەبێت، چونکە وشەکان پاش ساتێك دیار نامێنێن. ئەوەی زیاتر لە هەموو شـتێك کارمەنـدانی رادیـۆ نیگـەران دەکـات، ترسـی بێـدەنگی‌و پانتـایی بۆشـە لـە کـاتی پەخـشدا. وەك چـۆن نـەبوونی نووسین لە لاپەڕەی رۆژنامەیەك‌و نەبوونی وێنە لە مۆنیتەری تەلەفزیۆنـدا سەرنووسەری رۆژنامەکان‌و ئامادەکارانی بەرنامەکان دەخاتە دڵەڕاوکێوە، لـە رادیۆشـدا ئـەو نیگەرانییـە لەوانەیـە بگۆڕێـت بـۆ پـشێوییەکی گـەورەو دڵەڕاوکێی فکریی. بۆیە نابێ رێگەی پێبدرێت.

هەندێك کەس هەن رەخنە لە بەرهەمهێنەرانی رادیۆ دەگرن‌و پێیانوایـە هـەموو خەم‌وخەفـەتیان ئەوەیـە بۆشـاییەکانی پەخـشەکەیان پڕبکەنـەوە،

ئەوان دەڵێن هەموو بەرنامەکانی ڕادیۆ لەیەك دەچن‌و لە لایەن کۆمەڵێك بێژەرەوە پێشکەش دەکرێن زۆر بە ئاسانی دەکرێت یەکێکیان لە جێگەی ئەوی دیکەیان پێشکەشی بکات. چونکە هیچ کامیان توانای ئەوەیان نییە تایبەتمەندییەکانی خۆیان دەربخەن. ڕادیۆکان لە جیاتی ئەوەی ئەستێرەیەکی ناودار دروستبکەن کومەڵە بێژەرێك دەخەنەڕوو دەنگی هەموویان لە یەك دەچێت. لە بریتانیا ئەو بێژەرە لێکچووانە هێشتا وەك ساڵانی شەستەکان بە زمانی بازاڕ قسەدەکەن. وادیارە ڕادیۆ نایەوێت بگۆڕێت‌و پەیڕەوی لەو بۆچوونە دەکات کە پێیوایە بەرنامەکان دەبێت بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی تەواو لێکچوو پێشکەش بکرێن. نەك بۆ کەسانێك خەسڵەتی تایبەت بە خۆیان هەبێت. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕادیۆ ببوو بە شوێنێك بۆ ڕاهێنانی پەیامنێرو بێژەرو ئامادەکاری بەرنامەو ئامانجی سەرەکی هەمووشیان ئەوەبوو لە تەلەفزیۆنەکاندا کاربکەن. پێدەچێت ئەو کەناڵەش بەو ڕۆڵەی خۆی ڕازی بێت. بەداخەوە هەندێك پێیانوایە ڕادیۆ ڕایەڵەیەکی لاوازی پەیوەندیکردنە.

لەم بەشەدا بە شێوازێکی تایبەت باس لە ڕیپۆرتەری ڕادیۆ هەر لە چاوپێکەوتن لە گەڵ خەڵکدا تا دەگاتە خوێندنەوەی هەواڵەکان، دەکەین. دەکرێت ئەو بابەتانەی لەم فەسڵەدا دەخرێنە بەرباس، بە شێوازی سەرەکی ڕاپۆرت بۆ کەناڵە بیستراو و بینراوەکان بدرێنە قەڵەم. بەڵام ئەوەی ناکرێت لەم فەسڵەدا باسی لێوە بکرێت‌و لە حەقیقەتیشدا ناتوانرێت کەس فێر بکرێت، بریتییە لە *"توانای دەروونی"* کە لە ڕێگەیەوە دەتوانین تێبگەین ڕیپۆرتەری ڕادیۆ چییەو دەبێت چۆن بێت.

ئێزگەی ڕادیۆیی:

لە بریتانیا چوارجۆر تۆڕی ڕادیۆیی هەن‌و مۆڵەتی ئەوەیان هەیە

مۆسیقاو بەرنامەكانی دی پەخشبكەن. ئەو تۆڕانەش بریتین لە BBC، رادیۆی نەتەوەیی بازرگانی ( National commercial radio)، رادیۆی ناوچەیی سەربەخۆ (Independent local radio) و رادیۆی كۆمەڵایەتی (Communitty radio).

BBC ٣٩ ئێزگەی رادیۆیی نابازرگانی هەیە. بودجەی ئەم ئێزگانە لە رێگەی مۆڵەتی فرۆشتنی پەخشی تەلەفزیۆنی ئەو كەناڵەو پەخشی FM و شەپۆلی ناوەڕاستی دەزگاكەوە دابیندەكرێت. ناوەڕۆكی بەرنامەكانی رۆژانەی بریتین لە تێكەڵەیەك لە هەواڵ و راپۆرتی ناوخۆیی و بەرنامەی سەرگەرمیی. بەشداریكردنی خەڵك لە بەرنامەكاندا زۆرباشەو بیسەران لە رێگەی تەلەفۆنەوە پەیوەندی دەكەن بە بەرنامە زیندووەكانەوە. هەواڵە ناوخۆییەكان لە لایەن ریپۆرتەرەكانی رادیۆوە ئامادە دەكرێن و ئەركی خوێندنەوەی بابەتەكانیشیان لە ئەستۆدایە. هەواڵەكان بریتین لە رووداوە گرنگەكانی وڵات و جیهان، سیاسەتی دوو كەناڵی تۆڕی هەواڵی BBC بۆ ئامادەكردن و بەرهەمهێنانی بەرنامەكانی هەواڵ بەو مانایەیە رادیۆو تەلەفزیۆنە لۆكاڵەییەكان لە كاتی پێویستدا دەتوانن سوود لە سەرچاوەكانی یەكدی ببینن. واتە ریپۆرتەرەكانی تەلەفزیۆن و رادیۆ دەتوانن راپۆرتێك ئامادەبكەن كە لە هەردوو كەناڵەكەدا پەخشبكرێت.

مۆڵەتی رادیۆی نەتەوەیی بازرگانی دراوەتە سێ ئێزگەی جیاوازو ناوەڕۆكی بەرنامەو هەواڵەكانی هەریەكەیان جیاوازە لەوی دیكەیان. ئەو تۆڕانەش بریتین لە"classic FM". "Talk radio" و "Virgin radio".

رادیۆی ناوچەیی سەربەخۆش بەرنامەكانی لە سەر شەپۆلی FM پەخشدەكات. ئەم رادیۆیە بریتییە لە كۆمپانیا بازرگانییە سەربەخۆكان و

بودجەکـەی خـۆی لـە رێگـەی ریکلامـەوە دابینـدەکات. لـە بریتانیـا "بەڕێوەبەرایەتی پەخشی سەربەخۆی رادیـۆ" مۆڵەتی کارکردن دەدات بـە رادیۆکـان. بـە شـێوەیەکی گشتیی هـەلی کـارکرن بـۆ پـەیامنێران لـە ئێزگـە ناوچـەییەکان زۆر کەمـە. بـەلام سـەرەڕای ئـەوەش تـۆڕی هـەواڵی رادیـۆیی سـەربەخۆ" Indpemdent Broadcasting Authority" کـە ئـەرکی ئامـادەکردنی هەواڵی بـۆ رادیـۆ سـەربەخۆکان لـە ئەستۆدایە، پـەیامنێر لای خۆی دادەمەزرێنێت.

جگە لەو سێ تۆڕە سەرەکییە، رادیۆیەکی دی هەیە پێیـدەوترێت رادیـۆی کۆمەلایـەتی. ئـەو نـاوە بـەو رادیـۆ لۆکاڵییانـە دەوترێـت کـە بەرنامـەکانیان بازرگـانی نییـە. وەك رێکخراوێکـی بێقـازانج لـە لایـەن کۆمەڵـە خـەڵکێکی خۆبەخشەوە بەڕێوەدەچن‌و ئـەوانیش مۆڵـەتی بـۆ وەردەگـرن. لـە سـەرەتای کارەکەیـدا ئـەم رادیۆیـە بۆپەخـشکردنی هـەواڵی نەخۆشـخانەکان دامـەزرا. پەیامنێریی خۆبەخش سەردانی نەخۆشخانەکانیان دەکـردو چاوپێکەتنیان لە گەڵ نەخۆشەکاندا ئەنجامدەدا. تۆمـاری چـاوپێکەوتنەکان لـەو رادیۆیـەوە پـەخش دەکـراو نەخۆشـەکانیش لـە رێگـەی ئـەو سـەماعانەی لـە پـاڵ قەرەوێڵەکانیاندا دانرابوون گوێیان لە بەرنامەکان دەگـرت. بـۆ ئەوکەسـانەی بیر لە کارکردن لە رادیۆ دەکەنەوە رادیۆ کۆمەلایەتییەکان شـوێنێکی باشـە. لـە رێگـەی ئـەو رادیۆیانـەوە دەکرێـت ئـەزموونێکی زۆر بەکـەڵك لـە بـواری چاوپێکەوتن وئامادەکردنی بەرنامەو پێشکەشکردنی بەرنامە دەستبکەوێت.

نموونـە:

پەرەسەندن‌و گەشەکردنی ئێزگە لۆکاڵیەکانی BBC و دەرکەوتنی رادیۆ سەربەخۆکان لە بریتانیا تا ئەندازەیەکی زۆر قەرزاری ئـەو داهێنانانـەن کـە کۆمەڵە. خەڵکێك لە رێگەی ئامێری پەخشی نهێنی بەرنامـەیان بـۆ خـەڵکی

ئــەو وڵاتــە پەخــشدەکرد. ئــەو ئیزگانــە لــەو کەشــتییە هەڵمییــەی بەلەمەکانەوەو لەودیوی ئاوەکانی سەر بەبریتانیاوە بەرنامـەیان بـۆ خـەڵکی بریتانیــا پەخــشدەکرد. لــە لایــەن ســەرمایەدارنی کــەرتی تایبەتــەوە بـاربۆدەکران. ئـەو رادیۆیانـە کـە بـە چـەتەکانی دەریـا ناویـان دەرکردبـوو، ئامانجیان ئـەوەبوو بانگەشـە بـۆ مۆسیقای پـاپو رۆك بکـەن کـە لـە سـاڵانی ١٩٦٠دا رەونـەقیان پەیـداکردبوو. BBC سـاڵی ١٩٦٧ ئـەو جـۆرە مۆسـیقایەی پەخش نەدەکرد. رادیۆیـەکی دی لـەو دیـوی ئاوەکـانی بریتانیـاوە بەرنامـەی پەخـشدەکرد، بـەڵام نـەك لـە شـێوەی چـەتەکانی دەریـادا، ئـەویش رادیـۆی لۆکسۆمبۆرگ Radio Luxembourg بـوو. ئـەم رادیۆیـە لـە دەیـەی شەستەکان ببوو بە ئاژانسێکی هەواڵنێریی بەناوبانگ. ئەم رادیۆیە لە لایەن بریتانیـاوە بەڕێوەدەچـوو. لـە Grand Luchy و Luxembourg بەرنامەی بـۆ بریتانیـاو وڵاتـانی دیکـەی ئۆروپـا پەخـشدەکرد. نزیکـەی سـی ساڵ پێش ئێستاو لە کاتی شۆڕشی مۆسـیقای پـاپ لـە شەسـتەکانەوە چالاك بـوو. تـەنها گرفتێکـی رادیـۆی Luxembourg و رادیـۆ نهێنییـەکانی دی ئــەوەبوو بیــسەران دەبــوو تــا خــۆر ئــاوابوون ســەبریان بکردبایــە ئــەنجا دەیانتوانی بەرنامـەکان بـە شـێوەیەکی بـاش ببیـستن، چـونکە فریکانـسەکان تەنها لە کاتی تاریکیدا بەهێزدەبوون.

لـە کۆتـایی دەیـەی ١٩٨٠ وە ئـیتر هـیچ نیـشانێك لـە رادیـۆ نهێنییـەکانو رادیۆی Luxembourg نەما، بەڵام رۆڵی ئەو رادیۆیانە لـە دامەزرانـدنی ئەو هەموو ئیزگانەی ئێستا لە بریتانیا هەن شتێکی حاشا هەڵنـەگرە. ئـەوە جگە لە برەودان بە مۆسیقاو کولتووری پـاپ لـە وڵاتەکـەدا. جگـە لـەوە ئـەو رادیۆیانە بوونە هۆی دۆزینەوەی کـار بـۆ ژمارەیـەکی زۆر لـە خـەڵکی وڵاتو دۆزینــەوەی ســتایلی تایبــەت بـۆ بەرنامــە رادیۆییــەکان، کــە تــاکو ئێــستاش

بەردەوامە.

ڕادیۆ نهێنییەکان هێشتا لە هەندێك شوێنی بریتانیا چالاکن، بەڵام لە جیاتی ئەوەی لە دەریاوە یان لە وڵاتانی دیکەوە پەخشبکرێن ئێستا لە شارە گەورەکانەوە چالاکی دەکەن. ئەم ڕادیۆیانەش وەك ئێزگە نهێنییە سەرەتاییەکان بەرنامەی نایابو تازە پەخشدەکەن، پەیاموەرگرەکانیشیان ئەو کەسانەن کە بەرنامەی ڕادیۆ تەقلیدییەکان ناتوانن زەوقیان تێربکەن. هەندێك لەو ڕادیۆ نهێنییانە لەوانەیە مۆڵەتی فەرمی وەربگرن.

ئامادەکردنی راپۆرت:

ئەرکی دۆزینەوەی بابەتی هەواڵ هەمیشە لە ئەستۆی پەیامنێردایە. تەنانەت ئەگەر ماوەیەکی کەمیش بە سەرکارکردنی لە ڕادیۆ یان پیشەکەیدا تێپەڕ بێت. هەندێجار پەیامنێر بابەتەکانی لە نێوان ئەو ئاگادارییانەدا دەدۆزێتەوە کە بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییە گشتییەکانی فەرمانگەکان، یان ڕاگەیاندنی ڕێکخراوە جیاجیاکان لە سەر گۆڕانکاری لە ئەنجومەنەکاندا یان لە زانکۆو پۆلیسەوە دەنێردرێن بۆ ڕادیۆ. بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی دۆزینەوەی بابەتی هەواڵ دەرئەنجامی تەقەلای شەو و ڕۆژی ڕۆژنامەنووسە.

ریپۆرتەری ڕادیۆ دەبێت وەك ڕۆژنامەنووسێك هەوڵبدات لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتەکەیدا کە پەیاموەرگری ئەون، لە نزیکەوە پەیوەندی توندو تۆڵ درووستبکاتو ئاشنایان بێت. لەوانەیە بۆ دۆزینەوەی بیرو بۆچوونی تازە تەماشای چاپەمەنییەکان بکەیت. سەیرت لێنەیەت گەر بزانیت ڕۆژنامەنووسەکانیش بۆ هەمان مەبەست گوێ لە ڕادیۆ دەگرن. ئەوەش بزانە ڕادیۆ بۆ گەیاندنی هەواڵی گەرماو گەرم لە پێشەوەی کەناڵەکانی دیکەدایە. هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕادیۆ بەلای کەمەوە هەموو سەر سەعاتەکان هەواڵ پەخشدەکات، ئەم کارەش بە ڕۆژنامەکان

ناكرێت. خاڵێكی دی ئەوەیە هەواڵەكانی رادیۆ پێویستە بەبەردەوامی نوێ بكرێنەوە، بەجۆرێك زانیاریی هەواڵەكانی سەعات دەی بەیانی زۆرترە لەوانەی لە سەعات نۆ پێشكەش كراون.

تێگەیشتن لەوەی بیسەران حەزیان لە بیستنی چ جۆرە هەواڵێكە، شتێكی زۆر گرنگە. بۆ نموونە لە ناوچەیەكی گوندنشین كە ئابوورییەكەیان بە شێوەیەكی سەرەكی پشتی بە كشتوكاڵ بەستووە، زانینی هەواڵی پەیوەندیدار بە خەڵەو خەرمان‌و دروێنەكردن شتێكی پێویسترە تاكو هەر هەواڵێكی دی. بەڵام تەنها هەواڵەكە گرنگ نییە. بەڵكو بەشە پێكهێنەرەكانی هەواڵەكەش گرنگی خۆیان هەیە.

لە بریتانیا گرنگیدان بە هەواڵە نیشتمانییەكان جیاوازە لە گەڵ هەواڵە ناوچەیی‌و لۆكاڵییەكان. هەواڵە لۆكاڵییەكان زیاتر بە ناو وردەكارییەكانی رووداوەكەدا شۆڕدەبنەوەو كاردانەوەو لێكدانەوەكانیش بە شێوەیەكی راستەوخۆ باسدەكەن. با وای دابنێین شوانكارەكانی بەرزاییەكانی *"مەندیپ"* بە هۆی بەفرو كرێوەی چاوەڕواننەكراوی مانگی نیسانەوە سەدان سەر بەرخیان لە دەستداوە، پەیامنێرێك لە گەڵ یەكێك لەو شوانانە كفتوگۆیەك سازدەكات، گەر ئەم هەواڵە لە تۆڕی نیشتمانیدا بلاوبكرێتەوە، پێدەچێت بیسەران بە هۆی نەبوونی پەیوەندی هەواڵەكە بەوانەوە، رادیۆكانیان بكوژێننەوە. چونكە لەوانەیە ناوو هەوای ناوچەكەی ئەوان گەرم یان باراناویی بێت، یان لە شارێكی گەورەدا بژین، یان بە هۆی لەهجەی لادێیانەی ئەو شوانەوە لە قسەكانی تێنەگەن. بەڵام هەواڵی بەفرو كرێوە لەو كاتەی ساڵداو هەوڵەكانی شوانەكە بۆ رزگاركردنی بەرخەكانی. بۆ بیسەرانی ناوچەكە هەواڵێكی گەرم‌و سەرنج راكێشە. لەوانەیە سەدان كەس لە خەڵكی ناوچەكە ئەو كەسە لە نزیكەوە بناسن‌و لەوانەشە هەندێك لە

بیسەران هاوخەمی خۆیان بۆ شوانە زیانلێکەوتووەکە دەربـبڕن‌و هەوڵبـدەن بە شێوەیەك لە شێوەکان یارمەتی بـدەن. لێرەدایـە هـەواڵی لۆکـاڵیی دەبێتـە هۆی پاراستنی پتەوبوونی کۆمەڵایەتی خەڵکی ناوچە بچووکەکان.

باشـتروایە سـەبارەت بـە پـەیامەوەرگرەکانت زانیـاری وردو راسـت پەیـدا بکـەیت. ئـەوە لـە بیرنەکـەی لـە هـەرکوێ کـار بکـەیت، خـەڵکی ئـەو شـوێنە جۆرێـك لـە دەمارگیرییـان بـۆ ناسـنامەی خۆیـان هەیـە. لەوانەیـە ئـەو کورسییانەی لە پارکەکانـدا دانـراون پـار لـە لایـەن تێکدەرانـەوە شـکێنرابن‌و هێشتا چاك نەکرابێتنەوە، یان لەوانەیە شەقامەکان پیسبن‌و کەس گرنگییان پێنەدات. بەڵام بەو مانایە نییە لەو کۆمەڵگایەدا غـروورو دەمـارگیری نییـە. دەکرێـت بەتەمەنـەکان باسـی رۆژە خۆشـەکانی سـاڵانی رابـردوو بکـەن‌و چاوەڕێی ئەوە بن رۆژگاری خۆشتریان لە پێشدا بێت. ئەوە بۆ خۆی جۆرێکە لە هەواڵ، بە تایبەت گەر هەوڵ‌و تەقەلا بۆ چاککردن‌و پاککردنی شارەکە لە ئـارادا بێـت. خـەڵکی شـارە جیاجیاکـان شـانازی بـە مێـژوو و رابـوردووی خۆیانەوە دەکەن‌و سـەبارەت بـە ناسـنامەی تایبـەت بـە خۆشـیان هەسـت بـە غروور دەکەن، وا باشترە ئەو خاڵەت هەمیشە لە بیر بێت.

لە رێگەی سەردانیکردن بۆ کتێبخانەی گشتیی یان مۆزەخانـەی شـارەکە دەتوانیـت ئـەوە بزانیـت ئـەو شـارە یـان ناوچـەیە لـە مێـژووی وڵاتەکـەدا چ رۆڵێکی تایبـەتی بینیـوە. هەوڵەکـەت بـۆ ئـەو مەبەسـتە بـە فـیڕۆ ناچێت. ئاگاداربە ناوی شوێنەکان وەکو خۆیان دەربـبڕیت.

بەکارهێنانی کەرەستەی راستەقینە:

لـە بەرئـەوەی رادیـۆ تـەنها پـشت بـە دەنـگ‌و قسەکردن دەبەستێت، تـا پێتـدەکرێت لـە راپۆرتـە هەواڵییەکانـدا پـشت بـە کەرەسـتە واقعییـەکان ببەستە. ریپۆرتەری رادیۆ دەبێت خۆی لە شوێنی رووداوەکـەدا ئامـادە بێـت

بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی راستەخۆ سەبارەت بەوەی روویداوە یان خەریکە روودەدات هەواڵ ئامادەبکات. ئەگەر ئەوەت بۆ نەلوا هەوڵبدە لە رێگەی کەسێکی پەیوەندیدار بە رووداوەکەوە بە شێوەی راستەوخۆ گفتوگۆ بکەیت. بۆ نموونە دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بە کاربەدەستێکی حکومەتەوە تاکو سەبارەت بە بریارێکی سیاسیی کە پەیوەستە بە شارێك یان ناوچەیەکی تایبەتەوە لێدوانت بۆ بدات. یان شایەتحاڵێك لە کاتی روداوێکدا لەوێ بووە یان شایەتحاڵێك کە دواتر گەیشتووەتە شوێنی رووداوەکەو دەتوانێت سەبارەت بەو رووداوە زانیاریی فەرمیت بخاتە بەردەست ( وەك ئەفسەری پۆلیس یان کارمەندی ئاگر کوژێنەوە).

کەرەستە تەکنیکییەکان:

ئەمڕۆکە مینی دیسكو تەکنەلۆژیای دەنگو کۆمپیوتەر بە شێوەیەکی بەربلاو جێگەی ریکۆردەریان گرتوەتەوەو بۆ تۆمارکردنو ئامادەکردنی راپۆرت کەڵك لەوانە وەردەگیرێت. بەڵام هێشتا هەندێك ئێزگە هەن سوود لە ریکۆردەر وەردەگرن. بۆیە بوونی شارەزایی لە هەردوو شێوەکە بە سوود دەبێت.

جۆری مایکرۆفۆنەکانیش رۆژ لە دوای رۆژ باشتر دەبێت. مایکرۆفۆن وەك گوێ وایە بۆ ریکۆردەرو تەنانەت بۆ بیسەرانیش. دوو جۆر مایکرفۆن هەیە، مایکرۆفۆنی تاك ئاراستەییو مایکرۆفۆنی چەند ئاراستەیی. لە کاتی بەکارهێنانی مایکرۆفۆنی تاك ئاراستەییدا دەبێت رووی بکەیت لەو کەسەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدادەکەیت. ئەگەر رادەی دەنگەکەت بە جوانی رێکخستبێت پێویستناکات مایکەکە زۆر لە چەناگەی بەرامبەرەکەت نزیك بکەیتەوە. مایکرۆفۆنی تاك ئاراستەیی بە شێوەیەکی هۆشیارانە تەنها دەنگ لە بەرامبەرو پشتەوەی وەردەگرێتو دەنگەکانی ئەملاو ئەولا نابیستێت،

بەڵام مایکرۆفۆنی چەند ئاراستەیی بە شێوەیەکی بازنەیی دەنگەکان لە هەموو لایەکەوە وەردەگرێت و پێویستی بە جوڵاندنی زۆر نییە. گەر بتەوێت چاوپێکەوتن لە گەڵ کەسێك بکەیت لە ناو کۆمەڵە کەسێکدا ئەو جۆرە مایکە سوودی نابێت، چونکە دەنگەکانی دەوروبەریش وەردەگرێت.

بەبەردەوامی وایەرە زیادەکەی مایکرفۆنەکە لە دەستی خۆت بپێچە. چونکە لەوانەیە دەنگێکی زبر بکەوێتە سەری. ئەگەر وایەرەکە درێژ بێت کاتێك گوێ لە کاسێتەکە دەگریت دەنگێکی تێدایە لە دەنگی شەقشەقە دەچێت. پێشئەوەی دەنگی بەرامبەرەکەت تۆماربکەیت باشتروایە تۆنی دەنگەکە رێکبخەیت. ئەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە. چونکە دەنگی مرۆڤ تۆنی جیاجیای هەیەو دەکرێت رادەی دەنگەکە بە پێی تۆنی بەرامبەرەکەت رێکبخەیت. باشتروایە ناوی تەواوی کەسەکەو پیشەکەی لەپێشدا بکەیتە پرسیار. ئەو تێبینییە لە کاتی نووسینەوەی چاوپێکەوتنەکە بەکەڵکت دێت. لە پێشدا رستەیەك بەدەنگی ئاسایی خۆی تۆماربکە. ئەگەر موئەشری دەنگەکە نەگەشتە سوورەکە واتە رادەی دەنگی گونجاوە. گەر وا نەبوو دەبێت ئامێرەکە بەپێی دەنگی ئەو رێکبخەیت. مینی دیسکەکان بۆ خۆیان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو کارە دەکەن.

کەمێك لە دەنگی دەوروبەرەکەت تۆماربکە. دەکرێت دەنگی باگراوەندەکە دەنگی سەرشەقام بێت یان دەنگی بەرزی ناو کارخانەیەك یان کۆمپانیایەکی دروستکردنی کەشتی بێت. ٢٠ یان ٣٠ چرکە بەسە بۆ ئەوەی تا کۆتایی راپۆرتەکەت بەکاری بهێنیت. بە بوونی ئەو دەنگە لە باگراوندی راپۆرتەکەت دەتوانیت ئەو پانتاییەی دەتەوێت لە لای بیسەرەکاندا بەرجەستەبکەیت.

لە کاتی تۆمارکردنی دەنگی بەرامبەرەکەت دەکرێت مایکەکە روو لەو

بکەیتو کاتێکیش خۆت پرسیار دەکەیت رووی لە خۆتبکەیت. ئەو شتە بەستراوە بەرێژەی ئەو دەنگەدەنگ و ژاوەژاوەی لە دەوروبەرتاندا هەیە. ئەگەر بالآت لە گەڵ بالآی بەرامبەرەکەت جیاوازییەکی زۆری نییە، مایکەکە بەشێوەیەك رابگرە نەبێتە هۆی نارەحەتی ئەو. گەر ناچار بوویت مایکەکە زۆر لە دەمی نزیکبکەیتەوە تاکو دەنگی بە باشی تۆمار بکرێت، بزانە لە کارەکەتدا شتێك لە ئارادایە. پێش تۆمارکردنی چاوپێکەوتنەکە دڵنیابە لەوەی هیچ دەنگێکی چاوەڕوان نەکراو نابێتە هۆی تێکچوونی چاوپێکەوتنەکەت. بۆ نموونە دەنگی زەنگی تەلەفۆن یان ماتۆڕی یەخچاڵ یان زەنگی سەعات. ئەگەر چاوەڕێی ئەو جۆرە دەنگانە دەکەیت هەوڵبدە ئەو ئامێرانە بکوژێنیتەوە. گەر پێتنەکرا ئەوا لە جێگەیەکی دی چاوپێکەوتنەکە ئەنجامبدە.

بۆئەوەی دەنگەکە بەباشی دەربچێت باشتروایە هەواگری ئیسفەنجی لە سەر مایکەکە دابنێیت. ئەو هەواگرە بریتییە لە ئیسفەنجێکی بازنەییو دەخرێتە سەرمایکەکە، ئەو ئیسفەنجە لە بەردەم هاژەهاژی بادا دەبێتە رێگر.

لە کاتی بەکارهێنانی مینی دیسكو ریکۆردەردا لە بیرت نەچێت پاتری زیادە لە گەڵ خۆتدا هەڵبگریت. ئەوەش لە بیرمەکە ئاگات لە بۆشایی کاسێتەکانت بێت. گەربزانیت چەند ریپۆرتەر لە بەر هەڵنەگرتنی کەرەستەی پێویست توشی کێشە هاتوون، سەرت سوڕدەمێنێت.

چاوپێکەوتن:

ئەو هەواڵانەی بێژەرەکە بە تەنها دەیانخوێنێتەوەو هیچی دیکەیان لە گەڵدا نییە، نەك هەر بێزارکەرن، بەڵکو زۆر جێگەی باوەڕیش نیین. چونکە بیسەر تەنها لە زمانی بێژەرەکەوە ئاگای لە رووداوەکانی هەواڵەکە دەبێت.

ئەگــەر چــاوپێکەوتن لــە گــەڵ ئەوکەســانەی بــە شــێوەیەك لــە شــێوەکان پەیوەنــدییان بــە ڕووداوەکــەوە هەیــە، بکرێــت. وێنەیــەکی تــەواوتر لــە ســەر مەســەلەکە لای بیــسەران درووســتدەبێت. دەنگــی کەســەکان بــۆ ڕادیــۆ بــە هەمان ڕادەی وێنەکانیان بۆ تەلەفزیۆن گرنگییان هەیە. ڕیپۆرتەر بۆ ئەوەی پانتایی ڕووداوەکە بگەیەنێتە بیسەران، پێویستە چاوپێکەوتن لە گەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ڕووداوەکەوە هەیە. دەکرێت لە ڕێگەی چاوپێکەوتنێکەوە هەستو تووڕەیی ئەو خاوەن ماڵەی کە ماڵەکەی بە هــۆی لافــاوەوە وێــران بــووە یــان هەســتی خۆشــحاڵی ئــەو دایــكو باوکــەی منداڵەکــەیان لــــە نەخۆشــخانە چارەســـەرکراوە، بگەیەنیتـــە بیـــسەران. چاوپێکەوتن نەك بە تەنها دەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشانی بەرنامەکان، بـەڵکو گەر بە باشی ئەنجامبدرێت. دەکرێت لە ڕێگەیـەوە خـەڵکیش دیدوبۆچوونی خۆیان بخەنە ڕوو و لە گۆڕینی ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەدا بەشداریبکەن.

جۆری جل لەبەرکردن:

ئــەو کەســانەی لــە ڕادیــۆ کاردەکــەن هەنــدێجار پێیانباشــە بــە جلــی نــا ڕەسمییــەوە بــچنە ســەرکارەکانیان، یــان ئــەو ئەرکانــەی پێیــان ســپێردراوە. لەوانەیە ئەو بێژەرانەتان بینبێت بە پانتۆڵێکی کاوبۆیو تیشێرتێکەوە بۆ پێشکەشکردنی بەرنامە دێنە ناو ستۆدیۆوە. ئەوکارە بۆ ناو ستۆدیۆ ئاساییە. بەڵام بۆ ئەو پەیامنێرەی سەردانی شوێنو خەڵکی جیاواز دەکات، گونجاو نییە. ئەگەر جۆری جلەکانی تۆ جیدیی نەبێت، چۆن دەبێت چاوەڕێی ئـەوە بکــەیت خــەڵکانی دی بــە شــێوەیەکی جیــدی قــسەت بــۆ بکــەن؟ بێــژەرو ڕیپۆرتــەرەکانی تەلــەفزیۆن جلــی نافــەرمی لەبەرناکــەن. کەواتــە تــۆش بــە هــەمان شــێوە هەڵسوکەوت بکــە. پــەیامنێرەکان خــەڵکانی پــاك و پوختــەن. پیشەی پەیامنێریش وادەخوازێت شیکپۆشو خاوێن بن.

هۆكارێكی دی بۆ ئەوەی پەیامنێر شیكپۆش‌و پاك‌و پوختە بێت، ئەوەیە ریپۆرتەرەكانی رادیۆ لە روانگەی هەندێك خەڵكەوە وەك ئەستێرەو خەڵكانی بەناوبانگ تەماشا دەكرێن. یەكێك لە خۆشترین شتەكان ئەوەیە دەنگی تۆ لە ناوچەیەكی بەربلاودا دەبیسترێت. هەر ئەوەش وادەكات پاش ماوەیەك تا رادەیەك ناوبانگ دەربكەیت‌و نامەت لە لایەن بیسەرانەوە پێبگات. لەوانەیە لە كاتی كرینی شتومەكدا لە بازاڕ لە رێگەی دەنگتەوە بناسرێیتەوە. بۆیە رێگە مەدە بیسەرانت بە شێوەیەكی ناشیرین‌و پیس‌و پۆخڵ بتبینن. چونكە ناوو ناوبانگی خۆت‌و رادیۆكەشت دەكەوێتە ژێر پرسیارەوە.

چاوپێكەوتن لە گەڵ كەسایەتیەكاندا:

چاوپێكەوتن لە گەڵ خەڵكانی ناوداردا لەوانەیە ببێتە هۆی جۆرێك لە شڵەژان. نەك لەبەرئەوەی هەڵسوكەوت‌و گوفتاریان توڕەتدەكات، بەڵكو زیاتر لە بەرئەوەی تۆ دەزانی ئەوكەسەی چاوپێكەوتنی لەگەڵدا دەكەیت لە كارەكەی خۆیدا زۆر سەركەوتووەو خەڵكیش رێزێكی زۆری لێدەگرن.

وەك هەموو چاوپێكەوتنەكانی دی زانیاری پێویست لە سەر كەسایەتی بەرامبەرەكەت كۆبكەرەوە. ئەگەر ئەو كەسە بەمەبەستی پێشكەشكردنی شانۆیەك یان ریكلام بۆ كتێبێكی تازەی خۆی هاتبێتە شارەكەتان، هەوڵبدە تا پێتدەكرێت زانیاری لە سەر دوایین بەرهەمەكانی كۆبكەیتەوە. ئەو كەسەی چاوپێكەوتنی لە گەڵدا دەكرێت كاتێك تێدەگات رۆژنامەنووسەكە شارەزایی تەواوی لە سەر ئەو نییە زۆر بێزارو تورە دەبێت. كاتێك لە نووسەرێكی ناودار بپرسیت "هۆكاری هاتنتان بۆ ئەم شارە چییە؟" لە كاتێكدا ئاشكرا بێت ئەو بۆ ریكلام كردن بۆ كتێبەكەی هاتبێت، بێگومانبە شایانی ئەوەیت بە شێوەیەكی سوك هەڵسوكەوتت لە گەڵدا بكات.

زۆرجار خەڵکانی بە ناوبانگ بەو مەرجە ئامادەن چاوپێکەوتن بکەن ریکلام بۆ دوا بەرهەمو چالاکییەکانی خۆیان بکەن. بەڵام نابێت چاوپێکەوتنەکەی تەنها بۆ ئەو مەبەستە بێت. بیسەران پێیانباشە زانیاری هەمەجۆریان لەسەر کەسەکە دەستبکەوێت. بۆیە دەبێت لە نوێنەرایەتی ئەوانەوە تۆ ئەو پرسیارانە بکەیت. بۆ نموونە کاتێك لە گەڵ گۆرانیبێژیك کە شیعریش دەنووسێت سەبارەت بە دوایین دیوانە شیعرییەکەی چاوپێکەوتن دەکەیت، ئەوەشی لێبپرسە ئایا بە نیاز نیت ئەلبومێکی نوێ تۆمار بکەی؟

لەگەڵ هەرکەسێکدا چاوپێکەوتن دەکەیت، بزانە ئەو کەسە کێیەو نوێنەری کام رێکخراو یان کام حزبە؟ دەبێت ئەوانیش بزانن تۆ کێیتو نوێنەری کام رادیۆیت، بۆیە پێش چاوپێکەوتنەکە خۆت بناسێنەو بڵێ بۆ کام رادیۆ کاردەکەیت.

لە کاتی رێکخستنی دەنگدا وا لە بەرامبەرەکەت بکە ناوی خۆیو کارو بەرپرسیارێتییەکانی بڵێت. ئەوە دڵنیاتدەکاتەوە لەوەی زانیاری تەواوت لە سەر ئەو دەستکەوتووە.

کورت وپوخت:

پێشئەوەی چاوپێکەوتنەکە بکەیت ئەو پرسیارو ئامانجانەی هەتە لە بەرچاوبگرە. پێویستناکات پرسیارەکان بنووسیتەوەو لە سەر نوسراوەکە بیانخوێنیتەوە، چونکە لای بەرامبەرەکەت وەك کەسێکی ناشارەزا لە پیشەکەت دەردەکەویت. دەبێت پرسیارەکان کورتو پوختو پەیوەندیدار بن. بەڵام هەوڵبدە نەرمو نیان بن. لەوانەیە لە کاتی وەڵامەکانی بەرامبەرەکەتدا هەندێك پرسیاری دی سەر هەڵبدەنو ئاراستەی چاوپێکەوتنەکە بەتەواوەتی بگۆڕن. دەتوانیت دواتر بگەڕێیتەوە بۆ بابەتە

سەرەکییەکە. ئاگاداربە پرسیارێك مەکە بەرامبەرەکەت پێشتر لە کاتی قسەکانیدا وەڵامی دابێتەوە. ئەوە بەو مانایەیە بەباشی گوێت لە بەرامبەرەکەت نەگرتووە.

هەندێجار وا پێویستدەکات بە شێوەیەکی توند لە سەر ئەو پرسیارانەی دەیانکەیت پێدابگریت تا وەڵامێکی تەواوت دەستدەکەوێت. سیاسەتمەدارەکان بەوە ناسراون قسە زۆر دەکەن. ئەگەر خۆت رانەگریت کۆنترۆڵی چاوپێکەوتنەکەت لە دەستدەچێت. لە بەرامبەر ئەو حاڵەتانەدا خۆڕاگربە. بە ئەدەبەوە بەڵام بە شێوەیەکی جیدی درێژە بە چاوپێکەوتنەکە بدەو بەسەرخۆتدا زاڵ بە. پیشەیی هەڵسوکەوت بکەو مەکەوە ژێر کاریگەری بەرامبەرەکەتو لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە گوێ بۆ قسەکانی رابگریت.

راهێنانی پێمەکە:

ئەگەر بەرامبەرەکەت پرسیاری ئەوەی لێکردیت دەتەوێت سەبارەت بە چی بابەتێك چاوپێکەوتنی لە گەڵدا بکەیت؟ پێی بڵێ. بەڵام ئاگات لەوە بێت بەهیچ شێوەیەك ئەو پرسیارانەی بە نیازیت لێی بپرسیت پێی نەڵێیتو راهێنانی پێمەکە.

خۆئامادەکردن:

رۆژنامەنووسێکی باش دەتوانێت بە پەیڕەوکردنی هەندێك رێنمایی یارمەتی بەرامبەرەکەی بدات تا هەست بە ئارامییەکی زیاتر بکات. لەوانەیە لە هەندێك حاڵەتی تایبەتدا حەزت لە ئامادەسازی بۆ چاوپێکەوتنەکە نەبێت، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات ئەو کارە بە شێوەیەکی ئاسایی دەکەیت. دەبێت لە سەرخۆبیتو بتوانی بەسەرخۆتدا زاڵبیت. لەوانەیە بەرامبەرکەشت کەمێك نیگەڕانو دەستەپاچە بێت. بەتایبەت ئەگەر

ڕانــەهاتبێت لــە گــەڵ پەیامنێرانــدا قــسە بکــات. بــە ڕوویــەکی خــۆش‌و پێکەنینــەوە سڵاو لــە بەرامبەرەکــەت بکــە (بــەڵام نــەك لــە پرســەو بۆنــە خەماوییەکاندا). ڕاستەوخۆ تەماشای چاوانی بکە. با جوڵانــەوەی دەســت‌و ڕوخسارت بــە شــێوەیەك بێــت دڵنیــایی لای ئــەو دروســت بکــات. بــەڵام گــەر دەستت لە گیرفانتدا بێت‌و چاویلکە هەتاوییەکەت لـە چاودا بێت، چاوەڕێی ئەوە ناکرێت بەرامبەرەکەت بە شێوەیەکی ڕاست‌و ڕەوان‌و ڕاشکاوانە قسەت بۆ بکات.

تەنانەت ئەگەری ئەوە هەیە مایك‌و ڕیکۆردەرەکەشت ببێتە هۆی ئــەوەی بەرامبەرەکــەت ناڕەحــەت بێــت. بــۆ ئــەوەی ئــەو ناڕەحەتییــە نــەمێنێت، دەتوانیت سەبارەت بە کەرەستەکانت‌و ماوەی چاوپێکەوتنەکە هەنــدێك شــت بــۆ بەرامبەرەکــەت باســبکەیت. بــەڵام هــەرگیز کاســێتە تۆمارکراوەکــەی بــۆ لێندەیتــەوە. هەنــدێك کــەس هــەن حــەزیان لــە دەنگــی تۆمــارکراوی خۆیــان نییــەو لەوانەشــە گوشــارت بخەنەســەر چاوپێکەوتنەکە دووبارەبکەیتــەوە یــان بەشێك لە چاوپێکەوتنەکە بسڕیتەوە.

ئەگەر باڵات لە بەرامبەرەکەت بەرزتر بوو، پێشنیاز بکە بــە دانیشتنەوە چاوپێکەوتنەکە بکەیت. لە هــەموو حاڵەتەکانــدا بــە ئەدەبــەوە ڕەفتــار بکــە. گــەر لەبەرزاییــەوە تەماشــای بەرامبەرەکــەت بکــەیت، تــرس‌و دڵــەڕاوکێی لا دروســت دەکــەیت. لــە هەمانکاتــدا چــەمانەوە بــە ســەر بەرامبەرەکەتــدا وا دێتەبەرچــاو کــە لەگــەڵ منداڵێکــدا قــسە بکــەیت، ئــەوەش کــارێکی ڕاســت‌و دروست نییە.

کۆتایی چاوپێکەوتنەکە:

کۆتاییهێنان بە چاوپێکەوتن بەشێکی سەرەکی چاوپێکەوتنەو دەبێت بــە وردی‌و لەســەرخۆ ئەنجامبــدرێت. بــۆ کۆتاییهێنــان بــە چــاوپێکەوتنەکە بــە

روویەکی خۆشەوە سوپاسی بەرامبەرەکەت بکە. دەبێت هەڵسوکەوتت لە گەڵیدا بە شێوەیەك بێت هەستبکات رێزی زۆرت بۆ داناوە. نابێت بڵێیت "زۆر سوپاس‌و خوا حافیز"و پاشان پشتی لێبکەیت‌و بە رێگەی خۆتدا برۆیتەوە. لەکاتی کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانتدا، وەك ئەوەی لە گەڵ هاورێیەکی خۆتدا قسە بکەیت، سوپاسی بکە. تەنانەت ئەگەر پەلەت بوو یان زۆر هیلاك بوویت، یاخود پێویست بوو بابەتەکە لە کاتی خۆیدا تەسلیم بکەیت، نابێت بە خێرایی شوێنی چاوپێکەوتنەکە چۆڵبکەیت

ئەو کاتەی بەرنامەی چاوپێکەوتنەکە دادەرێژیت ماوەیەکیش بۆ کۆتاییەکەی دیاریبکە. بە هەڵسوکەوتی گونجاو دەتوانیت پەیوەندیەکانت پەرەپێبدەیت‌و کۆمەڵە دۆستێك بۆ خۆت بدۆزیتەوەو ببنە گوێگری هەمیشەیی رادیۆکەت‌و بە پەرۆشەوە بە دوای کارەکانی تۆدا بگەرێن.

پرسیارکردن:

کاتێك پرسیار دەکەیت بیسەرەکانت لە بەرچاوبێت. ئەگەر لەگەڵ وەزیری کشتوکاڵدا قسە دەکەیت با پرسیارەکانت سەبارەت بە کێشەی جوتیارەکانەوە بێت، نەك ئەو پرسیارانەی کە وەزیرەکە حەز دەکات لێی بکەیت. ئەگەر کاتت بە دەستەوەیە پێش چاوپێکەوتنەکە پەیوەندی بکە بە جوتیارێکی ناسیاوی خۆتەوەو لێیبپرسە پێشنیازەکانت چیین.

هیچ کاتێك خۆت وا دەرنەخەیت کە تێکۆشەرێکی بۆ بەدەستهێنانی ماقی بیسەران دەجەنگیت. ئەرکی پەیامنێر خستنە رووی پرسیارو وەرگرتنی وەڵامە نەك وەك پۆلیسی لێکۆڵینەوە پشکنینی بۆچوونەکانی بەرامبەرەکەی بکات. هەندێك پرسیار هەن وەڵامەکانیان ئاشکرایەو پێویستناکات هەر لە بنەرەتدا بکرێن. کاتێك پاش دۆڕاندنی یارییەك لە کاپتنی تیپەکە دەپرسیت: *"هەست بەچی دەکەیت؟"* دەبێت چاوەرێی تورەبوون‌و

نارەحەتی لێبکەیت، لە باشترین حاڵەتدا بە وشەیەك وەڵامتدەداتەوەو لە خراپترین حاڵەتیشدا لەوانەیە بیسەران رادیۆکانیان بە تورەییەوە دابخەن. هەوڵبدە لە کاتی پرسیارکردندا سوود لە توانای بیرکردنەوەی خۆت وەربگریت‌و خۆت لە جێگەی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدا دەکەیت دابنێیت گەر براوە یان دۆڕاوی یارییەك بیت حەز دەکەی چ پرسیارێکت لێبکرێت؟

دەبێت پرسیارەکان سادەبن‌و پەیوەندییان بە بابەتەکەو کەسەکەوە هەبێت. لەوانەیە پرسیاری درێژو ئاڵۆز بەشتێکی گرنگ بزانرێت، بەڵام سەر لە بەرامبەرەکەت‌و بیسەرانیش دەشێوێنێت.

خۆت لە پرسیاری تەڵقینی وەك: *"ئایا هەموو رۆژێك بەو هێڵەدا سواری پاس دەبیت؟"* دووربخەرەوە. لەم کاتەدا تەنانەت وەڵامی *( نەخێر و بەڵێ*ت دەست ناکەوێت. باشتروایە پرسیارەکان بەم شێوەیە بخەیتە روو: *"بە رای ئێوە چۆن دەکرێت بارودۆخی هێڵی پاسەکان چاك بکرێت؟"*

لەوانەیە هەندێك کەس بۆ ئەوەی تۆو بیسەران بە باشی لە قسەکانیان تێنەگەن بە مەبەست زاراوەو وشەی تایبەت بەکاربهێنن. یا هێندە ئەو وشانەیان دووبارە کردبێتەوە لەسەری راهاتبێتن. گەر لە وەڵامەکانیان تێنەگەیشتیت بێ شەرمکردن داوای روونکردنەوەی مەبەستەکانیان بکە.

لە کۆتایدا لە بەرامبەرەکەت بپرسە هیچ روونکردنەوەیەکی دیکەی هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکەی نەخێر بوو بزانە هەموو ئەو مەسەلانەی دەتویست پێی بگەیت روونبوونەتەوەوخۆت هیچت لا ماوە. چونکە لەوانەیە چیتر هەلی پرسیارکردنت بۆ نەڕەخسێتەوە.

لە بیرت نەچێت ئەرکی بەرامبەرەکەت ئەوە نییە چاوپێکەوتنەکە سەرنجڕاکێش‌وخۆش بکات، بەڵکو ئەو ئەرکە لە ئەستۆی تۆدایە.

دەرئەنجامی قسەکانمان ئەوەیە بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك دەبێت:

- زانیاری پێویست کۆبکەیتەوە.
- زاڵبیت بە سەر رەوتی چاوپێکەوتنەکەدا.
- پرسیارەکانت کورتو بەسوودبن.
- هۆشیاربیت.
- گەر پێویستیکرد داوای روونکردنەوەی زیاتر لە بەرامبەرەکەت بکە.
- دڵنیابە لەوەی شتی دی نەماوە.

تۆمارکردنی چاوپێکەوتن:

تۆمارکردنی چاوپێکەوتن چ لەکاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو چ لە کاتی کەڵکوەرگرتن لە کاسێتی روبع ئینجی دەنگدا یەك رێساو بنەمای هاوبەشی هەیە. ریپۆرتەرە بە ئەزموونەکان پێیانوایە کاری تۆمارکردن پێشئەوەی بگاتە ژووری هەواڵەکان، لە مێشکی رۆژنامەنووسەکە دەستپێدەکات. لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا گوێت لە هەندێك بابەت دەبێت، لای خۆتەوە دەزانیت بەکەڵکی پەخشکردن نایەتو لە مێشکتدا ئەوە تۆمار دەکەیت. تا وابکەیت کارەکە ئاسانتر دەبێت.

یەکەمین تۆمارکردن یان لە سەر کاسێت یاخود لە سەر CD دەبێت. بە بەکارهێنانی مینی دیسکێك یەکەمین جار لە سەر CD تۆماری دەکەیت. بەمجۆرە دەتوانیت هەندێك بەشی چاوپێکەوتنەکە هەڵبگریتو لە جێگەیەکی دیکەی دابنێیت. تەنانەت دەتوانیت هەندێك بەش هەڵبگریتو بۆ هەندێکی دیکەش نیشانە دابنێیت. ئەم کارە لە رێگەی ئەو بەرنامەیەوە دەبێت کە لە سەر کۆمپیوتەرەکەت دابەزاندووە. دەتوانیت تەنانەت ئەو ماوانەی بەرامبەرەکەت تێدا بێدەنگ بووە بیسڕیتەوە. بەلام بۆئەوەی لە رێگەی ریکۆردەرەوە تۆماری بکەیتەوە پێویستت بەوە هەیە ئامێرەکە

ببەستیتەوە بە ریکۆردەرێکی دیکەوەو تەنها ئەو بەشانەی خۆت دەتەوێت تۆماریانبکەیت.

گرنگ ئەوەیە لە سەرەتادا تەنها ئەوبەشانەی خۆت پێتباشە پەخشبکرێن. دەبێت ئاگات لەوە بێت ماوەی تۆمارکردنەکە لەو کاتە تێنەپەرێت کە بۆتداناوە. ئەمەیان تەنها تۆمارکردنێکی سەرەتاییەو بەدوایدا تۆمارکردنێکی وردترو تایبەتتر دێت. لەم قۆناغەدا کۆکەو بێدەنگیو هەموو ئەو شتانەی زیادەن دەسرێتەوە. دەتوانیت ئەمە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت ئەنجامبدەیت. بەڵام کاتێك بە ریکۆردەر ئەو کارە دەکەیت پێویستە بە کاسێتی روبع ئینجی بیکەیت.

ئەوەت لە بیرماوە هەندێك دەنگی دەوروبەرمان بۆ باگراوندی چاوپێکەوتنەکە تۆمارکردبوو؟ ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کەڵکی لێوەربگرینو لە رێگەیەوە کەشێکی سروشتی بدەین بە چاوپێکەوتنەکە. دەکرێت ئەم دەنگە لەسەر دیوی دووەم تۆمار بکەیت، یان دەتوانیت لە سەرەتا یاخود کۆتایی چاوپێکەوتنەکە دایبنێیت. دەنگی دەوروبەر یارمەتی بیسەران دەدات تاکو بە شێوەیەکی واقعی لەو شوێنەی چاوپێکەوتنەکەی تێدا تۆمارکراوە نزیکببنەوە.

بۆ سرینەوەی ئەو شوێنانەی وەستانیان تێدا هەیە، زۆر پەلە مەکە. پاراستنی ئەو قسانەی وتراون وەك خۆیان شتێکی گرنگو پێویستە. هەندێجار بە سرینەوەی وەستانێك یان ئەو قسانەی بە گومانو دوودڵییەوە دەکرێن، چاوپێکەوتنەکە هەموو ماناکانی خۆی لە دەستدەدات. ئەو کارە شتێکی زۆر نا ئەخلاقیەو دژ بە مافی ئەو کەسەیە کە چاوپێکەوتنەکەی لە گەڵداکراوە. لە هەمانکاتدا پێشێلکردنی مافی بیسەرانیشە. بۆ نموونە ئەم چاوپێکەوتنەی خوارەوە لە بەرچاو بگرە کە لە گەڵ ئۆسقوفی کڵێسای

بريتانيا ئەنجامدراوە:

ريپۆرتەر: بە بۆچوونى ئێوە ئايا هاتنە ناوەوەى ژنان بۆ كڵيساى بريتانيا هەنگاوێكى سەركەوتووە؟

ئوسقوف: (پاش بێدەنگيەكى درێژخايەنو هەڵكێشانى هەناسەيەكى قووڵ)، بەڵێ.

ئەم وەستانە درێژەو ئەو هەناسە قووڵە نيشانەى ئەوەيە ئوسقف پاش بيركردنەوەيەكى تەواو ئەنجا وتويەتى (بەڵێ). گەر هاتوو بێدەنگيەكەو هەناسە هەڵكێشانەكەمان سڕييەوە پێچەوانە دەبێتەوە. ماناى وايە ئوسقوف بێ بيركردنەوە رەزامەندى دەربڕيوە. ئەو كارەش نەك تەنها بەو مانايە دێت كەسايەتى بەرامبەرەكەت گۆڕيوە، بەڵكو بوويتە هۆى ئەوەى برادەرەكانى لەو هەڵوێستەى ئەو سەريان سوڕ بمێنێت. ئەوش خۆى لە خۆيدا سووكايەتيكردنە بەو. ئەو پەيامنێرانەى لە كاتى تۆماركردنەوەى چاوپێكەوتنەكەدا بێويژدانانە هەوڵى دەستكاريكردنى قسەكان دەدەن، يان ئەو پەيامنێرانەى بە هۆى تەمەڵييەوە چاوپێكەوتنەكە وەك خۆى تۆمار ناكەن، ناوو ناوبانگى ئەو كەسەى چاوپێكەوتنەكەى لە گەڵدا تۆماركراوە لەكەدار دەكەنو بۆچوونەكانى بێبايەخ دەكەن. ئەو رەفتارانە پيشەى ريپۆرتەرى ناشيرينو ريسوا دەكەن. ئەوە لە كاتێكدايە پێويستە خەڵك بڕوايان بەو پيشەيە هەبێتو لێى دڵنيابن. بە كورتى نەخستنە رووى واقعەكە وەكو خۆى. لە بەرژەوەندى هيچ كەسێكدا نييەو تەنها ئەوەيە كارێكى ناشيرينەو مايەى شەرمەزارييە.

پێشترو لەو كاتانەى لە رێگەى ريكۆردەرەوە چاوپێكەوتنەكان تۆماردەكران تاكو كارەكە تەواو دەبوو هيچ بەشێكى چاوپێكەوتنەكەيان فرێنەدەدا. تۆش هەوڵبدە هيچ زانيارييەك فرێمەدە، پێش دەستپێكردن بە

قۆناغێکی نوێ، بە قۆناغی پێشووتردا بچۆرەوە بۆ ئەوەی هیچ هەڵەیەك ڕوو نەدات.

چاوپێکەوتن لە گەڵ خەڵکدا پاشئەوەی بەسەر تۆمارکردنی چاوپێکەتنی ئاساییدا زاڵ بوویت، کاتی ئەوە دێت خۆت لە چاوپێکەوتنی خەڵکدا تاقبیکەیتەوە.

لە میدیا بیستراوو بینراوەکاندا بەشێك بۆ ڕەنگدانەوەی دیدگای خەڵك تەرخانکراوە، ئەم بەشە لە ڕاستیدا تۆمارکردنی دەنگی خەڵکی جیاجیایە بۆ ئەوەی کاردانەوەی خۆیان لە چەند وشەیەکی کورتدا سەبارەت بە بابەتە جیاجیاکانی هەواڵەکان بخەنەڕوو. چاوپێکەوتن لە گەڵ خەڵکدا دەبێت پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێتو بۆ پڕکردنەوەی کاتی بەرنامەکان نەبێت. دەکرێت بابەتی چاوپێکەوتنەکە جیدی یان تەنز بێتو ژمارەی ئەوانەش چاوپێکەوتنیان لە گەڵدا کراوە دەکرێت گۆڕاو بێت. ئەمجۆرە چاوپێکەوتنانە بۆ ڕادیۆ لۆکاڵییەکان زۆر گرنگو گونجاون. چونکە دیدگای خەڵك سەبارەت بەو بابەتانەی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ژیانیانەوە هەیە دەخاتەڕوو. دەکرێت بیسەران هاوڕا یان دژی ئەو قسانەبن کەوا لە لایەن خەڵکی ناوچەکەیانەوە دەخرێنەڕوو.

کارەکەش بەم شێوەیەیە:.تەنها پرسیارێك ئامادە دەکەیتو لە سەرشەقام یان لە شوێنی کارەکانیان لێیان دەکەیت. بۆ نموونە دەکرێت پرسیارەکە ئەمە بێت: "بە ڕای تۆ ئایا ژنان شۆفێری چاکن؟"، ( ئەم پرسیارە پەیوەندی بەو هەواڵەوە هەیە کە دەڵێت ئامارەکان ئەوە پیشاندەدەن شۆفێری ژنان لە هی پیاوان باشترو دڵنیا ترە). ئەگەر ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لە گەڵدا دەکەیت حەزی لە وەڵامدانەوە هەبوو دەکرێت پرسیاری دیکەی لێبکەیت. بۆ نموونە: " بۆ وا بیر دەکەیتەوە؟"، یان

دەتوانیت بپرسیت: " پیاوان چۆن دەتوانن ببنە شۆفێرێکی باش؟". بەڵام ژمارەی پرسیارەکانت با سنووردار بێت لەوانەیە بەرنامەکە درێژە بکێشێت، ئەو کات تۆمارکردنەوەی کێشەیە. هەندێك کەس لەوانەیە بە گاڵتەوە وەڵامتبدەنەوەو لەوانەشە هەندێکی دیکەیان مەسەلەکە زۆر بە جیدی وەربگرن. وەڵامەکان هەرچییەك بن، دەبێت لە هەموویاندا شتێکی جوان دروست بکەیت.

ئاگات لە مایکەکە بێت، لە کاتێکدا ریکۆردەر بەکار دەهێنیت دیارە کاتی ئەوەت نییە هەموو جارێك دەنگەکەی رێکبخەیت. بۆیە تا پێتدەکرێت مایکەکە لە دەمی بەرامبەرەکەت نزیك بکەرەوە بۆ ئەوەی دڵنیابیت لەوەی دەنگەکان بە باشی تۆمارکراون.

گەر چاوپێکەوتنەکەت لەگەڵ خەڵکانێك بێت بە کە لەهجەی جیاجیا قسە دەکەن، ئەوە شتێکی زۆر چاکە. لە شارە گەورەکاندا خەڵك زیاتر بە لەهجەی باو قسە دەکەن. لەم حاڵەتەدا ئەو کەسانەی لەهجەیان جیاوازە هەستدەکەن بایەخ بەوان نادرێت، بۆیە تا پێتدەکرێت هەندێك خەڵکیش بدۆزەرەوە کەوا لەهجەیان جیاوازە.

وەك چاوپێکەوتنەکانی دی، دەبێت لە گەڵ خەڵکدا راستو دروست بیت. بۆیان روونبکەرەوە خەریکی چیتو بۆ کام رادیۆ بەرنامە ئامادە دەکەیت. ئەگەر حەزیان بە قسەکردن نەبوو ناچاریان مەکە.

گەر وەڵامی کەسێکت بە دڵ نەبوو یان لە گەڵ بۆچوونەکانی تۆدا ناکۆك بوو، روو گرژمەکەو لە گەڵیدا بەشەڕ مەیە. بەدەم پێکەنینەوە بڕۆ بۆ لای کەسێکی دیو درێژە بەکارەکەت بدە. پاشان بۆت دەردەکەوێت کاردانەوەی خەڵك بەستراوە بە رۆژو ئاوو هەواو وەرزەکانو کاتەوە (زۆر کەس حەزیان لە رۆژی یەکەمی هەفتە نییە). ئەگەر یەکێکت بینی حەزی لە بینینی

کەس نەبوو، وازی لێبێنە. تەنانەت ئەگەر چاوپێکەوتنی سێ یان چوار کەس بڵاو بکەیتەوە، لەگەڵ بیست کەسدا چاوپێکەوتن بکە. بۆئەوەی بۆچوونی خەڵکانی تەمەن و پیشەو باری کۆمەڵایەتی جیاواز بخەیتەڕوو. دواتر لە ناو هەموویاندا باشترینەکانیان هەڵبژێرە. درێژترین چاوپێکەوتن تەنها یەك دەقەی بەرنامەکە دەگرێت. بۆیە تا پێتدەکرێت لە هەڵبژاردنەکانتدا وردبینبە.

لە کاتی چاوپێکەوتنەکاندا شوێنی قەرەباڵغ هەڵمەبژێرە بۆ چاوپێکەوتن. ئەو واژەواژو هاتوهاوارانەی هەن، هەم کەسەکە دەشڵەژێنن و هەم زیان لە تۆمارکردنی دەنگەکەش دەدەن.

لە کاتی ڕێکخستنی چاوپێکەوتنەکاندا هەوڵبدە دەنگە جیاوازەکان لە دوای یەك دابنێیت. ئاگات لە قسەی هەڵەو ناڕاست بێت. لەوانەیە هەندێك جوێنی زۆر ناشیرین قابیلی قەبوڵبێت، بەڵام پێش پەخشکردنیان ڕاوێژێك لە گەڵ کەسانی دیکەدا بکە. لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا بۆچوونێك کە پێتوایە زیاتر لە بۆچوونی خەڵکییەوە نزیکە دابەزێنە. دەکرێت ڕاپۆرتەکە بە شتێکی تەنز ئامێز کۆتایی پێبێت، یان شتێك بێت بیسەران ناچاربکات بیر لە بابەتەکە بکەنەوە.

لە ڕاپۆرتە جیدییەکاندا ئەوکارە شتێکی سەختە، دەبێت دەربڕینی بۆچوونەکانت بە شێوەیەك بێت. هەست و سۆزی ئەو خەڵکانەی لە ڕووداوەکەدان پیشانبدات. نابێت بە شێوەیەکی سادە تەماشای بابەتەکە بکەیت. ئاگاداربە لە پێشەکی ڕاپۆرتەکەدا ئەوە پیشان بدە کە ئەو چاوپێکەوتنانە بۆچوونی هەموو خەڵك نیین و تەنها بیروڕای ئەوانەیە کە چاوپێکەوتنەکەیان لە گەڵدا کراوە.

نووسینی پێشەکی:

پێشەکی، ئەو بەشەیە کە چاوپێکەوتن یان راپۆرتەکە بە بیسەران دەناسێنێتو لە لایەن بێژەری بەرنامەکەوە دەخوێنرێتەوە. بە شێوەیەکی گشتیی پێشەکی راپۆرتە هەواڵییەکان نابێت لە دەقەیەك زیاتر بێت و بۆ راپۆرتە درێژەکانیش پێویستە زۆرترین کات سێ دەقە بێت. هەڵبەت دەبێت بزانین ئەو ماوەیە بە پێی سیاسەتی رادیۆکان دەگۆڕێت.

تا پێشەکییەکە کورت بێت باشترە، بەڵام بەو مەرجە بیسەران ئاشنای راپۆرتەکەو ئەو دەستەواژانەبن کە تێیدا بەکارهاتوون. بۆ راکێشانی سەرنجی بیسەران بۆلای راپۆرتەکە، پێویستە لە پێشەکییەکەدا زانیارییە سەرەکییەکانو هێڵی سەرەکی راپۆرتەکە دەستنیشان کرابێت. پێشەکییە یەك دێڕییەکان کاریگەر نین: *"وەزیری دارایی بە نیازە رێژەی باج لە سەر داهات زیاتر بکات. پەیامنێرەکەمان ئەم راپۆرتەی ئامادەکردووە"*. پێشەوەی زانیاریی بدەیت بەبیسەر دەبێت سەرنجی رابکێشیت.

ئامانجەکانی نووسینی پێشەکی بریتین لە:

- *راکێشانی سەرنجی بیسەر بۆ لای هەواڵێکی نوێ.*
- *ناساندنی هەواڵەکە یان راپۆرتەکە.*
- *خستنەڕووی زانیاری زیاتر یان نوێتر لە سەرچاوەی دیکەوە یان لە راپۆرتی دیکەوە.*

دەبێت لە پێشەکیدا زانیاری تەواو لە سەر پێشینەی هەواڵەکە بخەیتە بەردەستی بیسەرانەوە بۆ ئەوەی گەر راپۆرتەکە هەڵەی هونەری تێکەوتبێت لە ناوەڕۆکی هەواڵەکە تێبگات.

جگە لەوەی پێشەکی بۆ بیسەر وەك ئاگادار کردنەوەیەکە، هەندێك رێنوێنیش دەخاتە بەر دەستی بێژەرو ئامادەکەرو نەخشەدارێژەری بەرنامەکە.

پێشەکی دەبێت لەم بەشانە پێکهاتبێت:

- وشەیەك، وەك مانشێت بۆ ناساندنی راپۆرتە دەنگیەکە بەکار هاتبێت.

- مێژوو و کاتی نووسین (بۆ ئەوەی لە بەرنامەکانی داهاتوودا بزانرێت چەندە بە سەر ئەو راپۆرتەدا تێپەڕیوە).

- ناوی تەواو یان پیتی کورت کراوەی ناوی نووسەر (ئەگەر سەرچاوەی هەواڵەکە ئاژانسێکی هەواڵە ناوەکەی بنووسە).

- لە کۆتایی پێشەکییەکە وشەی *"تەواو"* بنووسە. (ئەم وشەیە نیشانەیە بۆ کۆتایی پێشەکییەکەو دەسپێکی راپۆرت یان چاوپێکەوتنە دەنگییەکە). پاشان ناو یان ژمارەو ماوەی راپۆرتەکەو چەند وشەیەك لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا بنووسەوە.

نموونە: مشتە کۆڵە ٧ ئەپرێل/ ١٤,٣٠جی دی ئاژانسی چستر

*"بوج باشر"* پاڵەوانی جیهانیی مشتەکۆڵەی کێشی قورس بە مەبەستی کردنەوەی هۆڵێکی نوێی لەشجوانی ئەمڕۆ دێتە *"تاون چستر"*. *باشر* کە لە سەرەتای ئەمساڵدا توانی لە پێنج گێمدا لە *"نوشر ناکل"* بباتەوەو ببێتە پاڵەوانی جیهانیی لە یاری مشتە کۆڵەدا، ئێستا سەرقاڵی پڕوپاگەندەکردنە بۆ خۆی لە وڵاتدا. ئەم یاریزانە بە لای خەڵکی شاری *"تاون چستر"*ەوە نامۆ نییەو سەرەتای ژیانی وەك بەڵێندەری بیناسازی لێرەوە دەستپێکردوە. ریپۆرتەر *"جوهان دو"* لە هۆڵە نوێیەکەدا ئەم چاوپێکەوتنەی لە گەڵدا کردووە.

تەواو/ مشتەکۆڵە ٣٠ چرکە

وشەکانی کۆتایی/ هیوادارە بە زووترین کات بگەڕێتەوە.

راپۆرتی شیکاری سێ دەقەیی

ئەم جۆرە راپۆرتە تێکەڵێکە لە بەشەکانی فێرکاری‌و سەرگەرمی.

دەکرێت لە گۆڤارێکی رادیۆییدا پێشکەش بکرێت. راپۆرتە شیکارییە رادیۆییەکان وەك بابەتە درێژەکانی گۆڤارەکان باس لەرووداوەکانی پشتی پەردەی هەواڵەکان دەکەن.

دەستەواژەی سێ دەقەیی دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی ۱۹۳۰ کاتێك بۆ یەکەمینجار راپۆرتی درێژ پێشەکەشکرا. ئامێرەکانی تۆمارکردنی دەنگ لەو کاتەدا تەنها سێ دەقە یان کەمتریان خەزن دەکرد. هەرچەندە ئێستا ئامێرەکان ئەوکێشەیەیان نییە، بەڵام خەڵك لە سەر راپۆرتی کورتو پوخت راهاتوون. هەندێك ئێزگەی رادیۆیی بە پێی ئەو سیاسەتانەی پەیڕەوی دەکەن راپۆرتی کورت یان درێژ ئامادە دەکەن. بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی سێ دەقە ماوەیەکی گونجاوە. زۆرنین ئەو بابەتانەی لە سەر ئاستی جیهاندا مایەی گرنگی پێدانن. بۆیە تا راپۆرتەکە کورت تر بێت، ماوەیەکی زۆرتر بە دەستەوە دەبێت بۆ پێشکەشکردنی بابەتی دیکە.

ئامادەکردنو بەرهەمهێنانی راپۆرتێکی شیکاری کارێکی زۆر گرنگە بۆ پەیامنێرو جیاوازە لە کۆکردنەوەی هەواڵی رۆژانە. دەتوانیت لەو هەواڵانەی کۆیان دەکەیتەوە بۆچوونی باش لە سەر ئامادەکردنی راپۆرتی شیکاری بەدەستبهێنیت. دەکرێت خاڵێکی تایبەت هەبێت سەبارەت بە بابەتی هەواڵێكو لە رێگەیەوە راپۆرتێکی شیکاری زۆر باش درووستبکرێت.

بەهۆی کەمی کاتەوە ناتوانرێت باس لە بابەتە ئاڵۆزەکان بکرێت. بۆیە پێویستە بابەتەکە سادەو ئاسان بێتو ئەوە بزانە کە دەتەوێت چی پەیامێك بگەیەنیتە بیسەرانی رادیۆکەتان. پێشئەوەی باسی بابەتەکە لەگەڵ بەرێوەبەر یان ئامادەکاری بەرنامەکە بکەیت. بۆچوونەکانی خۆت بە کورتی لەسەر کاغەزێك بنووسەوە. بۆ نموونە:

*"پیت مەك گیت" ئەندازیارێکی کۆمپانیای تاون چسترەو ئامێرێکی*

*داهێنـاوەو بڕیـارە تاقیبکاتـەوە. ئامێرەکـە دەتوانێـت ڕێگربێـت لـە کـوژران‌و برینـداربوونی هـەزاران کـەس بـە هـۆی مینـەوە. ڕاپۆرتـە شـیکارییەکەی ئـەمڕۆمان بـاس لـە چۆنێتی داهێنـانی ئامێرەکـەو شـێوازی تاقیکردنـەوەو ئەوانەی بڕیارە بیکرن، دەکات.*

ئەم ڕاپۆرتە لە سێ بەش پێکهاتووەو دەبێت بۆ هـەر بەشێکی دەقەیـەك تـەرخانبکرێت: دەقـەی یەکـەم بـۆ ئـەوەی "پیـت" ئـەم ئـامێرەی چـۆن درووسـتکردووە. دەقـەی دووەم بـاس لـە چـۆنێتی تاقیکردنـەوەی ئامێرەکـە دەکات‌و سێیەم دەقەش سەبارەت بەو کەسانەیە کە دەکرێت ئامێرەکە بکرن. پێویستە لە گەڵ زیاتر لە یەك کەسدا چاوپێکەوتن بکەیت، بۆئەوەی دەنگی کەسـانی جیـاواز لـە ڕاپۆرتەکـەدا پەخـشبکرێت. بـۆ نموونـە نوێنـەری ڕێکخراوێك کـە کـاری هەڵگرتنـەوەی مینـە، یـان نوێنـەری کۆمپانیایـەك کـە ئامادەیە ئەم دەزگایە بکڕێت، ئەوانە دەتـوانن سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە ڕای خۆیان دەربڕن.

لەوانەیـە ئـەو زانیارییانـەی بـۆ ڕاپۆرتەکـە ئامـادەکراون لـە پێویـست زیـاتربن. بـەڵام ئامـادەکردنێکی وردو بـاش ئـەو کێشەیە چارەسـەر دەکـات. کۆکردنەوەو کۆنترۆڵکردنی زانیاری زیاد لە پێویـست کـارێکی سـادەیە. بـەڵام ئامـادەکردنی ڕاپۆرتێـك بـۆ ئـەوەی سـێ دەقـە تێپـەڕ نـەکات کـارێکی زۆر سـەختە. هـەردەم بـیرت لای چـونێتی دەسـپێکردن‌و کۆتاییپێهێنـانی ڕاپۆرتەکەت بێت. بە تایبـەتی پێشەکییەکەی زۆر گرنگە، چونکە بیرۆکـەی بابەتەکە "دەفرۆشێتە" بیسەران.

خـاڵێکی بنـەڕەتی لـە کـارکردنی ڕادیـۆدا ئەوەیـە دەبێـت ڕاپۆرتەکـە ڕاپۆرتێـك بێـت نزیـك لـە حەقیقـەت. سـەبارەت بـەو ئـامێرەی کـە مـین دەدۆزێتەوە پێویستە زۆربەی ڕاپۆرتەکەت لەو شوێنە ئامـادە کردبێـت کـە "

پیت مەك گیت" ئامێرەكەی تێدا درووستكردووە. ئەگەر ئەو ئامێری دیكەی لە درووستكردنی داهێنانەكەیدا بەكار هێناوە تۆ دەنگی ئەو ئامێرانە تۆمار بكە. تەنانەت دەتوانیت دەنگی تەقینەوەی مینیش بەكار بهێنیت. لەوانەیە نەتوانیت دەنگی تەقینەوەی مینێك تۆماربكەیت، بەلام دەكرێت لە ئەرشیفی رادیۆكەتدا ئەو دەنگەت دەستبكەوێت. لەم حاڵەتەدا دەبێت دڵنیابیت لەوەی ئەو دەنگە دەنگی تەقینەوەی مینە، نەك دەنگی گوللەی تۆپ. ئەگەر كەوتیتە گومانەوەو بۆ ئاسانكاری دەنگی تەقینەوەیەكی دیكەت بە كارهێنا، كاتێك لەو پەیوەندییانەی بۆ رادیۆكەتان دێتو رەخنەی هەبوو دەنگی تەقینەوەكە دەنگی تەقینەوەی مین نەبووە. سەرتان سورِ دەمێنێت.

بەكارهێنانی مۆسیقایەك لە گەڵ راپۆرتەكەدا بگونجێت كارێكی گونجاوە، بەلام نابێت مۆسیقا بكرێتە هۆیەك بۆ كەمبایەخكردنی بابەتێكی جیدی. ئەو بابەتانەی لە راپۆرتێكی شیكاریدا دەخرێنەڕوو دەبێت هەم فێركاری و هەم سەرگەرمیی بن. لایەنی سەرگەرمیی راپۆرتێك دەتوانێت زیاتر سەرنجی بیسەران رابكێشێت. هەرگیز ئەوەتان لە بیرنەچێت ئەو پەیامەی پەخشدەكرێت گرنگترە لەو كەناڵەی پەیامەكەی لێوە پەخشدەكرێت.

راپۆرتی تەركیبی:

چاوپێكەوتنو راپۆرتی شیكاری شێوازێكی گرنگن بۆ گەیاندنی ماناكان. بەو مەرجەی بابەتەكە سەرنجڕاكێش بێتو ئەوەی چاوپێكەوتنی لە گەڵدا دەكرێت راشكاوانە قسەكانی بكات. لەو كاتانەی ئەو جۆرە هەلومەرجە ئامادە نییە، یان زیاد لە یەك كەس هەیە بۆ چاوپێكەوتن، پێویستدەكات كار بە شێوازی راپۆرتی تەركیبی بكرێت. ئامادەكردنی راپۆرتێكی تەركیبی زۆر لەو بەرنامە كورتانە دەچێت كە تێیدا بابەتەكان لە رێگەی پەیوەندیكردن بە ستۆدیۆ یان پەخشكردنی هەندێك بەشی لە پێشدا تۆماركراو

پێشکەشدەکرێن. لە ڕێگەی ئامادەکردنێکی هۆشیارانەوە دەتوانیت ڕاپۆرتێکی سەرگەرمیی خۆش ئامادەبکەیت. بەڵام بەو مەرجەی دڵنیابیت لەم ڕێگایەیەوە پەیامەکەت دەگاتە بیسەران. باشترین شێوە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئەوەیە سادەترین ڕێگە بۆ گەیاندنی پەیامەکە هەڵبژێریت.

نووسینی هەواڵ:

هونەرەکانی پەیوەندیدار بە نووسینی هەواڵ زۆر جیاوازن لە گەڵ ئەو ڕاپۆرتە هەواڵییانەی بۆ چاپەمەنییەکان ئامادە دەکرێن. ئەو وشانەی لێرەدا دەیاننووسیت، پێویستە ببیسترێن. بۆیە تا دەکرێت با زاراوەکان کورت و ڕوون بن. جگە لەوە پێویستە ئەو بێژەرەی *(کە لەوانەیە خۆت بیت)* تێکستەکە دەخوێنێتەوە بە ئاسانی ئەو زاراوانە بڵێیتەوە. بەڵام لە ڕۆژنامەکاندا خوێنەر گەر جاری یەکەم تێنەگەیشت لە مانای ئەو زاراوەی لە تێکستێکدا دەیخوێنێتەوە. دەتوانێت بگەڕێیتەوە دواوەو جارێکی دی بیخوێنێتەوە. کەچی بیسەری ڕادیۆ ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساوە، ڕستەیەکی قورس و درێژ دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی بیسەرو ناچاریدەکات شەپۆلی ڕادیۆکە بگۆڕێت یان ڕادیۆکە بکوژێنێتەوە.

بەڵام بەلەبەرچاونەگرتنی ئەو کەناڵەی هەواڵەکەی تێدا پەخشدەکرێت، کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش هەن دەبێت لە نووسینی هەواڵەکاندا لەبەرچاو بگیرێن، بۆ نموونە لیدی هەواڵ جگە لەوەی دەبێت سەرنجی پەیاموەرگر ڕابکێشێت، پێویستە گرنگترین زانیارییەکان بخاتە بەردەستی.

***"کانە بەردینەکەی - تاون- بڕیارە دابخرێت و لە ئەنجامدا زیاتر لە ٢٥٠ کەس بێکار دەبن."***

ئەم لیدە هەم سەرنجی بیسەر ڕادەکێشێت و هەم ڕووداوەکەش

دەگێڕێتەوە. تەنانەت گەر دوابەدوای خوێندنەوەی ئەو رستەیە رادیۆکە لەکار بکەوێت بیسەران پەیامەکەیان پێگەیشتووە. بێگومان کاریگەری ئەم رستەیە زیاترە لەو رستەیەی کە لە خوارەوە هاتووە:

*"کانە بەردی تاو سەربە کۆمپانیای -ئەکمی ئەستۆن-و ئەم بەیانییە رایگەیاند"*

بیسەر هەموو بیروهۆشی خۆی نەخستووەتە لای رادیۆکەوەو لەوانەشە لەو کاتەی رادیۆکە کاردەکات ئەو سەرقاڵی ئەنجامدانی ئیشی دیکە بێت. بۆیە راکێشانی سەرنجی بیسەر کارێکی زۆر گرنگە. پاش راکێشانی سەرنجی بیسەر، ئەو دەم دەبێت راپۆرتەکە بە شێوەیەکی تەواوو بە هەموو وردەکاریەکانییەوە دووبارە بکرێتەوە.

وا باوە بێژەرەکان لە سەرەتادا سەردێڕی هەواڵەکان دەخوێننەوە. سەردێڕی هەواڵەکان بریتییە لە چەند رستەیەکی کورتو بیسەران لە گرنگترین ئەو بابەتانەی لە هەواڵەکاندا دەخوێنرێنەوە ئاگاداردەکاتەوە. بۆ نموونە دەکرێت سەردێڕی هەواڵەکان بەم شێوەیە بێت:

*"ئێستا هەواڵەکانی کاتژمێر دە تان پێشکەش دەکەین. کانە بەردینەکەی - تاون- بڕیارە دابخرێت و لە ئەنجامدا زیاتر لە ٢٥٠ کەس بێکاردەبن. جوتیارەکانی شار لە بەردەم سۆپەرمارکێتەکانی شار نارەزایی دەردەبڕن. سەرئەنجام بڕیارە پەیکەرە ناودارەکەی تاون چستر هال چاکبکرێتەوە"*

پاش بێدەنگییەکی کورتو پەخشکردنی ئارمی هەواڵەکان، درێژەی هەواڵەکان پێشکەشدەکرێت:

*"پاش چەندین هەفتە لە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون، کۆمپانیای ئاکمی ئەستونی خاوەن کانە بەردی چستر، سەرئەنجام رایگەیاند ئەو کانە دادەخرێت. لە ئەنجامدا ٢٥٠ کەس بێکار دەبن. بە پێی قسەکانی وتەبێژی*

*ئەو کۆمپانیایە کە زیاتر لە ٢٠٠ ساڵە لە سەر ئاستی جیهاندا بەردی بەناوبانگ بەرهەمدەهێنێت، کەرەستەی خاوی تەواو بووە. پێش دوو ساڵ بەهۆی نارەزایەتی ڕێکخراوەکانی ژینگەپارێزیو خەڵکی ئەو ناوچەیەی فراوانکردنی کانەکە زیان بە موڵکەکانیان دەگەیەنێت، ڕاگیرا. کۆمپانیای ئاکمی ئەستوون بە نیازە زۆربەی ئەو کرێکارانەی کارەکانیان لە دەستدەدەن لە کانەبەردەکانی دیکەی خۆی دابمەزرێنێت"*

لەو هەواڵەی تایبەتە بەکانەکەوە، بیسەر یەکسەر ئاگاداری بێکاربوونی ٢٥٠ کەس دەبێت. هەر ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی کۆمپانیاکە چەندین هەفتە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بکات. بەدوایدا قسەکانی وتەبێژی کۆمپانیاکەو مێژوویەکی کورتی چالاکییەکانی کۆمپانیاکە لە بەرهەمهێنانی بەردی کان دێت. هەواڵەکە بە پێشبینییەکی خۆش گوایە کرێکارەکان لەوانەیە لە کانەکانی دیکەی بەرد بخرێنەوە سەرکار کۆتایی دێت.

ئەم هەواڵە کورتە هەموو ئەو زانیارییە بەسوودانەی لە سەر ڕووداوەکە هەن تا کاتی پێشکەشکردنی دەخاتەڕوو. هەڵبەت لەوانەیە لە چەند سەعاتی ئایندەدا زانیاری نوێتر لە سەر ڕووداوەکە ئاشکرابێت. بیسەرێك گەر لە ناوەڕاستی هەواڵەکەدا گوێی لەوەبێت باس لە بڕیاری کۆمپانیاکە دەکرێت سەبارەت بە گواستنەوەی کرێکارەکان بۆ جێگەیەکی دی، دەزانێت ماجەراکە سەبارەت بە داخستنی کانە بەردەکانە.

ئەو ئامارو زانیارییانەی لە هەواڵەکاندا دەخرێنەڕوو، دەبێت بە شێوەیەکی سادەو ئاشکرا باس بکرێن. بۆ ئەوەی تێگەیشتنی ئاسان بێت. ئەگەر خوێندنەوە یان تێگەیشتن لە هەواڵێك بۆ خۆت گران بێت، دڵنیابە لەوەی بیسەریش بە باشی لێی تێناگات.

زۆرجار بۆ ئەوەی ئامارو ژمارەکان تێگەیشتنیان ئاسان بێت

پێویستدەکات کۆیبکەیتەوە. بۆ نموونە لە جیاتی ئەوەی بنووسی ٨/٩٪ دەکرێت بنووسی نزیکەی ١٠٪ یان لە "یەك لە دەی" یاخود لە جیاتی بڕی ٤٨٩٥ پاوەند دەکرێت بنوسیت "نزیکەی پێنج هەزار پاوەند" گەر پێتکرا ئامارو ژمارەکان دووبارە بکەرەوە بۆ ئەوەی بیسەران گێژ نەبن. بۆ نموونە:

باجەکان نزیکەی ١٥٪ زیادیان کردوە. ١٠ ملیۆن پاوند بۆ خەرجییەکانی حکومەت زیاد دەکات. ئەو خەرجیە زیادەیەی دەخرێتە سەر باجدەرەکان ساڵانە ٢٠ پاوەند دەبێت.

بیسەران بە شێوەیەکی تایبەت گوێ بۆ دەستەواژەی "٢٠ پاوەند دەبێت" رادەگرن. جگە لەوانە ژمارەکان بە تایبەت ژمارە سەد هەزاریو ملیونییەکان هەم بە ژمارە بنووسەو هەمیش بە پیت. بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەدا هەڵە روونەدات. راستە تۆ هەواڵەکان دەنووسیتەوە، بەڵام لەوانەیە یەکێکی دی بەرپرسی خوێندنەوەیان بێت. بۆ نموونە بنووسە:

*٢٥ملیۆن و٢٥٦هەزارو ١٩٧*

ئەو نووسەرەی بۆ رۆژنامەیەکی ناودار کاردەکات رێگەی ئەوەی پێدراوە رستەو ستایلی ئاڵۆزبەکار بهێنێت. چونکە بەشێکە لە شێوازی دارشتنی ئەو بلاوکراوەیە. بەڵام نابێت نووسەری رادیۆ ئەوە بکات، هەندێك رستە هەرچەندە بۆ چاپەمەنییەکان گونجاون. بەڵام بە هیچ شێوەیەك بۆ تێکستە رادیۆییەکان ناشێن. بینین وخوێندنەوەی وشەیەك زۆر جاوازە لە بیستنی. چونکە لەوانەیە لە کاتی بیستندا ماناکەی یان شێوەی دەربڕینی بگۆڕێت. هەندێك زاراوە هەن لە رووی فۆنەتیکەوە زۆر لێك نزیکنو وتنەوەی هەندێکی دیکەیان زۆر سەختە. باشتروایە لە کاتی نووسینی هەواڵەکان بۆ رادیۆ خۆت لە بەکارهێنانی هەندێك زاراوە دوور بخەیتەوە.

زمانی پسپۆری

زۆر لەو ریکلامانەی لە بەشی هەواڵەوە بڵاودەکرێنەوە، کۆمەڵێك دەستەواژەی تایبەتیان تێدایە. ئەو دەستەواژانە تەنها لە لایەن لێپرسراوی چاپەمەنییەکانی رێکخراوە جیاجیاکانەوە بۆ پیشەو کاری تایبەتمەند بەکار دەهێنرێن. هەندێك جار ئەو کەسانە لە بیریان دەچێت هەموو خەڵك ناتوانن لە مانای ئەو دەستەواژەو زاراوانە تێبگەن. سەیر لەوەدایە هەندێك لە رۆژنامەنووسەکان بۆ جوانکردنی راپۆرتە لاوازەکانیان ئەو جۆرە زاراوانە دەکەن بە مۆدە. لە ئەنجامدا ئەو زاراوانە دێنە ناو زمانەوەو رۆژانە بەکار دەهێنرێن.

وەرگرتنی لێدوان: کاتێك بۆچوونەکانی کەسێك دەگوازیتەوە، دەبێت رستەکە بە ناوو پیشەی ئەوکەسە دەستپێبکەیت. ئەوکارە ئەوە دەردەخات کە قسەکانی تا چ رادەیەك گرنگیان پێدراوە. جگە لەوە خوێندنەوەی هەواڵەکە بۆ خوێنەر ئاسان دەکات.

نموونە:

- *سەرۆك وەزیران وتی لە بودجەی ساڵی ئایندەدا باج کەمناکرێتەوە.*

- *بە پێی قسەکانی بەرپرسێکی رێکخراوی گۆشت، هەفتەی ئاینلە نرخی گۆشتی مەڕ بەرز دەبێتەوە.*

هەرگیز نەنووسیت:

- *لە بودجەی ساڵی ئایندەدا باج کەمناکرێتەوە، سەرۆك وەزیران ئەوەی راگەیاند.*

- *هەفتەی ئایندە نرخی گۆشتی مەڕ بەرز دەبێتەوە، ئەوە قسەی بەرپرسێکی رێکخراوی گۆشتە.*

هێما تایبەتمەندەکان:

هەندێك وشە لە چەند پیتێکدا کورتدەکرێنەوە وەك ناوی رێکخراو یان

کۆمپانیاو هتد... ئەو هێمایانە گەر تایبەتبن بە رێکخراو یان گروپێکی ناسراو پێویست بە روونکردنەوە ناکات، بەڵام ئەوانەی زۆر ناسراونین پێویستە ناوەکانیان بەتەواوی بنوسرێتەوە.

**هەواڵەکان بە پێی گرنگییان:**

دیاریکردنی ئەوەی کام هەواڵ گرنگترە، کارێکی وا ئاسان نییە. ئەو هەواڵەی تۆ بە گرنگی دەزانی لەوانەیە بە لای خەڵکی دیکەوە هێندە گرنگ نەبێت. گرنگێتی بەرنامەکانی هەواڵ جیاوازە. هەواڵەکانی سەعات ۹ی بەیانی پاش یەك سەعات گرنگییان نامێنێت. لە بیرت نەچێت هەواڵەکان پەیوەندییان بە مرۆڤەکانەوە هەیە. بۆیە هەواڵی مەرگ، بێکاری، هاوکاری‌و رزگارکردن‌و خەڵات گرنگییەکی زۆریان هەیە.

هەواڵە نیشتمانییەکان لە پێشەوەی هەواڵە ناوچەیی‌و لۆکاڵیەکانەوەن. لە سەرەتای کارکردندا، با زۆریش شارەزاییت لە کارەکەتدا هەبێت، بەڵام کاتێك دێتە سەر دیاریکردنی ئەوەی کام هەواڵ دەبێت لە پێشەوە بێت، لە گەڵ دەوروبەرەکەت راوێژ بکە.

**کارکردن لە سەر مێزی هەواڵ:**

هەر لە سەرەتاوە دەبێت لە سەرچۆنێتی کارکردن لە سەر مێزی هەواڵەکان شارەزایی پەیدابکەیت. پێویستە فێری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر، ریکۆردەر، تەلەفۆن، CD، ئامێری سرینەوەی دەنگ ببیت. لە خۆتەوە دەستکارییان مەکە. چونکە ئەو ئەندازیارەی بە وردی‌و لە سەرخۆ دەرەجەکانی رێکخستووە کاتێك دەبینێت کارەکەی ئەوت تێکداوەتە سەر یەکدا تورە دەبێت .

نابێت جگە لە پەرداخێك ئاوو خواردنەوە (سارد بێت یان گەرم) ببرێتە ناو ستۆدیۆکەوە. پەرداخە ئاوەکەش لە سەرمێزی کارەکەت دابنێ. جگە

لەوە خۆت بە پشتدا مەخەو قاچیش مەخەرە سەر مێزەکە. لە زۆربەی ڕادیۆکاندا ئەو هەڵەیە بە هەڵەیەکی گەورە دادەنرێت و لێبوردنی تێدا نییەو تەنانەت لەوانەیە دەرکردنی لێبکەوێتەوە.

چۆنێتی دانیشتن:

پەڕەکانی هەواڵەکان لە سەر مێزەکەت ریزبکە بۆ ئەوەی کە مایکەکە کرایەوە دەستبکەیت بە خوێندنەوەیان. پێویستە لە کاتی خۆیدا لاپەڕەکە هەڵبگری. گۆشەی خوارەوەی لای راستی ئەو پەڕەیەی دەیخوێنیتەوە بنوشتێنەوە. بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لەوانەی نەخوێندراونەتەوە. پێشئەوەی دەست بە خوێندنەوە بکەی دڵنیابە لەوەی هەموو لاپەڕەکانت لایە.

بەرلە دەستپێکردن، دەنگی خۆت ساف بکە. تەنانەت ئەگەر خۆت هەواڵەکانت نووسیوەتەوە یەك دووجارێك بیانخوێنەوە. ئەو کارە جگە لەوەی یارمەتیت دەدات هەڵەکانی تێکستەکە بدۆزیتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی دەنگیشت سافبێت. هەروەها بۆ ئەوەی ئەو وشانەی لە یەك دەچن بەباشی جیایانبکەیتەوە (لە فەسڵی تایبەت بە هەواڵی تەلەفزیۆن ٢ بە درێژی باس لەو مەسەلەیە کراوە).

قەڵەمێکی ڕەساس و جافێك لە تەنیشتی خۆت دابنێ. چونکە هەندێجار پێشئەوەی بەرنامەکە لە ئاریاڵەکەوە پەخشبکرێت بە تەلەفۆن هەندێك زانیاری نوێ لە سەر هەواڵێك دەگات. بە شێوەیەکی باش دابنیشە، چونکە دەتوانیت بە باشی هەواڵەکان بخوێنیتەوە. ماسولکەکانت خاوبکەرەوەو هەناسەیەکی قووڵ هەڵبکێشە بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەدا تەنگە نەفەس نەبیت. قورگ و لوتت پاکبکەرەوە بۆ ئەوەی بۆری هەناسەت لە کاتی خوێندنەوەدا نەگیرێت.

شێوەی پێشکەشکردنی هەواڵەکان:

بێژەرە بە ئەزموونەکان بە شێوەیەك هەواڵەکان پێشکەشدەکەن کە زۆر ئاسان بێتە بەرچاو. دەبێت دەنگت بە شێوەیەك ڕێکبخەیت تۆنەکەی لە ئاستێکی دیاریکراودا بمێنێتەوە. هەورەها دەبێت ئاوازی دەنگت بە جۆرێك بێت کێشی هەبێتو هیلاکی پێوە دیارنەبێت. لەهەمانکاتدا نابێت بە شێوەیەك هەواڵەکان بخوێنیتەوە هەڵچونیان پێوە دیار بێت، چونکە ئەرکی تۆ نواندن نییە.

لە کاتی نووسینەوەی هەواڵەکاندا ئەو وشانەی کلیلی هەواڵەکەن بە گەورەیی یان بۆڵد بیياننووسە. بۆئەوەی لە کاتی خوێندنەوەدا جەختی زیاتریان لە سەر بکەیتەوە. جگە لەوە لە نێوان پەرەگرافەکانی هەواڵەکاندا فەزایەکی خاڵیی بەجێبهێڵەو لەنێوان دوو هەواڵدا هێڵێك بکێشە. ئەوە بزانە خوێندنەوەی  هەر سێ وشە، یەك چرکەی پێویستە. لێرەوە دەتوانیت ماوەی خوێندنەوەی هەواڵەکان بزانیت.

گوێ لە شێوازی خوێندنەوەی بێژەرێکی بە ئەزموونی رادیۆیەك بگرەو لە چۆنیەتی دەربڕینی وشەکان وردبەرەوە. پاش خوێندنەوەی هەر هەواڵێك تۆزێك راوەستە بۆ ئەوەی لەو هەواڵە جیابێتەوە کە لە پاش ئەوەوە  دێت. بێژەر دەبێت بە باوەڕکردن بەخۆوە دەست پێبکات. گەر وانەکات جیاکردنەوەی هەواڵێك لە هەواڵێکی تر بۆ بیسەران سەخت دەبێت. رستەی درێژ بەکار مەهێنەو لە جیاتی وشەی ئاڵۆز وشەی سادە بەکار بهێنە.

گەر ئاشنای دەربڕینی راستی زاراوەی بیانی نەبیت، لەوانەیە لەکاتی بەکارهێنانیدا تووشی کێشە بێیت. پێش هەر شتێك سەبارەت بە چۆنێتی دەربڕینیان داوای یارمەتی بکە. هەوڵی ئەوە مەدە زاراوە بیانییەکان وەك خەڵکی ئەو وڵاتە بڵێیتەوە. چونکە ئەو کارە نەك خێرایی خوێندنەوەکەت

کەمدەکاتـەوە، بـەڵکو گـەر نـەتوانیت هـەموو زاراوەکـان وەك خۆیـان بـەکار بهێنیت، دەبیتە مایەی گاڵتـەپێکردن. لـە باشـترین حاڵەتـدا پێتپێدەکـەنن و بەهای هەواڵەکەش دادەبەزێت. کاراکتەری بەجێبهێڵە بۆ ئەکتەرەکان.

دواجـار کاتێـك لـە سـتۆدیۆکەوە دەردەچـیت، هـەموو ئـەو نەخـشەیە جێبەجێبکە کە پێش هاتنە ژوورەوە بۆخۆتت دانابوو. بیرت نەچێ کاغـەز و کاسێتەکان کۆبکەرەوە.

ڕیپۆرتەری ئازاد:

ڕیپۆرتەرە ئازادەکان بە شێوەیەکی گشتی ئەزموونی کارکردنیان لە رادیـۆ هەیـەو جگـە لـە وەرگـرتنی شـارەزایی پێویـست، پەیوەنـدی باشـیان لـە گـەڵ خەڵکانێکی زۆردا هەیە.

ئەگەر دەتەوێت بە شێوەیەکی ئازاد کاربکەیت، پێش هـەر شـتێك دەبێت لە گەڵ ئامادەکاران و بەرپرسانی رادیۆکاندا پەیوەندی بکەیت و لێیانبپرسیت ئایا پێویستییان بە بابەتەکانی تۆ هەیە یان نا؟ گـەر وەڵامەکـەیان پـۆزەتیڤ بوو هەوڵبدە بزانی زیاتر حەزیان لـە چ جـۆرە بابەتێکە. لەوانەیـە هـەلێکت پێبدەن بۆ ئەوەی تواناکانی خۆت دەربخـەیت. لـە سـەرەتادا لەوانەیـە پـارەی پاداشـتەکەت کـەمبێت و بەشـی خەرجییـەکان و کـڕینی CD و کاسـێتەکان نـەکات، بگـرە لەوانەیـە هـیچ گرەنتییـەك نـەبێت بـۆ بڵاوکردنـەوەی بابەتـەکانت. باشـترین ڕێگـە بـۆ ئـەوەی لـە رادیۆیەکـە دابمـەزرێیت ئەوەیـە راپۆرتێك ئامادەبکەیت هیچکام لە ڕیپۆرتـەرەکانی رادیۆکە پێیان نـەکرابێت. کات و پارەی خۆت بە راپۆرتی شیکاری سێ خولەکی بە فیڕۆ مەدە. هەنـدێك رادیۆ بۆ وەرگرتنی هەواڵی دادگاکان سوود لـە ڕیپۆرتـەرە ئازادەکـان دەبیـنن. جگە لە دادگاکان ڕیپۆرتـەرەکان هەموو ڕووداو و هەواڵەکان وەردەگرن. بۆیـە ئەگەری بەدەستهێنانی ئەو هەواڵە نوێیانـەی پـەیامنێرو ڕیپۆرتـەرەکانی دی

دەستیان پێنەگەیشتبێت زۆر لاوازە.

ئەگەر پێتوایە سەرمایەگوزاریی لەم کارەدا قازانجی هەیە، پێویستە خۆت کەرەستەکانی تۆمارکردنی راپۆرت ئامادەبکەیت. دەکرێت ئەو مینی دیسکە نوێیانەت بە نرخێکی باش دەستبکەوێت، بەلام ئەو مایکانەی جۆرەکانیان زۆرباشە، نرخەکانیان گرانە، بەپێی کۆن و نوێیی نرخەکانیان دەگۆڕێت.

بۆ بەدەستهێنانی ریکۆردەرێکی بەکارهاتوو پارەیەکی زۆرت ناوێت، چونکە بە هاتنە مەیدانی مینی دیسك ئەو ئامێرە بەتەواوەتی بێکەڵك بووە. لە مەزادەکاندا ئەو ئامێرانەت دەستدەکەوێت. لەوانەشە ریکلامی فرۆشتنی ئەو جۆرە ئامێرانەت لە گۆڤارە تایبەتمەندەکاندا بەرچاو بکەوێت. لە بیرتنەچێت لەبەر ئەوەی مینی دیسکەکان نرخەکانیان گونجاوەو تۆمارکردنی دەنگیان زۆر باشە. ریکۆردەرە کۆنەکان چیتر بەهایان وەك جاران نەماوە.

پیویستە بەرنامەی دەنگ لە سەر کۆمپیوتەرەکەت داونلۆد بکەیت. کۆمپیوتەرەکان هەرزان نین. ئەگەر ریکۆردەری کۆنەت کڕی با خێرایی کاسێتەکانی ١٥ ئینج بێت لە چرکەیەکدا. ئەگەر بیرۆکەی نوێ و باشت هەبێت دۆزینەوەی کار وەك ریپۆرتەری ئازاد شتێکی گران نییە. ئەوەش بزانە بوونی کەرەستەو ئامێری باش بۆ خۆی جۆرێکە لە ئیمتیاز. باشترین کات بۆ ناودەرکردن قۆناغی خوێندکارییە، چونکە لەو قۆناغەدا دەتوانی بیسەلێنیت کارەکانت بە شێوەیەکی جیدی دەستپێکردووە.

# ١٥

# چاوپێکەوتن لە گەڵ ڕیپۆرتەرێکی ڕادیۆیی

کارولین هاجسون ریپۆرتـەرێکی رادیوێییـەو تەمـەنی ٢٤ ساڵانەو چەند ساڵێکە لە ئێزگەیەکی رادیۆیی سەربەخۆ لە "ویـست ساسکس" کار دەکات. خـاوەنی بڕوانامەیـە لـە بەشـی پـەیامنێریی بـە پلـەی نایـاب، بڕوانامـەی دووهەمیـشی پـسپۆرییە لـە بەشـی ریپۆرتـەری رادیـۆو تەلـەفزیۆن. هـەردوو بڕوانامەکەی لە پەیمانگای هونەری فالموت لە "کورنوال" وەرگرتووە.

★ چۆن ئەو کارەت لەم رادیۆیە دۆزییەوە؟

- کاتێك لە رادیـۆی "بریـستول" خـەریکی فێربـوون بـووم، بۆمدەرکـەوت لێـرە کـارێکی وا هەیـە. لـە راسـتیدا بـۆ ئـەم کـارە قـەرزاری IRN (تـۆڕی سـەربەخۆی رادیـۆ)م. پاشـئەوەی داوای کـارم کـرد لـە رێگـەی ئەوانـەوە ئاگادارکرامەوە رادیۆیەکی لۆکاڵی لـە ساسکس پێویـستییان بـە ریپۆرتـەرێك هەیـە. دواتـر وەك بـاوە داوای نموونـەی کاسـێتێك وCVم لێکـراو پاشـان چاوپێکەوتنم لە گەڵدا کرا.

★ لە رادیۆ چ کارێك دەکەیت؟

- هێـشتا کـارێکی دیـاریکراوم نییـە. بـۆ رایکردنـی کـارە ئیدارییـەکانم ئادرەسی ریپۆرتەری رادیۆ و تەلەفزیۆن بەکاردەهێنم. بەڵام پـاش نیـوەڕوان بە هەواڵەکاندا دەچمەوە. شیفتی کارەکەم لە ١١ی بەیانی دەستپێدەکات و ٧ی ئێوارە کۆتاییدێت. دوایین رۆژی هەفتە بە تەنها خۆمم. بۆیە دەبێت هەموو

کارەکـان خـۆم ئەنجامیانبـدەم. یـەك شـەموان تـەنها مـن‌و بێـژەرێك لـە ستۆدیۆکەدا دەمێنینەوە.

* ئایا لە یەکەم رۆژەی کارکردنتەوە ئامادەیی تەواوت تێدا هەبوو؟

- لە راستیدا تووشی دڵەراوکێ هاتم، چونکە لە ناکاو هاتمە ناو دونیایەکی پان‌و بەرینـەوە. لەوانەیـە ئـەو وتەیـە زۆر سـواو بێـت. بـەڵام کاتێـك ناچار دەبیت کارێك بە شێوەیەکی واقعی‌و بە پێی کات ئەنجامبـدەیت، زۆرجیـاوازە لەو سەردەمەی بۆ راهێنان‌و راهێنـانکردن دەیکـەیت. ئـەوە بیرۆکەیـەکی زۆر باش بوو، چونکە یارمەتیدام. بۆیە پێش دەستپێکردنی کارەکەم یەك هەفتە چـوومە خـولی فێربوونـەوە. بـەو حاڵەشـەوە یەکـەم رۆژی کارەکـە بـاوەڕم نـەدەکرد، ترسـابووم، چـونکە کـارێکی زۆرم لەبەردەسـتدا بـوو دەبـوو لێیـان تێبگەم‌و بەسەریاندا زاڵبم.

* ئایـا کـارە پراکتیکییـەکانی سـەردەمی خوێنـدن سـوودبەخش بـوون بۆتان؟

- لـەرووی ئامـادەیی پراکتیکییـەوە هەسـتمدەکرد لـە باشـترین دۆخـدام. بـەڵام ئاشـکرابوو ئـەزموونم نییـە. پێموایـە خـاڵی لاوازی مـن نـەبوونی ئەزموون بوو.

* باسی ئەرکە رۆژانەکانی خۆتمان بۆ بکە.

- جیـاوازە، ئەگـەر لێمبپرسـی سـەعات ٢,١٢ چیدەکەیت دەتـوانم پێتبڵێم لـەو سـاتەدا سـەرقاڵی چیم. ئەرکـە رۆژانـەکانی مـن لـە رووی ناوەرۆکـەوە جیاوازن. بەڵام جۆری کارەکەم یەکێکە. ئێستا بە چـاوی داخـراوەوە دەتـوانم هەموو کارەکانم جێبەجێبکەم. کاتێـك بـۆ ئامـادەکردنی هەواڵـەکانی نیـوەڕۆ دەچمە رادیۆوە یارمەتیاندەدەم . زۆرجار هەواڵەکانی ئەو کاتانە لە ئەستۆی منـــدا نییـــەو هەنـــدێك جـــاریش لـــە ئەســـتۆمدایە. چـــاوپێکەوتنەکان

ئەنجامدەدەم. تۆماریان دەکەمو پێشەکی هەواڵەکانیش دەنووسم. بۆ ئەوەی دڵنیا بین هەموو هەواڵەکانمان لایە. هەندێك کاری سادەی وەك تەلەفۆنکردن بۆ پۆلیسو ئاگرکوژاندنەوەو خەستەخانەکان لە ئەستۆ دەگرم. سەعات ١:٣٠ کاتێك بەڕێوەبەر دەچێتەوە بۆ ماڵەوە من کارەکانی ئەو ئەنجام دەدەم. من دەبمە بەرپرسی هەموو کاروبارەکان، هەواڵەکانی پاشنیوەڕۆ بە پێی بۆچوونی خۆم دیاریدەکەم. زۆربەی کاتەکانم بۆ دووبارە نووسینەوەی تێکستەکانو ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکانی ئەو ڕۆژەو یان ڕۆژەکانی دوایىو تۆمارکردن تەرخاندەکەم. لە سەعات ٤ی پاش نیوەڕۆوە ئێرە زۆر قەرەباڵغ دەبێت. هەموو سەر سەعاتێك هەواڵمان هەیەو سەردێڕی هەواڵەکانیش هەر نیو سەعات جارێك دووبارە دەبنەوە. سەعات ٦ بەرنامەیەکی هەواڵمان بۆ ماوەی ١٥ خولەك هەیە.

* ئەو کەرەستانەی بەکاریان دەهێنیت چین؟

- خۆشبەختانە چیتر ریکۆردەرە کۆنەکان بەکار ناهێنرێنو لە ناوچوون. ئەو ئامێرانە بۆ ئێستا سەرەتایی و بێکەڵکن. بۆ تۆمارکردنی چاوپێکەوتنەکان مینی دیسك بەکاردەهێنم. ڕادیۆکە دوو دانەی هەیەو هەر ریپۆرتەرێکیش دانەیەکی هەیە. ئەم مینی دیسکانە زۆر بە سوودن. جگە لەوەی بچووکن، جۆرەکەشیان زۆر باشە. ریکۆردەرێکی کۆنیشمان هەیە بۆ کاتی ناچاریی. ئەو کاتەی مینی دیسك بەکار دەهێنیت بۆت دەردەکەوێت چ ئامێرێکی مەزنە.

* بۆ تۆمارکردن چی ئامێرێك بەکاردەهێنیت؟

- جۆرە سیستەمێکی تۆمارکردنی دیجیتاڵیمان هەیە بە ناوی Audio Vault زۆرباشە. تەنها ڕادیۆکەی ئێمەو BBC ئەم سیستەمە بەکار دەهێنن. ئەوانی دی سیستەمە کۆنەکە بەکاردەهێنن. کاتێك فێری

بەکارهێنانی ئەم سیستەمە دەبێت بۆت دەردەکەوێت کارکردن پێی زۆر ئاسانە.

* ئایا تا ئێستا روویداوە لە ئەرکێکی سەرشانتدا بیرت چووبێت پاتری ریکۆردەرەکەت بگۆریت؟

- پاترییەکان هەردەم شەحن و ئامادەن و پێش دەرچوون تەماشای CDکان دەکەم. بەڵام جارێک چووم بۆ چاوپێکەوتن لە گەڵ پەرلەمانتارێك. رووداوێکی ناخۆش روویدا. راستە ئەوانیش مرۆڤن و جیاوازییان نییە، بەڵام لە بەرئەوەی خەڵکانێکی گرنگن کاتیان زۆرکەمە. کاتێك ویستم پرسیارەکانم دەستپێبکەم بینیم هیچ دەنگێك لە سەر مینی دیسکەکە تۆمار نابێت. هەرچەندە هیچ کەم و کورییەکی تێدا نەبوو. دواجار قەناعەتمپێکرد لە سەر رێگەی پەرلەمان سەرێك لە ستۆدیۆی هەواڵەکان بدات بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنەکە دووبارە ئەنجامبدەین. کێشەکەش لەودا بوو سەری مایکەکە درزێکی بچووکی تێکەوتبوو. لە بەر ئەوەی ئەم ئامێرانە زۆر هەستیارن، دەنگەکەی تۆمار نەدەکرد.

* ئایا هیچ کاتێك لە بەرنامە راستەوخۆکاندا هەڵەت کردووە؟

- سەرەتای کارکردنم بوو، رێك لەوکاتەدا بوو لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ بیل کلنتۆنی سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکادا دەکرد. هاوکات لە گەڵ ئەوەدا هەر لەو هەفتەیەدا IRN بەبەردەوامی راپۆرتی لە سەر شازادە دایانا پەخشدەکرد. چونکە لە یەکەم ساڵرۆژی مەرگی نزیك دەبووینەوە. هەموو کاتەکانی رۆژانەم تەرخانکردبوو بۆ کۆکردنەوەی بابەت لە سەر شازادە دایانا. پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژەش ماجەراکەی بیل کلنتۆن لە ئەمریکا دەستیپێکرد و منیش بە بەردەوامی هەوڵمدەدا دوایین هەواڵەکانم دەستبکەوێت. یەکەمین کاری درێژخایەنی من کە ریپۆتاژێکی شیکاریی بوو

لە سەعات ٦ دەستی پێکرد. مایکەکەم کردەوەو وتم" من کارولین هاجسونم. .شازادە کلنتۆن" لەو ساتەدا تەنها کارێك کە پێمکرا ئەوە بوو درێژە بە خوێندنەوەی راپۆرتەکەم بدەم. نە دەمتوانی پێبکەنم‌و نە پێشمدەکرا هەڵەکەم راستبکەمەوە. کاتێك ئادریالین لە لەشدا زیاد دەکات چیتر پێکەنینت نایەت. تەنانەت سەرەکێژەت بۆ درووست دەبێت. لەوانەیە وشەیەك بپەڕێنیت، بەلام سەرەڕای ئەوەش بەردەوام دەبیت.

* ئایا کاتێك دەچیتە دەرەوەی ستۆدیۆ جلی تایبەت لەبەردەکەیت. بۆ مەسەلەی جل‌و بەرگ هیچ ڕێوشوێنێکی تایبەت دەگریتەبەر؟

- من حەزم لە لەبەرکردنی جلی پاك‌وخاوێنە. لە ڕێنماییەکانی رادیۆکەشماندا هاتووە لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانمان لە دەرەوەی ستۆدیۆ گرنگی بە جل‌و بەرگەکانمان بدەین. چونکە خەڵك حەزیان لە چاوپێکەوتن نییە لە گەڵ ئەو پەیامنێرانەی سەروسیمایان تێکچووە. نابێت قات‌و پانتۆڵ لەبەربکەیت. بۆ پیاوان پانتۆڵ‌و کراس‌و بۆ ژنانیش تەنورەو بلوز گونجاوە. جلی باوی ئەم سەردەمە هەر ئەوانەیە. رادیۆکەشمان کراسێکی یەخە ئاسکی‌و بلوزێکی قۆڵ درێژمان پێدەدات کە ئارمی رادیۆکەی لە سەرە. پاڵتۆیەکی گەورەشمان بە هەمان ئارەمەوە هەیە بۆ رۆژانی باوبۆران بەکەڵکدێت.

* بڕیارەکانی رادیۆ چۆنن؟ بۆ نموونە ئایا یاسای سەخت بۆ ستۆدیۆ دانراوە؟

- یاساو ڕێنماییەکان بە پێی بەشەکان دەگۆڕێن. من لە کارەکەمدا ئەو ڕێنمایانەی تایبەتن بە هەواڵەکان پەیرەو دەکەم. بۆ نموونە هەموو هەواڵەکان پاشئەوەی سێجار دەخوێندرێنەوە دەبێت دووبارە بنوسرێنەوە بۆ ئەوەی وا نەیەنە پێش چاو دوو بارە کراونەتەوە. هەندێك وشە هەن

بەکاریان ناهێنین، چونکە بە لای بیسەرانەوە ماناکانیان جیاوازە. هەندێك یاسای توندو تۆڵ هەن دەبێت جێبەجێیانبکەین. بۆ نموونە سەبارەت بە یاساییەکان هەندێك مەسەلە هەن پێویستە رەچاوی بکەین بۆ ئەوەی ریپۆرتەرەکە بە تۆمەتی سووکایەتی کردن بە دادگا، دادگایی نەکرێت.

★ راستەوخۆ کێ بەرپرسی تۆیە؟

و. بەرێوەبەر سەرۆکی منە.

★ چۆن ئاگاداری ئەرکەکانی سەرشانت دەبیتەوە؟

- لە دەفتەرێکدا ئەرکەکانی کارمەندەکان تۆمار دەکرێت. بەشێکی زۆری کارەکان پێشتر دادەرێژرێن. من هەواڵەکانی رۆژی دواتر دەنووسمەوە، بۆیە کاتێك گوێ لە هەواڵەکانی بەیانی دەگرم تێدەگەم هەواڵەکان چین. ئەگەر رووداوێکی نوێ رووی دابێت دەزانم دەبێت برۆمە دەرەوە و راپۆتێك ئامادەبکەم دەبێت بە سەر دۆخەکەدا زاڵبم.

★ ئایا دەفتەری تۆمارکردنی تەلەفۆن و ئادرەست هەیە؟

- بەڵێ دانەیەکم هەیە، ناوو ئادرەسی هەموو ئەوانەم تۆمار کردووە کە پەیوەندیم لە گەڵیاندا هەیە، یان بە جۆرێك لە جۆرەکان لە گەڵ کارەکەمدا پەیوەستن. ناتوانم بڵێم ئەو کارە چەند گرنگە. ئەگەر رۆژێك قەسابی گوندێك باسی قەیرانی گۆشتی کرد دەبێت ناوو ناونیشانەکەی لە دەفتەرەکەتدا بنووسیت. چونکە کێ دەڵێت جارێکی دی کارت پێی نابێت.

★ لە قۆناغی خوێندندا فێری نووسینەوەی هەواڵ کرایت؟

- لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی لێرەم شارەزایم لە نووسینەوەی هەواڵدا زۆر زیاتر بووە لە جاران. لە کاتی کارکردندا شتی زۆر فێردەبیت. جگە لەمە ئەوەی بە هەواڵەکاندا دەچێتەوە مامۆستایەکی زۆرباشەو بەسەر دارشتنی هەواڵدا زاڵە.

★ ئایا بۆ تایپکردنی تێکستەکان سوود لە کۆمپیوتەری ئاسایی وەردەگریت؟

- ئێستا بۆ تایپکردنی تێکستەکان سوود لە بەرنامەی Word وەردەگرم. بەڵام وا بڕیارە بەمزووانە بەرنامەی Robert بەکار بهێنم، ئەم بەرنامەیە هەم دەقەکەی تۆو هەم دەقی ئاژانسەکانیش سەیڤدەکات. جگە لەوە کارکردن بەو بەرنامەیە ئاسانترە، چونکە ماوەی هەواڵەکەت بۆ دەستنیشاندەکات.

★ ئایا دەتوانیت بێئەوەی سەیری کیبۆردەکە بکەیت تایپبکەیت؟

- نەخێر، بەڵام بەخێراییەکی باش تایپدەکەم.

★ ئایا خێرا دەنووسیت؟

- بەڵی بەڵام بە گوێرەی پێویست نییە. ڕاستییەکەی من ڕاپۆرتی دادگاکان ئامادە ناکەم. ئەو کارە بە شێوەیەکی گشتیی لە لایەن پەیامنێرە ئازادەکانەوە ئەنجامدەدرێت. من بابەتی هەواڵی ئاژانسەکان دەستنیشان دەکەم بۆ ئەوەی هەواڵەکان ڕێکبخەم.

★ بۆ ڕاپۆرتی دادگا ئامادەناکەیت؟

- ڕادیۆکەمان زۆر بچووکە لە ڕووی کاتو خەرجییەوە بۆی ناکرێت پەیامنێرێکی تایبەت بۆ هەواڵەکانی دادگا دابمەزرێنێت. بۆیە پەیامنێرە ئازادەکان هەواڵەکانیان دەهێننو ئەگەر بەدڵمان بوو قەبوڵی دەکەین. هەندێك جار لەوانەیە لە پێنج دێڕ تێپەر نەکات. ئەوانە هەم بۆ چاپەمەنییەکانو هەم بۆ کەناڵەکانی تەلەفزیۆنیش هەواڵ دەنێرن. هەندێك ئاژانسیش هەن بە شێوەیەکی تایبەت هەواڵەکانی دادگا بڵاودەکەنەوە.

★ ئایا تاکو ئێستا چاوپێکەوتنت لە گەڵ خەڵك، یان ڕاپۆرتی شیکاری سێ

خولەکیت ئامادەکردووە؟

- لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی خەڵك بێزارم. پێموایە ئەوە خراپترین کارە لە دونیادا. راپۆرتی زۆرم ئامادە کردووە، ئێمە بەرنامەیەکی ١٥ خولەکی هەواڵمان هەیەو رۆژانە سێجار پەخش دەبێت. راپۆرتەکانمان نزیکەی ١،٥خولەکێك‌و هەندێك جار زیاترن.

★ ئایا کارەکەی تۆ تەنها وەرگرتنی هەواڵە پەیوەندیدارەکانە بە وست ساکسەوە؟

- جارێکیان بۆ کارێکی سێ رۆژە رەوانەی ئیرلەندای باکوور کرام، تاکو راپۆرتێك لەسەر هەڵوەشاندەوەی یەکەیەکی پۆلیسی پادشایی ئامادەبکەم. ئەزموونێکی زۆر خۆش بوو، رۆیشتن بۆ شوێنێکی نوێ‌و کۆکردنەوەی زانیاری‌و بەکارهێنانی بە جوانترین شێوە تایبەتمەندییەکی خۆشی هەبوو. جەژنی (پاك) بوو هەلێکی بێ وێنە بوو بۆ من. لەو شارە سەرچاوەی دەوڵەمەندمان بۆ هەواڵ هەیە. وەکو ڤیستیفاڵی خێرایی لە Good woodوکێبڕکێی لێخوڕینی سەیارە کە ساڵانە دووجار ئەنجامدەدرێت. کەسایەتی زۆرت لە بەردەستایە بۆ ئەوەی بابەتیان لەسەر ئامادەبکەیت. ئەو رووداوانە هەمووی لە دەوروبەری ئێمە روودەدەن‌و لەو رووەوە شانسمان هەیە.

★ پێشکەوتنتان وەك رۆژنامەنووسێکی پسپۆر چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

- بەرنامەم هەیە بۆ زەماوەند مۆڵەت وەربگرم، ئەگەر بڕیار وا بێت زەماوەند نەکەم، ئەو کات دەچم بۆ رادیۆیەکی گەورەتر بۆ ئەوەی وەك پەیامنێر کاربکەم. من رادیۆم خۆش دەوێت، بەلام بە نیسبەت تێکڕای پیشەکەوە سەرەڕای ئەو عەشقەی بۆ ئەم کارەم هەیە، کەمێك دڵساردم. هەندێجار حەزدەکەیت مووەکانت لە بنەوە هەڵبکێشیت یان لە ناخەوە

دەستبکەیت بە گریان. لە هەفتەیەکدا شەش ڕۆژ کاردەکەیت کەچی داهاتەکەی زۆر کەمە. بۆ تیپەڕکردنی کارناسیو کارناسی پسپۆر زۆر ماندووبووم، تەنانەت قەرزێکی دە هەزار پاوەندیم کرد بۆ ئەوەی مانگانەی زانکۆکەمی پێبدەم دواتر کارێکم دەستکەوت کە ساڵی ١٥ هەزار پاوەندم پێدەدرێت. ئەوەش مایەی خەمە، بەڵێ، هەڵبەت BBC پارەیەکی زیاتر دەدات. بەڵام شوێنی کارکردن لەوێ زۆر جیاوازە.

★ لە هەفتەیەکدا چەند سەعات کار دەکەیت ٥٠ یان ٦٠ ؟

- هەندێجار زیاتریش، من لە ١١ی بەیانی تا ٧ی ئێوارە کاردەکەم. بەڵام هیچ کاتێك ڕووینەداوە لە سەعات ٧ لە ڕادیۆ دەربچم. هەندێك ڕۆژ زووتر دێمو درەنگتر دەردەچم. لە مانگێکدا ڕۆژێکی یەکشەموانیش کار دەکەم. دووشمە لە سەعات ٥ ی بەیانی دەستم بەکارکردو دوو هەفتە بە بێپشوو کارمکرد. واتە ١١ ڕۆژکارکردن بەرامبەر بە ٣٨ پاوەند بۆ هەر شیفتێك، ئەوە کەی ڕەوایە؟

★ چەند ڕۆژ پشووتان هەیە؟

- لە ساڵێکدا ٢٠ ڕۆژ.

★ ڕێژەی ئەو کارانەی کە لە ژووری هەواڵەوە بە تەلەفۆن ئەنجامیدەدەیت چەندە؟

- تەلەفۆنکردن بەشێکە لە کارەکانمان، تەلەفۆن بۆ خەڵکی جیاجیا دەکەم بۆئەوەی پرسیاریان لێبکەم، یان کاتێك بۆ چاوپێکەوتن دیاریبکەین. هەندێك لە تەلەفۆنەکانیشمان بۆ پاسەوانی کەنارەکانی دەریاو ئاگرکوژێنەوەو خەستەخانەکانە. ئەوەش بەشێکە لە کارەکانمان. ئێستا ئینتەرنێتمان هەیەو دەتوانم لە ڕێگەیەوە هەندێك کار جێبەجێبکەم. بۆ نموونە دەتوانم ئاگادارییەکانی حکومەتم دەستبکەوێت.

★ ئایا ئەندامی سەندیکایت؟

- نەخێر ئەندام نیم، چونکە توانای ئەوەم نییە ئابونەی ئەندامێتیی بدەم. ئەوەش مایەی خەمبارییە. ئابوونەی مانگانە دەکاتە١٠ پاوند، من ناتوانم ئەو پارەیە بدەم.

# ١٦

# ریـپۆرتەری دادگا

لەم فەسڵەدا بەکورتی باس لـە ڕاپـۆرتی شـیکاری وداواکـانی نـاو دادگاکـان دەکەین. بەڵام مەبەستمان ئەوە نییە ڕوونکردنەوەیەکی تەواو کامڵ لە سەر ریپۆرتـــەری دادگاکـــان بخەینـــەڕوو. ئـــەو پەیامنێرانـــەی مەبەســـتیانە بەدواداچـوون بـۆ داواکـانی دادگـا بکـەن، پێویـستە لـە تاقیکردنەوەیـەکی تایبەتدا بەشداریبکەن. لـە بریتانیـا ئـەو تاقیکردنەوەیە پاش تـەواوکردنی خـولێکی فێربـوون دەکرێـتو لـە ژێـر چـاودێری ئەنجومـەنی پـەروەردەی پـەیامنێرانی کەناڵـە بیـسراوو بینـراوەکـان، یـان ئەنجومـەنی نیـشتیمانی فێرکردنی پەیامنێراندا ئەنجامدەدرێت.

پەیامنێر و یاسا:

پێویـستناکات پـەیامنێرێك هێنـدەی پـارێزەر یـان یاساناسـێك هـەموو وردەکارییـەکانی یاسـاو سـزاکانی شـارەزابێت، بـەڵام دەبێـت ئـەو یاسـایانە بزانێت کەوا پەیوەنـدیان بـە پیشەکەی ئـەوەوە هەیـە. بـۆ نموونـە دەکرێـت ڕاپۆرت لە سەر چی بکرێتو لە سەر چی نەکرێت؟

لـە بریتانیـا پـەیامنێران وەك هـەر هاوڵاتییـەکی دی ئـەو مافـەیان هەیـە بـچنە هـەموو دادگاکانـەوەو قۆناغـەکانی دادگـایکردن ببیـنن. ئامـادەبوونی پەیامنێرو خەڵکی ئاسایی بۆ ئەوەیە دڵنیابن لەوەی دادوەریی بە شێوەیەکی بـاش پـەیڕەودەکرێت. لـەم سـەردەمەدا هەنـدێجار ڕێگـە لـە هاتنـە ژوورەوە

دەگیرێــت، ئــەویش لــە حاڵــەتی دادگــایکردنی نەوجــەوانانو مەســەلە پەیوەندیدارەکان بە کاروباری ناوخۆی وڵاتەوە.

پەیامنێر لە دادگاکاندا لە چاو خەڵکی ئاساییەوە دوو ئیمتیازیـان هەیـە، یەکـەمیان ئەوەیـە ڕێگـەی پێـدەدرێت هـەموو ئـەو تۆمەتانـەی باسـدەکرێن لەگـەڵ ئـەو بڕیارانـەی دادگـا دەریـدەکات بکاتـە ڕاپـۆرت بێنـەوەی تۆمـەتی پێـشێلکردنی یاسـای بدرێتـە پـاڵ. ئـەم ئیمتیـازە سـەبارەت بـەو تۆمـەتو بۆچوونانەی لە دەرەوەی هۆڵی دادگا باس دەکـرێن بـە سـوود نییـە. بـە پێـی ئەو یاساو ڕێسایانە. دەبێـت پـەیامنێر ڕاپۆرتەکـەی بـە شـێوەیەکی وردو بـێ هـیچ زیادکردنێـکو لـە ماوەیـەکی کورتـدا واتـە لـە یەکـەمین ژمـارەی دوای دادگایەکە، بڵاوبکاتەوە و هیچ بیانوویەك بۆ دواخستنی نەهێنرێتەوە.

ئیمتیازی دووەم ئەوەیە دادگا لە گۆشەیەکی هۆڵەکەدا شوێنێکی تایبـەت بۆ پەیامنێران دیاریدەکات. هەندێك پەیامنێر نەك ئەمە بە ئیمتیاز نازانن، بەڵکو پێیانوایـە ئـەوە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی نـەتوانن وردەکارییـەکانی دادگا ببینـنو ببیستن بە تایبەتی لە هۆڵە کۆنەکانی دادگاکاندا. هیچ پـەیامنێرێك کە هێشتا لە سەرەتای کارکردنیدابێت بە تەنها نانێردرێت بۆ کۆکردنـەوەی هەواڵی دادگاکان. تەنانەت ئەگەر ئەو پەیامنێرە لـە قۆنـاغی خوێندکاریـشدا ئەو کارەی ئەنجامدابێت. ئەوە ئەو پەڕی گوێنەدانە، گەر بەڕێوەبەر شـتێکی وا بکـات. ئـەو کـارە مەترسـییەکی زۆری بەدواوەیـە. هـیچ ڕۆژنامەیـەك نایەوێت بە تۆمەتی پێشێلکردن یان سووکایەتیکردن بـە دادگـا سـزا بـدرێت. کۆکرنەوەی هەواڵەکانی دادگا بـە هاوکـاری کەسـێکی شـارەزا کۆمـەڵێك خـاڵی پــۆزەتیڤی تێدایــە. ئــەو کاتــەی لەگــەڵ پــەیامنێرێك کاردەکــەیت بــۆت دەردەکەوێت ڕۆژنامەکان چۆن ئاگـاداری ڕووداوەکـانی دادگـایکردنی داهـاتوو دەبن.

هەندێجار کاتی دانیشتنی دادگاییەکان لە بۆردی ئاگادارییەکانی دادگادا هەڵدەواسرێت. لە بریتانیا سەرەڕای ئەو ڕێنماییانەی لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە بڵاو دەکرێنەوەو تێیاندا باس لەوە کراوە دەبێت دانیشتنی دادگاییەکان بخرێنە بەردەست ڕاگەیاندنەکان. بەڵام هەمووجارێك کاری پێناکرێت. هەندێك لەو ڕۆژنامانەی کەوا هەواڵی ڕووداوەکانی تاوان و دۆسیەی دەستگیرکردنی تۆمەتباران ئامادە دەکەن، مەزەندەی نزیکبوونەوەی دانیشتنی دادگاییەکان دەکەن. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت بوونی پەیوەندی لە گەڵ پۆلیسی ناوچەکە زۆر گرنگە. چونکە پۆلیس دەتوانێت ڕۆژنامەکان لە ڕۆژی دەسپێکردنی دادگاییەکان ئاگاداربکاتەوە. لە ڕاستیدا ئاگادارکردنەوەی ڕۆژنامەکان لە بەرژەوەندی پۆلیسدایە، چونکە کاتێك ڕۆژنامەکان بەدواداچوون لە سەر ئەو کێشانە دەکەن یارمەتی لێکۆڵینەوەکانی ئەوان دەدەن.

سەبارەت بە دۆسیەی تاوانەکان لیستێکی تێدایە وردەکارییەکانی پەیوەندیدار لە گەڵ تۆمەتبارو ئەو تۆمەتانەی بە پێی یاسا دراونەتەپاڵی دەخاتەڕوو. هەروەها ناوی ئەو ئەفسەرەی تۆمەتبارەکەی دەستگیرکردووە نووسراوە. لەم حاڵەتانەدا تەنها ناوی ئەفسەرەکە دەنووسرێت یا تیمێکی پۆلیسیش بەشداری گرتنەکەیان کردبێت.

لە ناو دادگاکەشدا دەبێت پەیامنێر وەك خەڵکانی دیو بە پێی یاسا هەڵسوکەوت بکات، پێویستە بە درێژایی دادگاکە بێدەنگبێتو لە جێگەکەی خۆی هەڵنەسێت. ئەو کاتەی دادگاکە فەرمییە، پەیامنێر هیچ ئیمتیازێکی تایبەتی نییە. بەڵام پاش کۆتایی هاتنی دادگاکە دەتوانێت پرسیار لە سکرتێری دادوەرو پارێزەری کێشەکەو ئەو ئەفسەرانەی پۆلیس کە لە دادگاکەدان، بکات. پاشئەوەی ماوەیەك لەم کارەتدا ئەزموونت پەیدا کرد.

سکرتێری دادگا لە گەڵتدا ئاشنا دەبێتو لە کاتی پێویستدا یارمەتیت دەدات.

شێوەی ئامادەکردنی راپۆرت بۆ دادگا هەمان شێوەی ئامادەکردنی راپۆرتە لە سەر هەواڵو رووداوەکانی دی. واتە دەبێت زانیاری ورد لە سەر بابەتەکە کۆبکەیتەوە. مەسەلەی کۆکردنەوەی زانیاری راستو درووست گرنگییەکی زۆری هەیە. دەبێت ناوەکان، ئادرەسەکانو هەموو وردەکارییەکانی دی وەك خۆیانو بە تەواوی بنووسرێنەوە. نابێت تەنها بنوسرێت تاوانبار " جون سمت" لە شەقامی "سمت" ولە شاری "سمت" دەژی. چونکە لەوانەیە زیاتر لە یەك کەس بە هەمان ناوو لە هەمان شەقامو لە هەمان شاردا بژین. بۆیە دەبێت ناوی تاوانبارو ئادرسەکەی بە وردیو بە ئیملای راستو درووست بنووسرێت. تایبەتمەندیی کەسەکان دووجار لە دەفتەرەکەت بنووسەرەوە. بۆئەوەی لە نووسینەوەی بە شێوەیەکی راست دڵنیابیت. دەشتوانیت بۆ دڵنیابوون لە زانیارییەکانت داوای یارمەتی لە سکرتێری دادگا بکەیت.

لە بریتانیا رێگە بە بەکارهێنانی ریکۆردەرو مینی دیسك لە دادگا نادرێتو نابێت پەیامنێران هەوڵی ئەوە بدەن بە نهێنی ئەو کارە بکەن. لە کاتی نووسینەوەی یاداشتەکاندا مێژووەکەی بنووسەو مانشێتێکی بۆ دابنێ. هەموو یاداشتەکانی ناو دادگا بۆ ماوەی شەش مانگ لای خۆت هەڵبگرە بۆ ئەوەی گەر سکاڵا لە دژی خۆت یان بڵاوکراوەکەت، تۆمارکرا یان کێشەی دی سەریهەڵدا بگەڕێیتەوە سەری.

لە بەرئەوەی تەنها نوسخەی ئەسڵی یاداشتەکانت موعتەبەرە، بۆیە نووسینەوەیان لە کۆمپیوتەر یان تۆمارکردنی لە سەر کاسێت بەو مانایەیە چیتر بۆ بەڵگەی دادگا ناشێت.

# ١٧

# ریپۆرتەری ئینتەرنێت

لەبەر ئەوەی هێشتا ئینتەرنێت لە سەرەتای ڕێگەکەیدایەو لاپەڕە (یەك)ی مێژووەکەی دەنووسرێتەوە. بۆیە هەوڵدان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەرکەکانی پەیامنێرێکی ئینتەرنێتی لەم ساتەوەختەدا کارێکی دژوارە. لەو کاتەوەی لە دەیەی ١٩٩٠دا سایتە ئینتەرنێتییەکان دەستیان بە کارکردن کردووە، کەناڵە بینراوو بیستراوو نووسراوەکان بە شێوەیەکی بەرچاو لە بەرامبەر توانای پەخشکردنی ڕاپۆرتی ئینتەرنێتی بەخۆیاندا چوونەتەوە. ئەو ڕۆژنامانەی پێیانوابوو تەنها ئەوە بەسە لاپەڕەکانی خۆیان بگوازنەوە بۆ سایتەکانی ئینتەرنێت، وردەوردە بۆیان دەرکەوت دەبێت بەو بۆچوونەی خۆیاندا بچنەوە.

وەك چۆن تەلەفزیۆن بە نسبەت ڕادیۆوەو ڕادیۆ بەنسبەت چاپەمەنییەکانەوە، خاوەنی ناسنامەو شێوەی کارکردنی جیان، پێویستە ئینتەرنێتیش وەك کەناڵێکی سەربەخۆو تایبەت بناسرێت. لەوانەیە ئینتەرنێت تەواوکەری کەناڵەکانی دی بێت. بەڵام لە ژێر ڕکێفی هیچ کامیاندا نییە. بۆیە ناکرێت بە ڕۆژنامەیەکی ئەلکترۆنی یان مۆنیتەرێکی تەلەفزیۆنی لە قەڵەمبدەین.

ئیشکالییەتی ئاشکرا ئەوەیە کەناڵەکان حاڵەتی بەرگرییان وەلاناوەو ئەم کەناڵەیان خستووەتە خزمەت ئامانجەکانی خۆیانەوە. بۆ نموونە چاپەمەنییەکانی بریتانیا بە باوەشی کراوەوە پێشوازیان لەم تەکنەلۆژیا

نوێیه کردو هەواڵەکانی خۆیان تێدا پەخشکرد. ئەو هەواڵانەی کە تەنها چەند هەزار کەسێك دەیانبینی. ئێستا لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە سەر ئاستی نێونەتەوەیی تەماشا دەکرێن. بۆ نموونە ئەندازیارێکی میکانیك لە ناوچەیەکی دوورەدەست دەتوانێت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە ئاگای لە نوێترین شێوازی تەعمیرکردنی ئالییاتەکان بێت.

هەڵبەت دەبێت ئەوەش بزانین تۆڕی ئینتەرنێت لە سەر ئاستی ناوچەییش دەتوانێت بە هەمان ڕادە گرنگو بەسوود بێت. هیچ هۆکارێك نییە ڕێگربێت لەوەی گوندێك بتوانێت هەواڵی لۆکاڵیی‌و ئاگادارییەکانی تایبەت بە مەراسیمەکانی خۆی، لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو بکاتەوە.

سەیر لەوەدایە بە هۆی ئاسانکارییەکان تەنانەت پەیامنێرێکیش دەتوانێت سایتی خۆی هەبێت. ئینتەرنێت دەتوانێت یارمەتی ڕیپۆرتەرەکان بدات بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو کەسانە بڵاوبکەنەوە کە پێشتر دەیانتوانی لە ڕێگەی نفوزی سیاسی‌و دەسەڵاتی داراییەوە ڕێگربن لە بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانیان.

ئینتەرنێت کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان لەسەر ئاستی نیشتمانی‌و جیهانی دەخاتە ژێرکاریگەری خۆیەوە. تەنانەت لە هەڵبژاردنی ئەو هەواڵانەی بەلایانەوە گرنگن یارمەتی پەیاموەرگرەکان دەدات. بە پێچەوانەی هەواڵەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن کە بیسەرو بینەر ڕۆڵیان تیدا نییە. پەیاموەرگری ئینتەرنێت دەتوانێت لە ڕێگەی (گەڕان/ سێرچ)ەوە ئەو هەواڵانە بدۆزێتەوە کە بە دڵێتی. لەوانەیە لە سەرەتادا بەو مانایە بێت پەیاموەرگر خۆی لە هەواڵەکانی شەڕو شۆڕو وشکە ساڵی‌و کارەساتەکان بەدووربگرێت‌و لە جیاتی ئەوانە بەدوای هەواڵی وەرزش و کێبڕکێکان‌و بەرنامە هونەری‌و سەرگەرمییەکان‌و ئەو ڕاپۆرتانەی باس لە شێوە جیاجیاکانی ژیان دەکەن، بگەڕێت.

Jim Hall لە کتێبی "رەخنەیەك لە سەر پەیامنێریی ئینتەرنێتی" دەنووسێت: کۆمپانیاکانی وەك "ئەمەریکان ئۆنلاین" لەو باوەڕەدان کارەکانیان لە جیاتی ئامادەکردنی هەواڵ، زیاتر بووەتە کۆکردنەوەی هەواڵ لەو سەرچاوانەی کە هەن. بۆیە چیتر پێویست بە پەیامنێر ناکات. Jim Hall هەروەها دەڵێت ساڵی ١٩٩٧ پاش مەرگی شازادە دایانا داواکاری بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت بۆ هەواڵ لە چاو هەفتەیەك پێش ئەوە ٦٠٪ زیاتر بوو. ئەوەش بەباشی دەریدەخات کۆکردنەوەی ئەو هەواڵانەی هەن، بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت ببێتە ئەڵتەرناتیفی ئامادەکردنی هەواڵ.

چاوپێکەوتن لە گەڵ دانێل گارت

دانیل گارت " Daniel Garrett" نووسەرە لە رۆژنامەکانی " Evening Advertiser,devizes Gazette" کە لە شاری Swindon بڵاو دەبنەوە. جگە لە نووسین، بەڕێوەبردنی سایتی ئەو رۆژنامانەشی لە ئەستۆدایە. ئەو گۆشانەی بۆ ئەو رۆژنامانە دەیاننوسێت باس لە سایتە ئینتەرنێتییەکان دەکەن.

* چۆن وەك رۆژنامەوانێکی ئینتەرنێتی دەستت بەکارکرد؟

- پێشتر بۆ کۆمپانیایەکی درووستکردنی ویب سایت کارمدەکرد. لەوێ زۆر شت لە سەر ئینتەرنێتو کۆمپیوتەر فێر بووم، هەمیشە حەزم لە درووستکردنی سایت هەبووەو دروستیشم دەکرد. پاشان رۆژنامەی Evening Advertiser کە ئێستا کاری تێدادەکەم ئاگادارییەکیان بڵاوکردەوەو داوای کەسێکیان دەکرد سایتێکیان بۆ درووستبکات. منیش داوایەکم پێشکەشکردن. چونکە خۆم هەم پسپۆر بوومو هەمیش حەزم لەو کارە هەبوو. دەبوو بۆ رۆژی چاوپێکەوتنەکە ویب سایتێکم درووستبکردایە. لە بەر ئەو پێشنیازو تیوریانەی خستمنەڕوو منیان هەڵبژارد. هەمیشە بەسەر زمانی ئینگلیزیدا زاڵبوومو زۆریش حەزم لە زاراوەو خوێندنەوە

هەیە. ئەو حەزەشم بۆ نووسینو دارشتنی بابەتی ئینتەرنێتی هەیە. من ئێستا سەروتارو بابەت سەبارەت بە هەواڵی ئینتەرنێتی بۆ ڕۆژنامەکە دەنووسم.

★ لە بورای ڕۆژنامەنووسیدا هیچت خوێندووە؟

- نەخێر، بە هیچ جۆرێك.

★ لاپەڕە ئینتەرنێتیەکانی ڕۆژنامەکە باس لە چ بابەتێك دەکەن؟

لاپەڕەیەکی تایبەتمان هەیە بە ناوی "ئێرە ویڵت شایرە". هەموو هەواڵو بابەتە وەرزشیو بابەتەکانی دیکەی ڕۆژنامەکەی تێدا بڵاو دەکەینەوە. هەرکاتێك بڕیار بێت بابەتێك لە سەر ئینتەرنێت لە ڕۆژنامەکەدا بنووسرێت بۆ ئەوەی بۆچوونی دی لە سەر دەربپڕێت. ئەوا من بەرپرسیار دەبم. بەم دواییانە پاشکۆیەکی ٣٢ لاپەڕەیی هەمەڕەنگمان لە ویلت شایر هەبوو. من لەوێدا سەبارەت بە کڕین لە ڕێگەی ئینتەرنێتو دابەزاندنی مۆسیقا لە سەر سایتو چاوخشانێك بە سایتی ڕۆژنامەکەی خۆمان چەند بابەتێکم نووسی. لاپەڕەی " ئێرە ویڵت شایەرە" بریتییە لە هەڵبژاردنی کۆمەڵە هەواڵێکی هەفتەکەو من بە شێوەیەکی بەردەوام بابەت بۆ ئەو لاپەڕەیە دەنووووسم.

★ ئایا ئەو کاتەی ریپۆرتەرێك بابەتێکتان پێدەدات. لە ڕێگەی فایلی pdf ئەو بابەتە دەخەنە سەر ئینتەرنێت بۆ ئەوەی بتوانن دەستکاریبکەن؟

- لە ڕاستیدا هەواڵەکان بۆ من نانێرێت، بەڵکو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەخرێتە سەر تۆڕەکە. هەر پەیامنێرێك کاتێکی دیاریکراوی هەیە بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی پیتەکان بەبێ هەڵە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دادەبەزێت. بۆ نموونە لەوانەیە لە هەواڵێکدا هاتبێت " پاشماوەکەی لە لاپەڕە ٢ دایە" ئەم قسانە لە سەر ئینتەرنێت بێ مانان، دەبێت هەڵەبڕ بکرێت.

★ چی ڕێنماییەکتان هەیە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ببنە پەیامنێریی ئینتەرنێتی ؟

- دەبێـت نموونـەی ویـب سـایتێك کـە پێـشتر درووستتکردووە پیـشانی خاوەن کارەکەت بدەیت. ئەو مەسەلەیە کاریگەرییەکی بۆ داهاتووت دەبێتو سـەرکەوتوویی تـۆ دەردەخـات. نیگـەرانی چوونە زانکۆ مەبە چونکە ئـەم پیشەیە نوێیەو ئەزموون بە قەد خوێندن بەنرخە بۆت.

★ ئایا تۆ لە زانکۆ خوێندووتە؟

- نەخێر، من ئامادەیم تەواوکردووە، بەڵام پێموانییە بڕوانامە پێوەرێکی باشبێت بۆ هەڵسەنگاندنی تواناکانی کەسێك.

★ کاردانەوەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت بەرامبەر سایتەکەتان چۆنە؟

- زۆر باشـە، بەمزووانـە گـۆڕانی نـوێتر لـە سـایتەکەدا دەکـەین. هەرکـە دەچیتە لاپەڕەی " ئێرە ویڵت شایر"ە پەنجەرەیەکی بچووکت بۆ دەکرێتەوە گۆڕانکارییە نوێیەکانی سایتەکەت پیشاندەداتو پرسیاری کورت لە سەر ئەو بەشـانەی بـە دڵتـە یـان بـەدڵت نییـە دەخاتـەڕوو. لـە ڕاسـتیدا خـەڵك بەبەردەوامی پەیوەندیمان پێـوە دەکـەنو بۆچوونە جیاجیاکـانی خۆیـان لـە سەر سایتەکە دەخەنەڕوو.

★ لـە وڵاتـانی دیکـەوە سـەبارەت بـە سـایتەکەتان پەیوەنـدیتان پێـوە دەکرێت؟

زۆر کـەم، زۆرتریـان بـۆ ئـەو بەشـەی نـاوی " ئـەوان لـە کـوێن؟" دەنووسن. ئەوانە زیاتر ئەو کەسانەن کە لـە "ویڵت شـایر و سـوییندون"ەوە چوونو ئێستا دەیانەوێت پەیوەندی بکەن بە دۆستە کۆنەکانیانـەوە. چـەند کەسێك لەم ڕێگەیەوە سەرکەوتوو بوون.

# ١٨

# بڵاوکراوە تایبەتمەندەکان

لـە بیـست سـاڵی رابـردوودا ژمـارەی بڵاوکـراوە تایبەتمەنـدەکان زۆر زیادیانکردووە، لە سەرەتای سەدەی بیستو یەکەوە ژمارەیەکی زۆر دەزگای بڵاوکراوەی بچووك لە بریتانیا دامەزراونو گۆڤارو رۆژنامەو ئینتەرنێت بۆ کۆمپانیـاو رێکخـراوە جیاجیاکـان بـڵاو دەکەنـەوە. ئەوبابەتانـەی لـەم بڵاوکراوانەدا دەنووسرێن سەبارەت بەو بەرهەمانـەن کەوا لـەو کۆمپانیانـە بەرهەمـدێن. هەنـدێك لـەو گۆڤارانـە بـۆ ریکلامـەو ئامانجیـان راکێـشانی سـەرنجی کریارەکانـە بـۆ لای سـۆپەر مارکێـتو فرۆشـگا گـەورەکان. کەچـی هەندێکی دیکەیان تەنها بۆ کارمەندو کرێکارانی ئـەو کۆمپانیانـە دەردەچن. ئەمانەی دووهەم زانیاریو هەواڵی بەسوود دەخەنە بەر دەست کارمەنـدانو نوێترین گۆڕانکارییەکانی بواری کارەکانی خۆیانیـان بـۆ ئامـادە دەکەن. ئـەم بڵاوکراوانە پسپۆرایەتیان تێدا رەچاو دەکرێتو وەك ئەو گۆڤـارە لۆکاڵییانـە نـین کـە لـە لادێکانـەوە بڵاودەکرێنـەوەو رەچـاوی دیزاینیـان تێـدا ناکرێـت. بەڵکو کۆمپانیاکان بە شێوەی هەمیشەیی یان ئازاد سوود لە رۆژنامەوانـەکان وەردەگرن. بۆیـە ئەوانـەی شـارەزاییان تێدایـە دەتـوانن لـە بەشـی بڵاوکـراوە تایبەتمەندەکاندا کار بۆخۆیان بدۆزنەوە.

بــۆ نموونـــە کۆمپانیایـــەکی ئاوگەیانـــدن دوو گۆڤـــاری تایبـــەت بـــۆ کارمەندەکانی خۆی دەردەکات. بابەتەکانی ئـەم گۆڤارانـە بـە زۆری بـاس لـە

ئاوو گەیاندنی ئاو دەکەن‌و هەواڵ‌و بابەت‌و گۆڕانکارییەکانی ئەو بوارە لە سەر ئاستی نیشتمانی‌و هەرێمایەتی‌و گلۆباڵی دەگرێتە خۆ. هەروەها مەسەلەکانی ژینگەو ڕوبارو دەریاو جەنگەڵەکان‌و گۆڕانەکانی ناو کۆمپانیاکە وەك بەرزبوونەوەی پلەوپایەو پاداشت‌و دەستکەوت‌و خانەنشینکردن‌و ئاگاداری‌و پرسەنامەو ڕووداوی تایبەت لەو بابەتە گرنگانەن لەو دوو گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە. ریکلامی بازرگانی لەو گۆڤارانەدا بڵاو ناکرێنەوە.

چاوپێکەوتن لە گەڵ ئان مارتین ( Ian Martin)

ئەم چاوپێکەوتنەی خوارەوە لە گەڵ "ئان مارتین" ی نووسەرو ڕاوێژکاری یەکێك لەو دوو گۆڤارە ناوخۆییەی *"کۆمپانیای ئاو گەیاندن"* ئەنجامدراوە. ئان تەمەنی ٢٩ ساڵە، پێشئەوەی لە بەشی پەیوەندییە گشتییەکان کار بکات، وەك پەیامنێر لە گەڵ چەندین ڕۆژنامەو هەفتەنامەدا کاریکردووە. پێشئەوەی لەم کۆمپانیایە دەستبەکار بێت، یاریدەدەری سەرنووسەری بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی دیکە بووە.

★ ئایا بە کارکردن بۆ بڵاوکراوە تایبەتمەندەکان‌و بازرگانییەکان دەستتدایە پیشەی ڕۆژنامەوانی؟

- نەخێر، سەرەتا بۆ هەفتەنامەیەکی لۆکاڵیی کارمدەکرد.

★ ئایا ئامانجت ئەوە بوو ببێتە ڕۆژنامەنووس؟

- لەوکاتەوەی تەمەنم ١١ ساڵان بوو حەزمدەکرد ڕۆژێك ببمە ڕۆژنامەنووس.

★ ئایا هیچ خولێکی فێربوونی ڕۆژنامەوانیت دیوە. ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێیە لە کوێ؟

- خولێکی یەك ساڵەم خوێندووە، کە لە لایەن ئەنجومەنی نیشتمانی

فێرکردنی پەیامنێریی کرابووەوە وپاشان بۆ دوو ساڵ لە هەفتەنامەیەکدا فێرکاربووم.

★ ئەو بڵاوکراوەیەی ئێستا کاری تێدادەکەیت بازرگانییە یان تایبەتمەند؟

- ئەوە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆییە ئامانجی ئەوەیە زانیاریو دوایین گۆڕانکاری کۆمپانیاکە بدات بە کارمەندانو خانەنشینەکان.

★ کەی بۆ یەکەم جار لە چاپدرا؟

- ١٩٧٠.

★ ئایا لە گەڵ رۆژنامەنووسە ئازادەکاندا هاوکاری دەکەن؟

چۆن سوود لە کارەکانیان وەردەگرن؟

- نەخێر، هەموو ئەوانەی بۆ بڵاوکراوەکە دەنووسن دامەزراوون.

★ چەند کەس تێدا کاردەکات؟

- سەرنووسەر هەواڵەکان دەنووسێتو دایان دەڕێژێتەوەو نەخشەسازییان دەکات .

★ ئەو گۆڕانکارییانە چین بڵاوکراوەکە بە خۆیەوە بینیونی؟

- لە ساڵی ٢٠٠٠ دا، نوسخەیەکی کۆمپیوتەریمان لە سەر نێت ورکی کۆمپیوتەرەکانی کۆمپانیاکە بڵاوکردەوە. بۆ ئەو کارمەندانەی وا ناتوانن لەو رێگەیەوە بڵاوکراوەکە ببینن نوسخەیەکی کاغەزمان بە قەبارەی A4و بە نەخشە سازییەکی نوێوە خستەبەردەستیان.

★ بودجەی بڵاوکراوەکە لە کوێ دابیندەکەن؟

- لەو پارەیەی بۆ پەیوەندییە گشتییەکانی کۆمپانیاکە دابینکراوە.

★ دابەشکردنی چۆنە؟

- نوسخەی ئینتەرنێتی لە رێگەی نێت ورکەوە دەبینرێت. نوسخە

چاپییەکەشـــی دەنێـــرین بـــۆ بەرپرســـیاران‌و لـــە نـــاو کارمەندانـــدا دابەشیاندەکەین.

★ تیراژەکەی چەندە؟

- نزیکەی ٣٠٠٠ دانەی لێچاپدەکەین.

★ ئەگەر بتانەوێت کەسێك دابمەزرێنن لە ڕووی کەسایەتی‌و پێشینەی کارکردن‌و پلەی خوێندنەوە مەرجەکانتان چین؟

- پێویستە پێشینەی چەندین ساڵ کارکردنی لە ڕۆژنامە هەبێت‌و توانای نووسـین‌و شـارەزایی لـە بەسـتنی پەیوەنـدی لـە گـەڵ خەڵكـدا هـەبێت. بۆچوونەکانی نوێخوازانەبن، هەروەها دەبێت زانیـاریی لـە سـەر پیـشەسازی ئاوگەیاندن هەبێت.

★ پێشنیازت بۆ ئەو کەسانە چییە کە حەزیان لەوەیە کار لە بڵاوکراوە تایبەتمەندەکاندا بکەن؟

- پشتیان بە خـۆ قـایم بێـت، کـارکردن لـە بـواری ڕۆژنامەوانیـدا کـارێکی دژوارەو پێویـستی بـە ئیرادەیـەکی بـەهێز هەیـە. چـونکە ژمـارەی ئەوانـەی دەیانەوێت ببنە ڕۆژنامـەنووس یـەکجار زۆرن. ئەگـەر دەتـەوێت تایبەتمەنـد بیت لە یەك بـواردا پێویـستە شارەزایی پێویـستت هـەبێت لـەو بـوارەدا. تـا پێتـدەکرێت ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـانی دی بخوێنـەوە بـۆ ئـەوەی هـەم ئاشـنایی ستایلە جیاجیاکانی نووسین ببیت و هەم لە سەر ئەو بڵاوکراوە جیاوازانـەی چاپ دەبن بۆچوونێکی گشتیت هەبێت.

# ١٩

# ئەندامێتی لە سەندیکادا

ئەگەر کارمەندێکی بەردەوام یان ئازادانە کار دەکەیت، ئەگەر پەیامنێر یان نووسەر یاخود هەواڵ نووسیت، ئەگەر بە بابەتەکاندا دەچیتەوە یان وێنەگریت، لێکۆڵەری یان بێژەری هەواڵو بەرنامەیت، دیزاینەریت یان لە هەر پۆستێکی دیکەدا کاردەکەیت، باشتر وایە ببی بە ئەندامی یەکێتی یان سەندیکای ئەو پیشەیەی کە هەتە. لە بریتانیا یەکێتی نیشتمانی پەیامنێران، دەزگای فەرمی پەیامنێرانو ئەنجوومەنی پەیامنێرانی بریتانیا بۆ وەدەستهێنانی مافو پاراستی ئەندامانی خۆیان تێدەکۆشن.

لە ماوەی کارکردندا پەیامنێران، رۆژێك دێت پێویستیان بەوە هەیە لە لایەن سەندیکایەکەوە پشتیوانیان لێبکرێت. ئەو کارانەی رۆژنامەنووسان دەیکەن چ لە کاتی ئامادەکردنی راپۆرتێك لە سەر کێشەیەکی دادگا، یان ئەوکاتە زۆرانەی لە پشتی مێزی کارەکەیانەوە دەیبەنەسەر یاخود لە کاتی سەفەرەکانیان بۆ دەرەوە، ئەگەری ئەوە هەیە تووشی کێشەی گەورەو بچووکببن.

زۆرجار هەلومەرجی کارکردن بۆچوونی جیاوازی لێدەکەوێتەوە، ئەوەش چەند نموونەیەکە:

ئەو کێشەو نارەحەتییە جەستەییانەی بە هۆی زۆر بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەوە درووستدەبن، زۆر لە هەڵەچنەکان تووشی ئەو کێشەیە دەبن. گوێنەدانی خاوەنکار، زۆرجار فێرکارێك چەندین سەعات بێچاودێریو

بێئەوەی پاداشتبکرێت کاردەکات.

گرتن‌و زیندانیکردنی ئەو پەیامنێرانەی لە وڵاتانی دیکەدا کاردەکەن.

ئەوە تەنها چەند نموونەیەکی کەمن لەوگرفتە زۆرانەی یەخەی پەیامنێران دەگرن‌و سەندیکای پیشەییش بەرگرییان لێدەکات.

نموونە:

ئەو کاتەی پەیامنێرێك بەناوی جوهان ماك کارتی لە ساڵی ١٩٨٦ لە بەیروت بە بارمتەگیرا، دەستگیرانەکەی جیل موریلّ دەستیدایە هەندێك چالاکی بۆ ئەوەی لای رایگشتی‌و پەرپرسان ناوی بە زیندوویی بمێنێتەوە. جیل و هەندێکی دی لە هاوڕێ‌و هاوکارەکانی پێیانوابوو نابێت خەڵك جوهان و بارمتەکانی دی لە بیر بکەن. تەنها ریگەش ئەوە بوو راگەیاندنەکان بهێننە سەر ئەو باوەڕەی بارمتەکان هێشتا هەواڵی گرنگن با هیچ زانیارییەکیش لە سەرچارەنووسیان نەبێت. هاوکات لە گەڵ پەرەسەندنی چالاکییەکانیان ئۆفیسێکیان دامەزراند بۆ ئەوەی دۆستەکانی جوهان ماك کارتی کە هەر هەموویان خۆبەخشانە کاریان دەکرد بتوانن لەوێوە درێژە بە هەوڵەکانیان بدەن. ئەوان پیویستیان بە تەلەفۆن‌و ئادرەسی جێگیر هەبوو. جیل داوای هاوکاری لە یەکێتی نیشتمانی پەیامنێرانی بریتانیا کرد. یەکێتیەکەش بە پەلە ئۆفیسێکی بۆ کردەنەوەو نامەی بۆ هەموو ئەندامەکانی خۆی نارد بۆ ئەوەی هەواڵەکانی ئەو پەیامنێرە بەبارمەتەگیراوە لەچوارچێوەی راپۆرتەکانیاندا جێبکەنەوە. هەروەها ئەندامانی ئەو یەکێتیە داواکارییەکیان ئیمزاکردو نوسخەیەکیان بۆ سەرۆك وەزیران نارد. ئەو ئۆفیسە یەکێك بوو لە ئۆفیسە سەرەکییەکانی یەکێتییەکە. پارمەتی ئەو گروپەیدا بۆ ئەوەی چالاکییەکانیان لە لەندەنی پایتەخت جێگیربکەن. ئەندامانی ئەنجوومەنەکەش بە شێوەی سەربەخۆ

مەراسیمی جیاجیایان ڕێکدەخست بۆ ئەوەی جگە لـە گەیانـدنی زانیـاری لـە سەر ئەو مەسەلەیە، یارمەتی دارایش کۆبکەنەوە.

یەکێتییـەکان تـەنها بـۆ یارمەتیـدانی ئەنـدامانی خۆیـان لـە هەلومەرجـە ناخۆشـەکان درووسـتنەکراون. ئـەم یەکێتییانـە بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێـك کۆبوونـەوەو دانیـشتی گـشتیی سـازدەکەن‌و خزمـەتگوزاریی راوێـژکارییش دەخەنە ڕوو. بۆ نموونە دەتوانیت سـەبارەت بـەوەی چ جۆرە کومپیوتـەرێك بکڕیت، یان چۆن لە شـۆك و هیلاکـی دووربکەویتـەوە، یـاخود لـەچ خـولێکی فێربـوون بـۆ بـەهێزبوونی تواناکانـت بەشـداریبکەیت، دەتـوانی بـۆ هـەموو ئەوانە راوێژیان لە گەڵدا بکەیت.

# ٢٠

# پەیامنێریی سەربازیی

لە بریتانیا ئەو کەسانەی پیشەکانیان پەیامنێرییە، یان لە پەیوەندییە گشتییەکاندا کاردەکەن، دەتوانن وەك سەربازی خۆبەخش لە "گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندنی سوپا" Territorial Armys Media Operations Group خزمەتبکەن. گروپەکانی ئۆپراسیۆنی راگەیاندنی سوپا ئەرکی هەستیارو سەختیان لە ئەستۆدایەو پانتایی کارەکانیان لە فراوانبووندایە. چونکە بە زیاتربوونی شەڕوشۆڕ لە ناوچە جیاجیاکانی دونیادا، رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانو وڵاتانی ئەندامی ناتۆ هێزە ئاشتیپارێزەکانی خۆیان دەنێرن بۆ سەرتاپای دونیا.

هەڵبەت هەموو ئەوانەی لە گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندنی سوپادان لە ناوچە شەڕزەدەکاندا جێگیر ناکرێن، بەڵکو ئەرکی سەرەکی ئەم تیمە کۆکردنەوەی هەواڵو رووداوەکانی سوپایەو ناردنێتی بۆ چاپەمەنیو رادیۆو تەلەفزیۆنەکان. ئەوان هەواڵی کارمەندە رەسمییەکانو هێزە خۆبەخشەکانی سوپا کۆدەکەنەوەو وەك پردێکن لە نێوان سەربازەکانوخێزان وخزمەکانیان.

فەرماندەکانی سوپا لە سەریانە لەکاتی پلانداناندا بۆ کارێکی سەربازیی میدیاکانیش لە بەرچاو بگرن. بە پێی یاسا بنەڕەتییەکان، دەبێت سوپا خەڵك لەو هەنگاوانەی کە دەینێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان ئاگاداربکاتەوە. ئەمە شتێکی تازە نییەو بەدرێژایی مێژوو سوپاکان دەبێت

هەوڵی پاراستنی خەڵکبدەن. زانیارییەکان نەك تەنها بۆ خێزانوخزمو هاوڵاتیانی ئەوانەی لە ریزی سوپادان زۆر گرنگە، بەڵکو بۆ کۆمەڵی نێونەتەوەییو تەنانەت ئەو وڵاتەی کەوەك میوان تێیدانو لەوانەشە وەك دوژمن تەماشا بکرێن، کرنگییەکی تایبەتی هەیە.

جیگیربوونی سەربازە نێونەتەوەییەکان لەو شوێنانەی دەرگیری جەنگو شەڕوشۆڕبوون، بە هەواڵێکی گرنگی جیهانی دێتەژماردن. بڵاوکردنەوەی هەواڵی شەڕەکانی کەنداوی فارسو بۆسنیو هاییتیو نیمچە دوورگەی بالکانو تەیموری رۆژهەڵاتو ئۆپراسیۆنە بەردەوامەکان، چەندین ساڵە درێژەی کێشاوە. بە درێژایی شەڕی کەنداوی فارس لە ساڵی ۱۹۹۱ زیاتر لە ۱۵۰۰ پەیامنێرو ریپۆرتەر لە گەڵ سوپاو لەناو جەرگەی شەڕەکەدا بوون.

میدیاکان هەواڵەکانی شەڕی جیهانی دووهەمیان لەئاستێکی بەربڵاودا دەخستەڕوو. لە تۆمارکردنو بە دیکۆمێنتکردنی رووداوەکانی شەڕەکە بۆ بنەماڵەی سەربازەکانو نەوەکانی داهاتوو رۆڵێکی زیندوویان گێڕا. بەو حاڵەشەوە پەیامنێرانو کەسەکانی ناو سوپا لەگەڵ یەکدا لە سەنگەری شەڕێکی رانەگەیەنراودا بوون. هێزەکانی سوپا پێیان وابوو پاراستنی نهێنییەکانی ناوچەیەکی شەڕزەدە مەسەلەی مانو نەمانە. بەڵام لە وڵاتە دیموکراتەکاندا دەبێت سوپا راستەوخۆ وەڵامی بۆ حکومەتە دیموکراتەکەی پێبێت. هەر لەبەر ئەوەشە میدیاکان داوای مافی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەو زانینی راستییەکان دەکەن. جگە لەوە سەربازەکانی ئەمڕۆ خۆیان نەوەیەکن پەروەردەی میدیا بیستراوو نوسراوو بینراوەکانن. کەسەکانی ریزی سوپا پلەداربن یان بێپلە، کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە وەك خەڵکی ئاسایی بۆ ئاگاداربوون لە هەواڵەکان، تەلەفزیۆنەکانیان دەکەنەوە یان لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت بە دوایدا دەگەڕێن. هەموو کەسێك پێویستی بەوە هەیە ئاگای

لە ڕووداوەکان بێت. کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراتیش دەبێت ئەو زانیارییانە بخاتە بەردەستی ڕایگشتی.

بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا هەستکردن بەوەی دەبێت هەردوولا بۆ بەرژەوەندی هاوبەش هاوکاری یەکدی بکەن، پەرەیسەندووەو پەیوەندی نێوان سەربازان و پەیامنێران گەشەیکردووە. ئەمڕۆ هەردوولا لە سەر ئەوە ڕێککەووتون زانیاری ڕاگەیاندنەکان نابێتە هۆی مەترسی بۆ سەر ئۆپراسیۆنە سەربازییەکان. لە ڕاستیدا بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی شەڕ لە سەر ئاستی نێونەتەوەیی دەتوانێت پڕوپاگەندەکانی دوژمن پوچەڵبکاتەوە.

لە ڕێگەی کەڵکوەرگرتن لە تەکنەلۆژیاو سەتەلایت و مۆبایل و کۆمپیوتەری لاپتۆپەوە کە دەبەسترێتە ئینتەرنێتەوە، میدیاکان خۆیان لە پاشکۆیەتی ئەو هەواڵانەی لە سوپاوە پێیاندەگەیشت ڕزگارکردووەو بە شێوەیەکی سەربەخۆ کاردەکەن. پسپۆران پێیانوایە لە ئایندەدا میدیاکان دەتوانن بۆ وەدەستهێنانی زانیاری و هەواڵی شەڕەکان هاوشانی هێزە سەربازیەکان ئۆپراسیۆنی جیا ئەنجامبدەن. بەڵام سەرەڕای ئەوەش دەبێت هەردوولا پێکەوە هاوکاری یەکدی بکەن.

ئەندامانی "گروپی ئۆپراسیۆنی ڕاگەیاندنی سوپا" لە بریتانیا دەتوانن وەك پردێك لە نێوان کارمەندانی میدیاکان و هێزەکانی سوپا کاربکەن. ئەوان بە خەڵکانی سڤیل دێنە ژماردن، چونکە خۆبەخشانە کاردەکەن و ئەرکەکانیان سەربازیی نییە. هەرچەندە نزیکەی یەك لە سەرچواری ئەوانە پێشتر سەرباز بوون، بەڵام ئەوانی دی پێشینەی سەربازییان نییەو لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و بڵاوکراوە ناوخۆیی و پەیوەندییە گشتییەکانی فەرمانگەکان کاردەکەن. ئەمانە دەتوانن وەك نووسەر و ڕیپۆرتەری ڕادیۆو تەلەفزیۆن و وێنەگر و زمانناس. پەیوەندی نێوان میدیاکان و هێزە

سەربازیەکان باشبکەن.

گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندن لە رابردوو و ئیستادا:

ئەم گروپە لە سالی ١٩٧٠ دا بە ناوی TAPIO ( ئەفسەرانی خۆبەخشی زانیاریی گشتیی سوپا) دامەزرا. لە سیپتەمبەری ١٩٩٦ دا ناوەکەی گۆرا بۆ "گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندن". ئیستا بە "گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندنی G3" دەناسریت. ئەندامانی گرووپەکە لە سالیکدا سیجار لە ئۆردوگای سالانە کۆدەبنەوە. ئەندامانی ئەم گرووپە وەك بەشیك لە ئەرکەکانیان دەنیردرین بۆ چالاکیو خولی راهینان.

گروپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندن بە فەسیل یان تیپیکی سوپا ناژمیردریت. بەلکو یەکەیەکی پسپۆریی سەربەخۆیە. هەموو ئەو کەسانە خولیکی پەروەردەو راهینان دەخوینن ئەنجا دین بۆ ئەو یەکەیەو بە پلەی مولازم ئەرکەکانی خۆیان رایدەکەن. ئەوان یونیفۆرمو کلاوی ئەو لیوایەی هەلیانبژاردووە لە بەرو لەسەر دەکەن. هەندیك خۆبەخش هەن راستەوخۆ لە سوپاوە دینە ناو ئەو یەکەیەوە.

ئاینده:

ئەوانەی دینە ناو گرووپی ئۆپراسیۆنی راگەیاندنەوە، دەبیت ئەوەیان لەبەرچاوبیت، ئەندامبوون لەم گرووپەد بە کارکردن وەك پەیامنیریکی جەنگ ناژمیریت. ئەفسەرەکانی ئەم یەکەیە، چ ئەوانەبن کە بە خۆبەخش هاتوونو چ ئەوانەشی راستەوخۆ لە سوپاوە هاتوون، دەبیت بە هەموو قۆناغەکانی دەستنیشانکردنو هەلبژاردندا تیبپەرن. ئەوەش دوو رۆژ دەخایەنیتو لە لایەن دەستەیەکەوە بەریوەدەبریت. ئەو خۆبەخشانەی مەرجەکانیان تیدایە دەبنە ئەندامی یەکەکە. وەك هەموو هیزە چەکدارەکانی دی، سوپای خۆبەخش پیویستی بە کەسانیك هەیە

دیسپلینیان هەبێتو هەم وەك سەربازێكو هەم وەك پەیامنێریش، فێربن خزمەتبکەن.

بە مانایەکی دی: ئەو کەسانەی خۆبەخشانە دێن بۆ ئەم گرووپە، پێویستە لە رووی جەستەو عەقڵەوە سەلامەت بن. لەم قۆناغەدا خۆبەخشەکان فێردەکرێن چۆن چەكو کامێرا بەکاربهێنن. لە تاقیکرنەوەکانی توانای شەڕکردندا بەشدار دەبنو لە سەر پلانداناو ئۆپراسیۆنی میدیایی لە هێزە سەربازییەکاندا چەند وانەیەکیان پێدەوترێتەوەو خۆیان ئامادەدەکەن تاکو لە کاتی پێویستدا شانبەشانی جەنگاوەرانی دی چ بەشێوەی خۆبەخشو چ وەك هێزێکی فەرمی بجەنگن.

یەکێك لە خۆشییەکانی ئەم کارە، سەفەرە زۆرەکانیەتی. کارمەندان دەتوانن بە شێوەیەکی خۆبەخش لە خولە سێ مانگیو شەش مانگیەکاندا بەشداریبکەن. پێشئەوەی بچنە ناو هێزە خۆبەخشەکانی سوپاوە، خۆبەخشەکان دەبێت لەوە دڵنیا بن خاوەنکارە هەمیشەییەکانیانو هاوسەرو خێزانەکانیان، ئەو پەیمانەی داویانە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کاتیی لە ریزی هێزەکانی سوپادا کار بکەن، درکپێبکەن.

Jeff Pridmore

# The Alphabet of Working in Media Channels

Majeed Salih

نرخی ٢٠٠٠ دیناره